کۆسرەت ساڵح ئەحمەد

# تەواوکاریی زانستەکان

## التكامل المعرفي







لە بڵاوکراوەکانی
سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی (٤٨)

تەواوکاریی زانستەکان

کۆسرەت ساڵح ئەحمەد







## سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی

سەنتەرێکی کوردستانی ناحکومی ناسیاسییە، گرنگیی دەدات بە توێژینەوە و تاوتوێکردنی پرسە هزرییە بنەڕەتییەکان بۆ دووبارە هێنانەگۆی دەق و تێکستە پیرۆزەکان و چۆنیەتی دابەزاندنی چەمکە مەعریفی و بەبایەخەکانی ئیسلام لە بوارە جیاوازەکانی سەردەم.

**ئامانجەکانی سەنتەر:**

- بوژاندنەوەی بیرو هزر و بەکارخستنی مەعریفەی ئیسلامی لە ناوەندە زانکۆیی و پەروەردەییەکاندا، بە پشتبەستن بە بەهرە و توانا خودییەکانی ئەکادیمیانی کوردستان و جیهانی ئیسلامی و ئەزموونی بیرمەندانی مسوڵمان.
- پەرەپێدان و پەسەندکردنی ڕوانگەی زانستی مەنهەجی لە چارەسەرکردنی کێشە و گرفتە هزرییەکاندا و بێلایەنبوون لە پرسە خیلافییەکاندا و خۆبەدوورگرتن لە بڕیاری پێشوەخت و شێوازی سۆزدارانە و هەوڵدان بۆ بابەتیبوون.
- کاراکردنی کەلەپووری دەوڵەمەندی ئیسلامی و سوودوەرگرتن لە سەرچاوە گرنگەکانی بیری ئیسلامی لە کۆن و نوێدا و سەرلەنوێ هێنانەگۆی چەمکە فیکرییە دوێنراوەکان لە مێژووی ئیسلامیدا، بە ڕەچاوکردنی گۆڕانەکانی سەردەم.
- پەرەپێدانی چەمکی ئیعتیدال لە کایە فیکری و مەعریفییە جیاوازەکاندا و خۆبەدوورگرتن لە تێپەڕاندن و بەزایەدان.
- سەنتەر کاردەکات بۆ سەرلەنوێ و بەردەوام خوێندنەوەی هەردوو پەڕاوی قورئان و بوونەوەر بەپێی مەنهەج و میتۆدی زانستی و بەبێ چاولێکەری، بەڵکو بە نەفەسێکی تازە و بە سوودوەرگرتن لە عەقڵی ڕاشکاو و نەقڵی سەلمێنراو.



## کۆسرەت ساڵح ئەحمەد

- لەدایکبووی: ١٩٨٩.
- قۆناغی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لە باڵەکایەتی خوێندووە، دواناوەندیش لە سۆران.
- بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لە بەشی شەریعەی کۆلێژی زانستە ئیسلامییەکانی زانکۆی سەلاحەدین لە ساڵی ٢٠١١ وەرگرتووە.
- بڕوانامەی ماستەری لە (الفقه الجنائی الإسلامی) لە بەشی (الفقه وأصول الفقه) ی کۆلێژی (معارف الوحی والعلوم الإنسانیه) لە زانکۆی ئیسلامیی جیهانیی –مالیزیا، لە ساڵی ٢٠١٥ وەرگرتووە.
- پلەی مامۆستای زانکۆ (مامۆستای یاریدەدەر) ی لە زانکۆی سەلاحەدین لە ساڵی ٢٠١٦ وەرگرتووە.
- جگە لەم کتێبە، کتێبێکی تری بڵاوکراوەی هەیە و خاوەنی چەند توێژینەوەیەکی زانستییە بەزمانەکانی کوردی و عەرەبی.
- خوێندکاری دکتۆرایە لە زانکۆی ئیسلامیی جیهانیی–مالیزیا.

# تەواوکاریی زانستەکان

....................................................
لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی
ژمارە (٤٨)

• نووسینی: کۆسرەت ساڵح ئەحمەد
• بابەت: هزری
• دیزاین: رەوشت محەمەد
• چاپ: یەکەم

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (١٣٢٩)ی ساڵی ٢٠١٧ پێدراوە

# ناوەڕۆك

## پێشکەشە بە:

دڵە میهرەبانەکەی دایکم

و

زوبانە پڕ نزاو و زیکرەکەی باوکم

و

چاوە پڕ فرمێسکەکانی نەنکم

و

رۆڵە چاوگەشەکەم کۆشان ی جگەرگۆشە

## سوپاس و پێزانین

دوای ستایشی زاتی پەروەرێن، پێزانینم هەیە بۆ هەریەکە لەم بەرێزانەی خوارەوە:

- خاتوو "سۆزان"ی هاوژینم، کـە ماندوونەناسـانە، هەمیـشە ئاسانکاری بۆ کردووم و پاڵپشتیکردووم.

- دکتۆر حسەین موحەممـەد، بـۆ دەستپێـشخەری و هانـدانی بەردەوامی بۆ لەدایکبوونی بەرهەمێکی لەم چەشنە.

- بەرێز مامۆستا ئیسماعیل تەها، کە هاوکارێکی باشی کـردم بەدابینکردنی سەرچاوە.

- بەرێز "دەرباز ساڵح و دانا شوانی" کـە ئـەرکی هەڵەچـنیان گرتە ئەستۆ.

- سەنتەری زەهـاوی بـۆ لێکۆڵینـەوەی فیکریـی، کـە ئـەرکی لەچاپدانی ئەم بەرهەمەیان لە ئەستۆ گرت.

**بەناوی پەروەرێنی بە توانا**

## پێشەکی:

سوپاس و ستایش بۆ بەدیهێنەری بوونەوەر و گەردوون، سەرچاوەی گشت زانستەکان، ئارامبەخشی دلۆڤان و زاتی پەروەرێنی تاقانە. درووود بۆ گیانی پاکی سەرداری مرۆڤایەتی، پێشەنگ و پێشەوامان محەممەد، درووود بۆ گیانی یار و یاوەر و هاوەڵ و هاومەشرەب و شوێنکەوتووانی، تا ڕۆژی پەسڵان.

ئاشکرایە هەر کارێك لەڕێگەی بەرنامە و نەخشەڕێگایەکی تۆکمە ئەنجام بدرێت، سەرکەوتن بەدەست دێنێت، هەرچەندە نەخشەڕێگاکەش تۆکمەتر بێت، ئەنجامی باشتر مسۆگەر دەکات. بەپێچەوانەوە هەر کارێك لەڕێگەی نەخشەڕێگایەکی دروست و تۆکمە ئەنجام نەدرێت، هەرچەندە توانا و وزەی ماددی و مرۆیی زۆریشی تێدا خەرج بکرێت، دەرەنجامی دڵخۆشکەری نابێت.

پەروەرێنی باڵا، سەبارەت بە نەخشەڕێگا لە قورئان فەرموویەتی: ﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا﴾ المائدة: ٤٨، بۆ هەریەکێك لە ئێوە بەرنامە و نەخشەڕێگایەك دانراوە.

وشەی (منهاج) لە ئایەتەکە ئاماژەیەکی روونە بۆ گرنگی نەخشەڕێگا، خودی وشەکە لەڕووی زمانەوانییەوە، واتای رێگای روون و دیار، یان مانای راستەشەقام دەدات، کە ئەم رێگا روون و شەقامە راستە، مرۆڤ بەرەو ئامانجێکی دیاریکراو رێنموونی دەکات. مێژووی زانستەکان، سەلمێنەری ئەم راستییەیە، کە لەوەتەی مرۆڤ ئاشنایەتی لە گەڵ خوێندنەوە و نووسین و لێکۆڵینەوە پەیداکردووە، ئاشنایەتیشی لەگەڵ شێواز و میتۆدەکان پەیداکردووە.

سەرەتا بەشێوەیەکی خۆرسك و پەرشوبڵاو و زۆر سادە و سەرەتایی دەستیپێکردووە، دواتر بە تێپەڕبوونی کات بەرەوپێشچوون و گەشەسەندنی بەخۆوە بینیوە. مێژووی میتۆد و مەنهەجیەت لە مێژووی مرۆڤایەتی بە کۆمەڵێك هەنگاو و قۆناغ تێپەڕیوە. دوای هاتنی پەیامی ئیسلامیش، هەمان چەشنی بەخۆوە دیوە. سەرەتا مەنهەجی دەماودەم وەرگرتن و دەرخکردن، دواتر بەرەو نووسینەوە بە تێپەڕبوونی کات گەشەی کردووە.

لە سەردەمی پەیامهێن و هاوەڵان، دەرخکردن و وەرگرتن لەڕێگەی خوێندنەوە، رێگەی سەرەکی وەرگرتنی قورئان بووە، لەپاڵ نووسینەوە لەسەر پێستە و پەڕەی خورما و ئامرازە سەرەتاییەکانی تر، کە لە بری کاغەز و تێنووس بەکارهێنراون.

دواتر مەنهەجیەتی ئیسلامی، لەسەر شێوازی مەنهەجیەتی تەواوکاری، پێکهاتەیەکی نوێی وەرگرتووە. دوای کۆکردنەوەی قورئان، ئینجا مەنهەجیەتی کۆکردنەوەی فەرموودەی پەیامهێن (دروودی خوای لەسەر)،

بەکارهێنانی مەنهەجی رەخنە و ساغکردنەوە (النقد والتوثیق) سەریهەڵداوە، کە لە پرۆسەی کۆکردنەوەی فەرموودە بەکارهاتووە.

پاشان لقەکانی (الجرح والتعدیل والعلل والرجال)ی لێبووەتەوە و زیاتر گەشەی کردووە، لەو سەردەمدا وردەوردە چەمك و دەستەواژەی نویێ بۆ ئەم پرۆسەیە و ژانەرەکانی هاتوونەتە مەیدانی لێکۆڵینەوە.

دوای ئەوە لە چاخی زێرینی مێژووی ئیسلام، زانستەکانی بنەماکانی فیقهی ئیسلامی (أصول الفقه) مەنهەجەکانی راڤەکاران (مناهج المفسرین) و مەنهەجەکانی گرووپە عەقیدەییەکان و زانستی کەلام و فەلسەفە دامەزران، سەرەنجام مەنهەجی چێژی سۆفیگەری و عیرفان (المنهج العرفاني الذوقي) و مەنهەجی زانستە ئەزموونییەکانیش لەدایك بوون، دواتر وردەوردە تا سەدەی شەشەمی کۆچی، مەنهەجیەت لە جیهانی ئیسلامی، کە ئەوسا پێشەنگایەتی شارستانیەت و ژیارستانی جیهانی دەکرد، هەر لە درەوشانەوە و گەشەسەندنی بەردەوام بووە.

ئەوکات لە جیهانی ئیسلامیدا، تێکڕای ئەم مەنهەجانە کارپێکراو و کارا بوون، تەنانەت بەشێکی بەرچاوی زانایانی موسڵمان بە شارەزایی فرەلایەن دەناسرانەوە، بەجۆرێك لەکاتی مامەڵەکردن لەگەڵ هەر بوارێکی دیاریکراو، مەنهەجی تایبەت بەم بوارەیان خستووەتە گۆڕەپانی کارکردنەوە.

سەرەنجام مەوسووعی بوون، بە واتای کۆکردنەوەی شارەزایی لە چەندین بوار لە یەك کاتدا، بریتیبوو لە یەکێك لە پێناسەی زانا و فەیلەسووفەکانی ئەوکاتی جیهانی ئیسلامی[1].

بۆنموونە: زانای وا هەبووە، پسپۆڕی فیقهی ئیسلامی (فقیه)، ئوسولّی، فەرموودەگێڕەوە بووە، وەك پێشەوا مالیك. هەروەها راڤەکار، فەیلەسووف و پزیشك، وەك فەخرەدینی ڕازی و ئیبن سینا. چەشنی ئەوان، فەیلەسووف، سۆفی، وەك ئیبن عەرەبی و سوهرەوەردی. کەسایەتی واش هەبووە، شاعیر، ئەدیب، فەیلەسووف، سۆفیگەر و ڕاڤەکار بووە، وەك ئەبو حەییانی ئەندەلووسی. یان فەیلەسووف، بیرکاریزان، فیزیایی و پزیشك وەك حەسەنی کوڕی هەیسەم. شارەزای مێژوو، راڤەی قورئان، فیقه و ئەحکام وەك محەممەد بن جەریری تەبەری. کیمیاگەر و فەیلەسووف وەك جابری کوڕی حیان. شارەزا لە زۆربەی بوارەکانی ئەوکات و داڕێژەری زانستە کۆمەڵایەتییەکان وەك ئیبن خەلدوون....هتد.

نامانەوێت بەوردی و دوورودرێژی لەسەر قوتابخانە مەنهەجییەکانی جیهانی ئیسلامی بووەستین، بەڵکو تەنها بەپووختی ئاماژەیەك بۆ تێڕوانین و جیهانبینییەکەیان دەکەین.

---

[1] فتحي ملكاوى، منهجيهالتكامل المعرفي مقدمات في المنهجية الإسلامية، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، فرجينيا–الولايات المتحدة الأمريكية، ط٢، ٢٠١٦م، ص١٧٧.

قوتابخانە مەنهەجییەکان ئێجگار زۆرن، بەشـێوەیەك ژمـاردن و توێکـاری گـشتییان ئەسـتەمە، بـەڵام دیارترینیـان کـە زۆرتـرین خـاڵی هاوبەشـی قوتابخانەکان کۆدەکەنەوە، بریتین لە: "مدرسـة المـنهج العقلـي– الكلامـي– الفلسفي، مدرسة المنهج الـذوقي الـصوفي، مدرسـة المـنهج العلمـي التجـريبي، مدرسـة المـنهج الفقهـي والأصـولي، مدرسـة المـنهج الأثـري". هەریـەك لـەم قوتابخانانە، خاوەنی کۆمەڵێك بنـەما و پایـەی مەنهـەجی تایبـەتن، هاوکـات هەزاران شوێنکەوتوویان لە جیهانی ئیسلامی هەبووە و هەیە.

دەکرێت بەشێوەیەکی گشتی روانگـە مەنهەجییـەکان بەسـەر سـێ بـەش پۆلێن بکەین، کـە دوای هـاتنی ئیـسلام لەشـێوەی سـێ قۆنـاغ لـە مێـژووی مەنهەجیەت خۆیان نمایش دەکەن.

**روانگەی یەکەم:** روانگەی تاکلایەنە، یان تاکڕوانگەیی (النظرة الاحادية أو الرؤيـة الواحديـة). ئـەمجۆرە مەنهەجیەتـە خـۆی لەمـە دەبینێتـەوە، کـە مەنهەجی بیرکردنەوە و توێژینەوە لە هەر بابەتێك، بریتییە لە یەك مەنهەج[1].

بـە واتایـەکی تـر، لێکۆڵینـەوە لـە دیـاردە گەردونییـەکان، دیـاردە کۆمەڵایەتییـەکان، دیـاردە دەروونییـەکان، تـەنها لەڕێگـەی یـەك مەنهـەجی دیاریکراوەوە ئەنجام دەدرێن.

ئـەم بابەتـە زیـاتر لـە روونکردنـەوەی تێـڕوانینی "ئۆگـست کۆنـت" بـۆ قۆناغەکانی مەنهەج لە ژیارستانیی مرۆڤایـەتی روونـدەبێتـەوە. ئـەو پێیوایـە

---

[1] فتحي ملكاوي، كلمة التحرير في مجلة إسلامية المعرفة، العدد ٦٤، ص٦.

هزری مرۆیی بە سێ قۆناغ تێپەڕیوە، کە بە هەرسێکیان روانگەی تاکلایەنە کامڵ دەبێت:

قۆناغی ئایینی لاهوتی، دواتر قۆناغی میتافیزیك، لە کۆتاییدا گەیشتن بە قۆناغی مەنهەجی زانستە ئەزموونییەکان. بەمشێوەیە هزری مرۆیی گەیشتووەتە قۆناغی پێگەیشتن. هەر یەکێك لەم قۆناغانە لە کات و ساتی مێژوویی خۆی رابەرایەتی شیکردنەوەی دیاردەکانی کردووە. واتە سەرەتا تەنها ئایین و لاهوت بریتیبوون لە شیکەرەوەی دیاردە گەردوونی و کۆمەڵایەتی و دەروونییەکان، تەنها دەرچە و دەروازە و رووگەی هانا و هاوارکاران هەر ئایین بووە، چارەسەرە ئاینییەکانیش کلیلی تێکڕای کێشە و قەیرانەکان بوون.

دواتر قۆناغی ئایین تێپەڕێندراوە و قۆناغی میتافیزیك شوێنی ئایینی گرتووەتەوە، هەر لەڕێگەی میتافیزیکەوە هەوڵی دۆزینەوەی چارەسەری کێشەکان دراوە.

سەرەنجام دوای دۆزینەوەی مەنهەجی زانستە ئەزموونییەکان، خودی ئەم زانستە شوێنی ئایین و میتافیزیکیان گرتووەتەوە، ئیدی لەو سەردەمە بەدواوە، زانست هەموو دەردەکان چارەسەر دەکات و وەڵامی هەموو پرسیارەکان دەداتەوە. ئەم قۆناغە تا کۆتایی سەدەی حەڤدەهەمی زایینی کارا بووە.

**روانگەی دووەم:** رووانگەی دوولایەنی "الثنائية"، کە پشت بە لایەنی چەندیەتی و چۆنیەتی لە چارەسەرکردنی پرسەکان دەبەستێت. دوای دەرکەوتنی شکستەکانی مەنهەجی زانستە ئەزموونییەکان و دەستەوەستانی

له هەمبەر چارەسەری گشت پرسـەکان، باسوخواسـی مەنهـەجی چـەندیەتی "المنهج الكمي" هاتە بەرباس، سەرەنجام بووە رووگەی زۆربەی توێژینەوە و ناوەندە ئەکادیمییەکان.

دواتر ئەزموون سەلماندی بە تەنها پشتبەستن بە چەندیەتی، بۆ گەیشتن بـە دیراسـەکردنێکی واقعیانـە لەهەمبـەر گـشت پرسـەکان، خـاڵی نییـە لـە کەموکوڕی، بۆیە باس و خواسی گرتنەبەری مەنهەجی چـۆنیەتیش "المـنهج الكيفي" هاتە نێو ناوەندە ئەکادیمییەکانەوە.

بەمشێوەیە، بەشێك لە ناوەنـدە زانستی و ئەکادیمییـەکان دەسـتیان بـە مەنهەجی چەندیەتیەوە گرت و، هەندێکی تریش جەختیان لەسـەر چـۆنیەتی دەکردەوە. بەمەش دووجەمسەری لە مەنهەجیـەت بـووە روانگـەی دووەمـی مەنهەجیەت.

هەریەکێك لەم دوو مەنهەجەش کۆمەڵێك تایبەتمەندییان هەیە، بۆ نموونە یەکەمیان، واتە چەندیەتی، زیـاتر بـەوردی و جـێگیری لـە دەستنیـشانکردن دەناسرێتەوە، لەبەرامبەردا مەنهەجیەتی چۆنیەتی زیاتر لە راستی و دروستی و رۆچوون لە هەقیقەتی شتەکان دەناسێنرێت.

بۆیە هەریەکێك لەم دوو مەنهەجە لە چەند بوار و پسپۆری جیا بەکاردێن، بەشـێوەیەك لـەم بوارانـەی مەنهەجیـەتی چـۆنیەتی بـەکاردێت، ناتوانرێـت مەنهـەجی چـەندیەتی بـەکاربێت، بەپێـچەوانەشەوە راسـتە، ئـەم قۆناغـەش سەدەی هەژدە و نۆزدە کارا بووە.

**روانگـەی سـێیەم:** بریتییـە لـە روانگـەی یـەکانگیری و تـەواوکاری، ئـەم روانگەیـە لـە تێپـەڕکردنی هـەردوو روانگەکـەی رابـردوو خـۆی دەبینێتـەوە.

هەنـدێك لـە بوارەكـان پێویـستیان بـە بـەكارهێنان و كـاراكردنی هــەردوو مەنهەجی "چەندیەتی و چۆنیەتی"یە، بەتایبەت ئەو بوارانـەی بـە مـیكس و لێكدراو دەناسێنرێن[1] .

لێرەدا هەوڵی دەربازبوون لە تاكڕوانگەیی و تێپەڕانـدنی دووجەمـسەری و دووڕوانگـەیی مەنهەجیـەت و گەیـشتن بـە بینـاكردنی مەنهـەجێكی تۆكمـەی یەكانگیر، كە هەردوو بابەتی چەندیەتی و چۆنیەتی لەخۆبگرێت، بەشێوەیەك لەسەر ئەساس و بنچینەیەكی فەلـسەفی جیـاواز لـە بنـچینە فەلـسەفییەكانی مەنهەجەكانی تاكڕوانگەیی و جووتڕوانگەیی دامەزرابێت، بایەخدارتر دەبێت.

ئیدی ئەم مەنهەجە یەكانگیر و تەواوكارییە، دەتوانێـت لەهەمبـەر پرسـە هەنووكەییـــەكان و دیـــاردە گـــەردوونی و دەروونـــی و كۆمەڵایەتییـــەكان بەشـێوەیەكی تەندروسـتانە و واقیعیانــە دەرەنجـامی بـاش و دڵخۆشـكەر پێشكەش بكات.

ئـەم مەنهەجـە یـەكانگیر و تەواوكارییـە، تـەنها لەڕێگـەی ئاوێتـەكردنی هەردوو مەنهەجی چـەندیەتی و چـۆنیەتی بەرهـەم نایـەت، وەك ئـەوەی لـەم چاخە لە رۆژئاوا كاری بۆ دەكرێت، بەڵكو پێویستی بـە بناغەیـەكی فەلـسەفی تۆكمەی جیاواز هەیە لە مەنهەجە بەرجەستەكراوەكانی جیهان.

بناغەیەكی فەلـسەفی جیـاواز، بـە دەستخـستنی سەرچـاوەكانی زانـست و زانیـاری و ئامرازەكـانی دەستخـستنی زانـست و زانیـاری و، ئاوێتـەكردنی سەرچاوە و ئامرازەكان، خاڵی جیاوازی ئەم مەنهەجە خوازراوە دەبێـت، كـە

---

[1] فتحي ملكاوي، منهجية التكامل المعرفي، ص ١٨٢، رائد جميل عكاشة، التكامل المعرفي، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، ط١، ٢٠١٢م، ص٨٩.

لەڕێگــەی کــاراکردنی ڕێگاکــانی توێژینــەوە لەڕێگــەی بیرکردنەوەیــەکی تەندروست، پـشت بەسـتن بـە دیـد و جیهـانبینی ئـەم بنـچینە فەلـسەفییە، دەبێتە خاڵی وەرچەرخان لە جیهان بەگشتی و جیهانی ئیسلامی بەتایبەتی.

خوێنەری بەڕێز، ئەم پەرتووکەی بەردەستت گەشتێکی هزری و مەعریفی و مەنهەجی ورد و قووڵە، پێویستی بە پشوودرێژی هەیە، هەنگاونان بۆ ئـەم گەشتە ماندووکەرە، هەوڵێکە بۆ ئاشنایەتی پەیداکردن لەگەڵ ئەم مەنهەجـە نوێیە، بەپێویستشی دەزانین، بەر لە شۆڕبوونەوە بـەنێو بابەتـە سـەرەکی و تێزە مەعریفی و هزرییەکان، ئاماژە بۆ خاڵێکی تری گرنگ بکەین.

ئەمیش ئەوەیە، ئەم پەرتووکـە هەوڵێکـە بـۆ زیـاتر ناسـاندنی خوێنـەری کورد بە هزر و مەعریفەی پەیمانگای جیهانی هـزری ئیـسلامی، کـە لـە سـەر هەردوو فۆڕمی (إسلامیة المعرفة، التكامل المعرفي) باسی لێوە دەکرێـت.

بۆیە هەر خوێنەرێك بیەوێت بەشێوەیەکی تەندروسـت و ئاسـان بـە کـۆی پایە و بنەماکانی ئەم هزرە هاوچەرخە ئاشنابێت، ئـەوە ڕێنماییمـان ئەوەیـە سەرەتا پەرتووکی "قوتابخانەی إسلامیة المعرفة لە دیـدی ڕابەرەکانییـەوە" کـە بەرهـەمی خامـەی توێـژەرە و سـاڵی ٢٠١٥ لەلایـەن سـەنتەری زەهـاوی بڵاوکراوەتەوە، بخوێنێتەوە، چونکە هەردوو پەرتووکەکە بەیەکەوە بـاس لـە پووختەی ئەم هزرە دەکەن.

لەلایەکی تر، کۆمەڵێك خاڵی هاوبەش لەنێوان ئەم پەرتووکەی بەردەستی خوێنــەر و پەرتووکەکــەی تــر هــەن، بۆیــە لــە زۆر شــوێن کورتبڕیمــان لــەم پەرتووکە کردووە، چونکە لە پەرتووکەکەی تر بەدرێژی ڕوونکراوەتەوە، لەو

شوێنانەی کورتبڕی کراوە، خوێنەر ڕێنمایی کراوە لەڕێگەی ئاماژەکردن بە لاپەڕە و ناونیشانەکان، بۆئەوەی ئاسانتر بتوانێت بگەڕێتەوە سەریان.

خاڵێکی تر، کە پێویستە ئاماژەی پێبدرێت، بەهۆی ئەوەی بابەتی تەواوکاری زانستەکان (التكامل المعرفي) بابەتێکی هەنووکەییە لەسەر ئاستی جیهان و کوردستان، بەردەستنەبوون و کەمی سەرچاوە یەکێك بووە لە ئاستەنگەکانی بەردەم توێژەر.

دەرەنجام چەند پەرتووکێك وەك سەرچاوەیی سەرەکی لەم گەشتە مەعریفیە پشتیان پێبەستراوە، گرنگترینیان: "التكامل المعرفي وتطبيقاته في المناهج الجامعية"، کە بریتیە لەتێزی دکتۆرای "ئەبوبەکر محەمەد ئیبراهیم" لە زانکۆی ئیسلامی جیهانی مالیزیا لەساڵی ٢٠٠٤ پێشکەشکراوە و دواتر پەیمانگای جیهانی هزری ئیسلامی لە ساڵی ٢٠٠٧ چاپیکردووە. ئەم پەرتووکە بە پەرتووکی دایك هەژماردەکرێت لەسەر ئەم پرسە لەتێکرایی جیهان، چونکە لە نزیکەوە زۆربەی بیرمەندەکانی پەیمانگای سەبارەت بە ناوەڕۆکی توێژینەوەکە دواندوون و سەرنجەکانی شیکارکردون.

هەروەها، پەرتووکی "منهجية التكامل المعرفي مقدمات في المنهجية الإسلامية" لەدانراوی فەتحی حەسەن مەلکاوی، لەلایەن پەیمانگا بەچاپگەیێندراوە، یەکێکی ترە لەو پەرتووکانەی بەدرێژای ئەم توێژینەوەیە هاوڕێمان بووە.

پەرتووکی سێیەم، بریتیە لە "التكامل المعرفي، أثره في التعليم الجامعي وضرورته الحضارية" کە خۆی لە ٢٤ توێژینەوە دەبینێتەوە، رائيد عوكاشە ئەرکی کۆکردنەوە و ڕێکخستنی لە ئەستۆ گرتووە.

هـەروەها گۆڤـاری "ئیـسلامیەتی مەعریفـە" کـە بریتیـە لـە زمانحـاڵی پەیمانگای جیهانی هزری ئیسلامی، مەرجەعی سەرەکیمان بووە لەم گەشتە، لە زۆربەی بەشەکان بۆ توێژینەوەکانی ئەم گۆڤارە گەراوینەتەوە و کەڵکمان لێوەرگرتووە.

هیوادارم بەم کتێبە، توانیبێتمان خزمەتێك، هەرچەندە کەمیش بێت، بـە کاروانی مەعریفەدۆستان بکەین، گومانی تێدا نییە ئەم کارەش خاڵی نییە لە کەموکوورِی، بۆیە هەر لە دەسـتپێکەوە ئەمـە وەبـیر خوێنـەر دەهێنینـەوە، تەنها پەرتووکەکەی زاتی اللە بێ کەموکورِییە و، تێکرِای بەرهەمە مرۆییەکان بەدەر نین لێی، هیچ کەسێکیش جورئەت ناکات بانگەشەی بـێ کـەموکوورِی بوون بکات.

بۆیە لە کێشە و کەموکوورِییەکان داوای لێبـوردن دەکـەین، ئومێـدەوارین پـەروەرێنی بـاڵا بیکاتـە زاد و توێـشووی قیامـەت، دەستیـشمان بگرێـت لـە داهاتوودا کاری جوانتر و پووختتر ئەنجام بدەین.

**کۆسرەت ساڵح ئەحمەد**

**مامۆستا لە زانکۆی سەلاحەدین – هەولێر**

# بەشی یەکەم
# ڕەهەندەکانی پڕۆژەی ئیسلامیەتی مەعریفە

زۆربەی نووسراوەکانی تایبەت بە بابەتەکانی پڕۆژەی (إسلامية المعرفة) دوو ڕەهەند لەخۆدەگرن، کە بریتین لە هەردوو ڕەهەندی مەعریفی و میتۆدی (مەنهەجی).

ئاشکرایە لای شارەزایانی هزری ئیسلامی، پڕۆژەی ئیسلامیەتی مەعریفە لەسەر ئاستی جیهان بەگشتی و، وڵاتانی ئیسلامی بەتایبەتی، بە یەکێك لە پڕۆژە هەرە کاراکانی تایبەت بە چاکسازی هزری و، هەستانەوەی ژیارستانیی جیهانی ئیسلامی دادەنرێت.

سەبارەت بە هەردوو ڕەهەندی سەرەوەی پڕۆژەکە، دەکرێت بەپووختی ناوەڕۆکیان لەم چەند دێڕەدا کورتبکرێنەوە و بخرێنە بەردەستی خوێنەر.

پێکهاتەی ڕەهەندی مەعریفی لە ناوەڕۆکی تیۆری هزری مرۆیی و پەیکەرەکەی خۆی دەنوێنێت، هەریەك لە ڕاستییەکان (الحقائق)، چەمکەکان

(المفاهیم)، بنەماکان (المبادئ)، تیۆرەکان (النظریات)، لە هزری ئیسلامیدا لەچوارچێوەی دیدێکی گشتی و هەمەلایەنە بۆ ئەم بابەتانە لەخۆدەگرێت[1].

بە واتایەکی تر، کاتێك باس لە رەهەندی مەعریفی پڕۆژەی ئیسلامیەتی مەعریفە دەکرێت، ئەوە روونە باس لە یەکێك لەم بڕگانەی سەرەوە دەکرێت، ئەوانیش بریتین لە (راستییەکان، چەمکەکان، بنەما گشتییەکان، تیۆرە سەرەتایی و هەمەلایەنەکانی ئەم پڕۆژەیە).

**رەهەندی دووەم:** بریتییە لە میتۆدی پڕۆژەکە و بەسەر سێ توخم (عنصر) دابەش دەبێت، کە بریتین لە: رێگاکانی بیرکردنەوە و شێوازەکانی، رێڕەوەکانی توێژینەوە و هەنگاوەکانی، پاڵنەرەکانی ئاکاری[2].

واتە هەرسێ توخمی بیرکردنەوە، توێژینەوە، ئاکار و رەوشت، بریتین لە توخمە بنچینەییەکانی تایبەت بە رەهەندی میتۆد و مەنهەجی پڕۆژەی ئیسلامیەتی مەعریفە بەگشتی.

بەم شێوەیە پڕۆژەکە کامڵ و تەواو دەبێت، چونکە پێکهاتەی هەردوو رەهەندەکە پەیکەری پڕۆژەکە تەواو دەکەن، بەوچەشنە گرێدان و بەیەکبەستنەوەیەکی یەکانگیر بۆ هەردوو رەهەندی مەعریفی و میتۆدی لەدایك دەبێت، بە مەرجی رەچاوکردنی راگرتنی هاوسەنگی لەنێوان ئەم دوو رەهەندەدا.

---

[1] المعهد العالمي للفكر الإسلامي–مكتب الأردن، التكامل المعرفي إطار مرجعي للمنهجية الإسلامية، تاريخ النشر: ١٠–١٠–٢٠١٣، تاريخ التصفح: ٢١–١٠–٢٠١٦، الرابط المباشر:

http://iiitjordan.org/index.php/2013-10–

[2] ملكاوي، منهجية التكامل المعرفي، ص ٩.

سەبارەت بە هاوسەنگی، شیاوی ئاماژەپێکردنە هاوسەنگی لە هەر کار و پرۆژەیەکدا بە بەردی بناغە دادەنرێت، چونکە هیچ کارێك بە لاسەنگی ناتوانێت ئامانجەکەی بەتەواوەتی بپێکێت.

خاڵی سەرەکی بیناکردنی هاوسەنگی لە پرۆژەی هزری ئیسلامیەتی مەعریفە کە پەیمانگای جیهانیی هزری ئیسلامی کاری لەسەر دەکات، بریتییە لە هێنانەکایەی یەکانگیری لەنێوان هەردوو رەهەندی مەعریفی و میتۆدی.

هەموو رەهەندێکی مەعریفی لە بواری کرداری پێویستی بە رەهەندی میتۆدی دەبێت، میتۆدیش بریتییە لە رێگای جێبەجێکردن و بەکرداریکردنی زانست و مەعریفەت. بۆیە ناکرێت دوور لە میتۆد باس لە هیچ مەزهەب و رەوتێکی مەعریفی بکرێت و تێزەکانی ئەو زانستە یاخود ئەو مەعریفەیە جێبەجێ و پەیڕەو بکرێن.

کاتێك باس لە تێزە هزرییەکانی پڕۆژەی ئیسلامیەتی مەعریفە دەکرێت، راستەوخۆ باسوخواسی تایبەت بە میتۆدی دابەزاندنی ئەو هزرە لە خەیاڵەوە بۆ واقیع و، لە هزر و تیۆرەوە بۆ کردار و ئاکار ئامادەیی دەبێت.

بۆنموونە، کاتێك باس لە مەرج و پایەکانی دروستبوونی نوێژ دەکرێت، راستەوخۆ بابەتی چۆنیەتی ئەنجامدان و هێنانەکایەی کرداری نوێژکردن، لە خاڵی دەستپێك بۆ خاڵی کۆتایی، لە خەیاڵدانی گوێگر دەزرینگێتەوە.

بەهەمانشێوە کاتێك باس لە راستییەکان و چەمك و بنەما و تێزە هزری و مەعریفییەکانی پڕۆژەی ئیسلامیەتی مەعریفە دەکرێت، گوێگر یاخود

خوێنەر، راستەوخۆ خـەیاڵی بـۆ لای چـۆنیەتی بەرجەسـتەکردنی ئـەو تێـزە مەعریفیانە دەڕوات.

وەك لـە سـەرەوە ئاماژەمـان پێکـرد، خـاڵی جەوهـەری لـە ئامانجـەکانی پرۆژەی ئیسلامیەتی مەعریفە، بریتییە لە چاکسازی هـزری و هەسـتانەوەی ژیاری لە جیهانی ئیسلامی.

کەوابێت خوێنەر مافی خۆیەتی بپرسێت چـۆن ئـەم ئامانجـە دەپێکرێـت؟ خاڵی دەستپێك و کۆتایی کامەیە؟ لەکوێوە دەست پێبکـەین؟ سـەرەتا کـام کێڵگــەی هــزری و کــرداری بکەینــە ئامــانج؟ چــونکە چاکـسازی هــزری و هەستاندنەوەی بـاری کـەوتووی ژیارسـتانیی ئیـسلامی، بەدرێـژایی سـەدەی رابـردوو تـاوەکو دەگاتـە ئـەمڕۆ، یـەکێك بـووە لـە گـرنگترین ئـەو پرسـانەی هەمیشە بە گەرموگوڕی کاریان بۆ کراوە.

کارەکەش ئەوەندە سووك و ئاسان نییە، بە نووسینی چـەند پـەرتووکێك یان رێکخستنی چەند کۆنفرانس و کۆڕ و سیمینارێك بێتە ئـاراوە، بـەڵکو زۆر لەوە گەورەتر و قورسترە، بەشێوەیەك پێویستی بە هزر، پـرۆژە، سـتراتیژ، کار و چالاکی سەرتاسەری، بەردەوام و، فرەلایەن و فرەڕەهەند هەیە.

پرۆژەی ئیسلامیەتی مەعریفە بەوردی کار لەسەر چەند پرسـێك دەکـات. سەرەتا نەخۆشییەکانی هزری و ژیـاریی جیهـانی ئیـسلامی دیـاری دەکـات و دەست لەسەر برینـەکان دادەنێـت، دواتـر بـە ئامـانجی چارەسـەر هـەنگاو و رێگاکانی چارەسەری لەگەڵ توێشوو و پێویستییەکانی رێگاکـە دەخاتـەڕوو، دواتر لە بواری کرداری هـەنگاوی بـۆ دەنێـت، ئەمـەش لەڕێگـەی میتـۆدێکی

تۆکمەی چوار ڕەهەندی دێتەئاراوە، کە لەخوارەوە بەکورتی ڕوونی دەکەینەوە.

کەواتە دەکرێت میتۆدی پرۆژەی ئیسلامیەتی مەعریفە لە مامەڵەکردن لەگەڵ تێز و کۆباسە هزرییەکانی ئەم پرۆژەیە لە چوار خاڵ بخرێنەڕوو، کە ئەمانەن:

**یەکەم**: دیدێکی ئیسلامیانە، واتە هەڵقووڵاوی ناوەڕۆکی ئیسلام بێت بۆ جیهان و گەردوون، کە بە (الرؤية الكونية) ناسێندراوە. ئەم دیدەش لە هەردوو خاڵی سیستەمی مەعریفەی ئیسلامی و میتۆدەکەی خۆی دەبینێتەوە.

**دووەم**: میتۆدی مامەڵەکردن لەگەڵ بنچینە و سەرچاوە سەرەکییەکانی ئیسلام، ئەویش دوو کۆباسی تر لەخۆدەگرێت، ئەمانیش بریتین لە هەردوو بابەتی چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ قورئان و فەرموودە.

**سێیەم**: میتۆدی مامەڵەکردن لەگەڵ کەلەپوور، ئەویش دوو کۆباسی تر لەخۆدەگرێت، کە بریتین لە میتۆدی مامەڵەکردن لەگەڵ کەلەپووری ئیسلامی (التراث الإسلامي)، لەپاڵ میتۆدی مامەڵەکردن لەگەڵ کەلەپووری مرۆڤایەتی (التراث الإنساني).

**چوارەم**: میتۆدی مامەڵەکردن لەگەڵ واقیع و ڕووداوەکان، کە لە زەمینەی کرداری دەگوزەرێن. ئەم خاڵەش دیسان دوو کۆباس لەخۆدەگرێت[1].

---

[1] ملكاوي، منهجية التكامل المعرفي.

یەکەمیان میتۆدی مامەڵەکردن لەگەڵ بار و گـوزەران و رووداوەکـان وەك هەن، واتە ناسین و نەشتەرکاری بۆ پرسەکان کە لە زەمینەی کرداری گوزەر دەکەن و هەن. دووەمیـان بریتییـە لـە میتـۆدی مامەڵـەکردن لەگـەڵ هـەمان پرس، بەڵام لە داهاتوودا. واتە چۆن بتوانین پێکهاتەی ئەم پرسانەی ئێستا لەبەردەستمانن بگۆڕین، بەشێوەیەك لە داهاتوودا وا لەدایك بن بـە خواسـتی ئێمە بێت.

بـە واتایـەکی تـر، چـۆن بتـوانین پرسـەکان تەسـلیم بـە ئێمـە بـبن و بـە خواسـتی ئێمـە بگـوزەرێن، لـە بـری ئـەوەی ئێمـە تەسـلیم بـە واقیـع بـین و پرسەکان بە هەڕەمەکی و خواستی خۆیان، یان خواستی کەسانی تر لـەدایك بـبن. بۆنموونـە: کاتێـك باسـی پرۆسـە و پرسـی پـەروەردە و فێرکـردن لـە کوردستان دەکەین، سەرەتا دەبێت ناوەڕۆك و پێکهاتەی ئێستای پرۆسـەکە شـرۆڤە بکـەین، دواتـر هەڵوەسـتەیەك لەسـەر ئـەم خاڵـە بکـەین: پرۆسـەی پەروەردە و فێرکردن ئێستا لە کوردستان بەمشێوەیە، کەوابێت پێویستە لە داهاتوودا چۆن بێت؟

خودی میتۆدی مامەڵەکردن لەگەڵ پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن ئێـستا لە کوردستان چۆنە؟ پێویستە لـە داهـاتوودا چـۆن بێـت؟ چـۆن بتـوانین بـە خواستی ئێمە بەرێوەبچێت؟، هاوڕێ لەگەڵ وەڵامی ئەو پرسیارانە بریتییە لە کرۆك و ناوەڕۆکی خاڵی چوارەم.

بەمـشێوەیە بۆمـان روونـدەبێتـەوە میتـۆد هیـچی کـەمتر نییـە لـە تێـزە هزرییەکان، بگرە خاڵی جەوهەری هەموو پرۆژە و هزرێکە.

ئەوەی مایەی مشتومڕ لەسەرکردن نییـە، بریتییـە لـەوەی بیرکردنـەوەی میتۆدی و مەنهەجیانە پێویستییەکی حەتمییە بۆ سەرکەوتنی هـەر کارێـك و گەیشتن بە ئامانج و هەر خواستێك. مێژوو سەلماندویەتی هەر کارێـك لەسـەر بیرکردنەوەیەکی میتۆدیانە دەستی بۆ برابێت، ئامانجەکەی پێکـاوە، ئەگـەر بەشـێوەیەکی ڕێـژەیش بووبێـت، بەپێـچەوانەی کـارێکی بینـاکراو لەسـەر بیرکردنەوەیـەکی عەشـوایی و نامەنهـەجی، ئـەم جـۆرە چـالاکیانە نـەوەك ئەگەری پێکانی ئامانجی نەبووە، بگرە زۆر جاریش دەرەنجامی پێـچەوانەی لێکەوتووەتەوە. ئینجا جیاوازی نییە کارەکە لەسەر دەسـتی تاکێـك ئـەنجام درابێت، یان لەسەر دەستی کۆمەڵێك کەس، یـان نەتـەوە و شـوێنکەوتووانی ئایین، مەزهەب، ڕەوت و گرووپێکی دیاریکراو.

بابەتی میتۆدی و مەنهەجیبوون لەسەر ئاستی جیهان گرنگی خۆی هەیە. تێکڕای ناوەند و پێگە زانستی و هزرییـەکان خـاوەنی پـەیڕە و مەنهـەجێکی ڕوون و دیاریکراون، زانکۆکان بەنموونە. ناکرێـت زانکـۆ، پـەیمانگا، ناوەنـدە ئەکادیمی و پیشەییەکان بەبێ پرۆگرام و مەنهەج کار بکەن.

بەپێویستی دەزانین ئاماژە بەوە بدەین، کە مەبەستمان بەپێویـستزانینی میتۆد تەنها بریتی نییـە لـە ئامـادەیی میتـۆد لـە کـردار، بـەڵکو بریتییـە لـە پێویستی ئامادەیی سەرەکی میتۆد لە بیرکردنەوە و ئەفکار، قسە و گوفتار، ئینجا لـە کـردار و ئاکـار. کەواتـە لـە تێکـڕای چـالاکییە بـیری و گوفتـاری و کرداری و ئاکارییەکان، هەبوونی میتۆد پێویستە، بـەهیچ شـێوەیەك ناکرێـت میتۆد پشتگوێ بخرێت یان خۆی لێ ببوێردرێت.

کەلــەپوور (تــراث)ی مرۆڤایــەتی بەگــشتی و کەلــەپووری ئیــسلامی بەتایبەتی، خالّی نییە لە میتۆد. راستە میتۆدەکان جۆراوجـۆرو فـرەڕەنگن، بـە قـەد فرەڕەنگـی تـاقم و دەسـتە و گـرووپ و ریـچکەکان، بـەلاّم ئـەوەی جێگەی سەرنجە ئامادەیی میتۆدە لە گشت کایە مەعریفی و زانستییەکان.

لەمــە زیــاتر شــۆڕنابینەوە بــۆ نــاو وردەکاریــەکانی میتــۆد و بابەتــە پەیوەندیدارەکانی، بـەڵکو دەگەڕێینـەوە سـەر باسـە سـەرەکییەکەمان، کـە بریتییە لە (التكامل المعرفي).

# بەشی دووەم

# پێگەی تەکامولی مەعریفی

# لە پڕۆژەی ئیسلامیەتی مەعریفەدا

پێگەی تەکامولی مەعریفی لە پڕۆژەی ئیسلامیەتی مەعریفەدا، بریتییە لە بەشی سەرەکی میتۆد لە میتۆدی ئەو قوتابخانە هزرییە. بۆیە دەکرێت ئەم چەمکە وەك چوارچێوەی مەرجەعی میتۆدی قوتابخانەی ئیسلامیەتی مەعریفە بناسێنرێت. چۆن پێشتر بابەتی ئیسلامیەتی مەعریفەمان وەك قوتابخانەیەکی هزریی ئیسلامی سەردەم ناساند [1]، بە هەمانشێوە تەکامولی مەعریفی وەك مەرجەعی میتۆدی ئەو قوتابخانەیە شیکار دەکەین. بە واتایەکی تر، بابەتی تەکامولی مەعریفی بریتییە لە چەتری هەر چوار خاڵە میتۆدییەکان، لە رەهەندی میتۆدی پڕۆژەی ئیسلامیەتی مەعریفە، کە لەسەرەوە باسمان کرد.

---

[1] بروانە: قوتابخانەی إسلامیە المعرفە، کۆسرەت صالح، سەنتەری زەهاوی، ٢٠١٥ز.

تەکامولی مەعریفی بریتییە لە یەکانگیری هەمەلایەنە و فرەڕەهەند لەنێوان سەرچاوەکانی مەعریفەت لەلایەك، هەروەها لەنێوان ئامرازەکانی مەعریفەت لەلایەکی ترەوە. لەپاڵ هێنانەکایەوەی یەکانگیری مەعریفی لەنێوان هەردوو بەرەی سەرچاوە و ئامرازە مەعریفییەکان، بەمەش تەکامولی مەعریفی لەدایك دەبێت.

ئەم ئاوێتەبوون و یەکانگیرییە (التكامل) لەسەر بنچینەی خۆرسك، سروشتی مرۆڤ (الفطرة) و پێویستی بیناکراوە.

واتە بنچینە و بناغەی تەکامول بریتییە لە هەبوونی چەند ژانەرێکی جۆراوجۆر، کە ئاماژە بۆ فرەییەکی ریشەیی دەکەن. ئاشکرایە فرەییش بریتییە لە دیاردەیەکی سروشتی خۆرسك و رەسەن، بەهیچ شێوەیەك ناکرێت رەتبکرێتەوە و کاری پێنەکرێت.

بوونی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی لە فرەییەکی قووڵ خۆی دەبینێتەوە، فرەیی لە زمان: کوردی، عەرەبی، فارسی، تورکی، ئینگلیزی...هتد، فرەیی لە نەتەوە: کورد، عەرەب، فارس، تورك... هیندی، ئینگلیز... هتد، فرەیی لە رەنگ: سپی، رەش، سوور، شین...هتد، فرەیی لە بۆچوون و بیروباوەڕ و ئایینداریدا: موسڵمان، مەسیحی، یەهودی، بووزی... هتد، فرەیی لە مەزهەب: سوننە، شیعە، حەنەفی، مالیکی، شافیعی، حەنبەلی، مەزهەبی و لامەزهەبی... هتد.

دیارە ئەمەش ویستی خودای لەپشتە، کە مرۆڤ لە ناخی خۆیدا لە فرەیی پێکهاتووە، ئینجا مرۆڤایەتی بە فرەیی رازێندراوەتەوە.

ئەگەر خودا ویستی لەسەر بووایە وەك لە قورئان هاتووە، ئەوە هەموومانی یەك رەنگ، یەك دەنگ، یەك زمان، یەك نەتەوە، یەك ئومەت، یەك خاك، یەك ئالا و یەك پەیام دروست دەكرد. بەلام ویستی خودا، فرەیی بەسەر رەنگرێژكردن بە رەنگێكی دیاریكراو هەڵبژاردووە، ﴿وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً﴾ النحل: ٩٣.

ئەم فرەییە بێ رێسا و یاسا جێنەهێشتراوە، بەڵكو لەژێر چەند بنەما و رێسایەكی گەردوونی، ئایینی و كۆمەلایەتی هەماهەنگ و یەكانگیر كراون، كە دووربێت لە كولتوور، رۆحی دژایەتی، بەربەرەكانێو یەكتر سڕینەوە. بەشێوەیەك كولتووری یەكترقبوڵكردن، رۆحی تەبایی و گیانی تەواوكاری، لەنێوان چین و پێكهاتە جۆراوجۆر و جیاجیاكان بریتی بێت لە تەواوكاری كۆمەڵگە و هاتنەكایەی یەكانگیری و تەكامولێكی فرەڕەهەند و هەمەلایەن لەنێوان چین و توێژ و پێكهاتەكانیدا.

بەمشێوەیە پێویستی هاتنەكایەی تەكامول لەنێو كۆمەڵگەی مرۆڤایەتی لەسەر دوو ئاست بەپێویست دەزانرێت، هەردوو ئاستی ناوخۆیی و دەرەكی. تەكامول، لەسەر ئاستی ناوخۆیی، لە هەبوونی پێویستییەكی حەتمی هەڵقوڵاو لەنێوان پەیوەندییە بنەڕەتییەكانی پێكەوەژیان خۆی دەبینێتەوە، وەك خۆشەویستی، سۆز، بەزەیی، متمانە، لەنێوان رۆڵە و تاكەكانی كۆمەڵگەدا. لەسەر ئاستی دەرەكیش وەك: پەیماننامە، رێككەوتننامە و بەڵێننامەكانی تایبەت بە باری ئاشتی، سەلامەتی، ئابووری، پێكەوەژیانی كۆمەڵگاكان و ولاتان. بەشداریپێكردن و سوودوەرگرتن لە توانا مرۆیی و

سەرچاوە سروشتییەکان لەنێوان مرۆڤەکان بەگشتی، لەپێناو هێنانەدی پێداویستییەکانی ژیانی مرۆڤایەتی. لەبری خۆمان خۆمان و چەوساندنەوە و کولتووری یەکترسڕینەوە و ملشکاندن، لەسەر ئاستی تاك، کۆمەڵگە، هەرێم و وڵاتان[1].

بابەتی تەکامول لەپاڵ رەهەندە مرۆییەکەی، رەهەندێکی ئایینی تۆکمە و گرنگیشی هەیە. پەروەرێنی تاقانە لە چەندین شوێنی قورئان ئاماژە بۆ بابەتی تەکامول دەکات و، رەچاوکردنی گرنگیدان بە تێکڕای لایەنە مەعنەوی و جەستەییەکان بەپێویست و گرنگ دەزانێت.

دەستخستنی مەعریفەت و رێگاکانی، دامەزراندنی هزر و گرنگیپێدانی، دواتر هاتنەکایەی ئاکار، بۆ دۆزینەوەی چارەسەرەکان و جێبەجێکردنیان لە بواری کرداری چەند تێزێکی ئیسلامی و قورئانین. هەروەك لە چەندین شوێن جەخت لەسەر تەکامول لەنێوان بیرکردنەوە و گەڕان و ئەزموونکردن، لەنێوان هزر و ئاکار، لەنێوان زانست و کردەوە کراوەتەوە ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ البقرة: ٨٢، تەکامول لە نێوان کۆشش و ئاوەدانکردنەوەی زەوی، بە ئامانجی گەیشتن بە پاداشتی دونیا و دوارۆژ.

ئیسلام هەمیشە جەختی لەسەر کۆکردنەوەی دینداری و دونیاداری کردووەتەوە. نە دینداری بە تەنها، نە دونیاداری بە تەنها، بەڵکو کۆکردنەوە و هێنانەپێشەوەی ژیانێکی دیندارانەی دونیادارانە لە تێزە سەرەکییەکانی پەیام و بانگەوازی ئیسلامن، وەك لەچەندین فەرموودەدا هاتووە.

---

[1] ملکاوي، منهجية التكامل المعرفي، ص١١.

ئەمەش هەقیقەت و گرنگی تەکامول و ڕەهەندەکانمان پێ ئاشنا دەکات، هەڵبەت تەکامول بە مەفهوم و چەمکە ڕەها و گشتگیرییەکەی.

بۆیە بەپێویستی دەزانین، لەم پەرتووکەدا باسی چەند تێزێکی هـزری و میتۆدی تایبەت بـە تـەکامولی مـەعریفی بکـەین، بـە ئامـانجی ناسـینی ئـەم بابەتــە هزرییــە و تێگەیــشتن لــە ناوەڕۆکەکــەی، بــەهیوای خــستنەگەڕ و بەرجەستەکردن و گەیشتن بە ئامانجەکانی پـڕۆژەی ئیـسلامیەتی مەعریفـە، کـە گرنگترینیـان بریتییـە لـە چاکسازی هـزری، هەسـتانەوەی ژیارسـتانی، بەدەســتهێنانەوەی پێــشەنگایەتی جیهــان لەلایــەن نەوەیــەکی دینــدار و دوونیاداری پێگەیشتوو و تێگەیشتوو، لە پـەیامی ئاسمـان و زانـستی مـرۆڤ، بنــەما لەســەر ئــەو ئــامرازە ســەردەمی و بەردەســتانەی کــە لەبەردەســتی مرۆڤایەتیدان.

دواتر هێنانەکایەی تێکهەڵکێشی و بەگەڕخستنی تێکڕای ئـەو توخمانـەی ســەرەوە بــۆ خزمــەتکردنی مرۆڤایــەتی بەگــشتی، دوور لــە قۆرخکــاری و چەوساندنەوە و زیانگەیانـدن بـە گـەردوون و بوونـەوەر و بەزانـدنی سـنوورە ئـایینی، ڕەوشـتی، مرۆیـی، کۆمەڵایـەتی و ویژدانییـەکان. ئـەم تەکامولـەی پەرتووکەکــەمان کردوویەتیــە ئامــانجی توێژینــەوە، باســی تــەکامول و یەکانگیری ڕەهـا و هەمەلایەنـە ناکـات، بـەڵکو تـەنها ئامـانجی تەکامولـە لـە مەعریفەدا .

واتــە هێنانەکایــەی تــەکامول و هەماهــەنگی لــەنێوان کۆمــەڵێك ژانــەری مەعریفی کە دەکرێت بەیەکەوە ببەسترێنەوە و بەگـەڕبخرێن، بـۆ هێنانـەدی

ئـەو ئامانجانــەی پــڕۆژەی ئیــسلامیەتی مەعریفــە هــەوڵی نیــشانەشکێنیان دەدات.

تەکامول لەنێوان سەرچاوەکان، لەنێوان ئامراز و ڕێگاکان، لەنێوان قۆناغ و قوتابخانــە و ئاراســتەکان. تــەکامول لــەنێوان سروشــتی خۆرســکی مــرۆڤ و زەمینەی دەستکرد و دروستکراو، لەنێوان نموونە و بــەها باڵاکــان، هــەروەها تەکامول لەنێوان کۆباسە ئەندازەیی و ژمارە ورد و پووختــەکانی تایبــەت بــە بابەتە هزری و خاڵە کێشەدار و ناڕوونەکانی بواری توێژینەوەی زانستیانە لە بوارە جۆراوجۆر و جیاجیاکان.

جگــە لەمانــە، بەرهــەمهێنانی تــەکامول لەســەر ئاســتی هــەردوو بەشــی بابەتیانــەی " چــەندیەتی و چۆنیەتی" کــە پڕبێــت لــە بەرهــەمی واتــادار و توێکــاری قــووڵ. هــەموو ئەمانــە و چــەندانی تــریش، لــەپێناو گەیــشتن بــەو چوارچێوە و مەرجەعە هزرییەی کرۆکی مەنهەجیەت و میتۆدیانەی پڕۆژە پڕ لە ستراتیژ و دوور مەوداکەی ئیسلامیەتی مەعریفەمان، تا ئاســتی کــامڵبوون پێ ئاشنا دەکات.

# بەشی سێیەم
# مەفهومی تەکامولی مەعریفی

هەنگاوی یەکەمی ئەم گەشتە هزری و مەعریفییە لە روونکردنەوەی واتای چەمکی تەکامول خۆی دەبینێتەوە، دواتر روونکردنەوەی وشـەی مەعریفـە. ئینجا مامەڵەکردن لەگـەڵ نـاوەڕۆکی چـەمکی لێکـدراوی "التکامـل المعـرفي" وەك زاراوەیەکی میتۆدی و هزری و مەعریفی دیراسەکراو، لەلایەن بیرمەندانی ئیسلامی بەگشتی و، رابەرانی قوتابخانەی ئیسلامیەتی مەعریفە بەتایبەتی.

بابــەتی رووونکردنــەوەی چــەمکەکان لــە تێکــڕای بوارەکــان گرنگــی و تایبەتمەندی خۆی هەیە. دەکرێـت چـەمکێك لـە چـەند بـوار و پـسپۆڕییەکی جیاواز بەکاربێت، لە هەر بوار و پسپۆڕییەکدا دەبێتە خاوەنی مانا و ناوەڕۆك و پێکهاتەیەکی تایبەت.

لە بابەتە هزرییەکان، روونکردنەوەی چەمکەکان و تێگەیشتن لە ناوەڕۆك و پێکهاتەکانیان بایەخی تایبەتی خۆی هەیە. چەندین جـار بـەهۆی نـاڕوونی

چەمکێك یان بەلاڕێدابردن و خراپ راڤەکردنی، چەندین تێز، کۆباس، بابەت و بڕگە شێوێندراون، هەندێك جاریش واتای پێچەوانە و دەرەنجامی ئاوەژوویان گەیاندووە.

پێکهاتەی چەمکی "التكامل المعرفی" یش بەدەرنییە لەم بابەتە، رەنگە زۆر کەس لێکدانەوەیەکی رێژەییانەی بۆ بکەن، هەندێکی تر بە رەهایی و گشتگیرانە شیکار و توێکاری بۆ دەکەن. لەلایەکی تر، هەندێ لە خوێنەران خودی چەمکەکەیان هەر لە بنەڕەتەوە لا تازەیە و هیچیان لەبارەوە بەرچاو نەکەوتووە. بۆیە سەرەتاییترین کاری ئەم پەرتووکەی بەردەستی خوێنەر، بریتییە لە روونکردنەوەی مانا و پێکهاتە و ناوەڕۆکی ئەم چەمکە.

بۆ دەرنەچوون لە بابەتیبوون و شێوازی ئەکادیمی، سەرەتا هەردوو چەمکی "التكامل ـ المعرفة" لەلای زمانەوانانی عەرەب روون دەکەینەوە، ئینجا وەك چەمکێکی ئەکادیمی بەکارهاتوو، هەروەها وەك چەمکێکی میتۆدی و هزری تایبەت بە قوتابخانەی ئیسلامیەتی مەعریفە لەسەری دەوەستین.

بەمجۆرە ئەو بەشە بەسەر سێ بڕگە دابەش دەبێت، بڕگەی یەکەم تایبەتە بە روونکردنەوەی مانای تەکامول لەڕووی زمانەوانییەوە. بڕگەی دووەمیش بۆ روونکردنەوەی مانای زمانەوانی چەمکی مەعریفە. لە بڕگەی سێیەمیش لەسەر روونکردنەوەی چەمکی "التكامل المعرفي" دەوەستین، وەك چەمکێکی هزری، میتۆدی و مەعریفی.

## • بڕگەی یەکەم: التکامل لای زمانەوانان.

کاتێك باسی بەکارهێنانی وشەیەك دەکرێت لەڕووی زمانەوانییەوە، واتە پێکهاتە و ناوەڕۆکی ئەم وشەیە لای عەرەب چ مانایەکی گەیاندووە، بەر لە هاتنی ئیسلام، یان بەر لە بەکارهێنانی وەك چەمك و زاراوەیەکی تایبەت بە بوارێکی دیاریکراو؟.

بۆنموونە، کاتێك لەڕووی زمانەوانییەوە پێناسەی وشەی (الصلاة) دەکرێت، دەگوترێت (صلاة) واتە پاڕانەوە و نزاکردن، چونکە بەر لە هاتنی ئیسلام، ئەم وشەیە لای عەرەب بەمانای پاڕانەوە بەکارهاتووە. کەچی دوای هاتنی ئیسلام، هەمان وشە بووەتە چەمك و زاراوەیەکی فیقهی، بەو خواپەرستییە دەگوترێت بە (الله أکبر) دەستپێدەکات و بە سەلامدانەوە کۆتایی دێت. واتە (الصلاة) لەڕووی زاراوەوە بە واتای نوێژکردن دێت، لەکاتێکدا لەڕووی زمانەوانییەوە بە واتای پاڕانەوە بەکاردەهات. بەهەمانشێوە، وشەی "التکامل" لەڕووی زمانەوانییەوە چەند مانایەك دەبەخشێت.

ئەم وشەیە لە بنچینەی زمانی عەرەبیدا چاوگە "مصدر"، ئەگەر بۆ زمانی کوردی وەریبگێڕین، بە مانای "تەواوکردن" دێت، وشەکە لە کاری رابردووی "تَكَامَلَ" وەرگیراوە. دەگوترێت "تکامل، یتکامل، تکاملاً" واتە (تەواوی کرد، تەواوی دەکات، تەواوکردن)[1]. بۆنموونە، دەگوترێت: "تکامل

---

[1] بروانە: معجم اللغة العربیة المعاصرة، ج٣، ص١٩٥٩.

الشيء" شتەکە تەواوبوو، یاخود دەگوترێت: هەنگاو بە هەنگاو شتەکان یەکتری تەواو دەکەن [1].

لە بواری لێکۆڵینەوە دەروونییەکان، بەتایبەت بابەتی کەسایەتی و خود، دەگوترێت "تکامل" تەواوکردنی خود، واتە هەماهەنگکردن و رێکخستن لەنێوان تێکڕای جۆرەکانی کەسایەتی، لە ناخ و دەروونی مرۆڤدا[2].

لە بواری ئابووریشدا، چەمکی تەکامول بۆ کۆکردنەوەی کۆمەڵێك پیشەی جۆراوجۆر و دروستکردنی هەماهەنگی لەنێوانیاندا، بەمەبەستی گەیشتن بە ئامانجێکی دیاریکراو بەکاردێت. لە زۆربەی کایە کرداری، پیشەیی، زانستی و هزرییەکاندا، ئەم چەمکە بەکارهاتووە، لەبەر پێویست نەبوون و نەبوونی پەیوەندی راستەوخۆ بە بابەتەکەمانەوە، لێرەدا زیاتر درێژەی پێ نادەین.

لە زمانی ئینگلیزیشدا وشەی *(Integration)* بۆ هەمان مانای (التکامل)ی عەرەبی بەکاردێت، هەندێکجاریش هەمان وشە، واتە *(Integration)* بە واتای یەکێك لەم وشانە "دمج، إدماج، انسجام، ادغام، توحید، مزج" بەکاردێت. هەریەکە و لە شوێنێك بەپێی سیاق و بابەتەکە، مانای جۆراو جۆر دەبەخشن.

ئەوەی پێویستە ئاماژەی بۆ بکرێت، ئەوەیە لە بوارە هزری و مەعریفییەکەدا، *(Integration)* بەرامبەر بە تەکامول بەکاردەهێنرێت. لەزمانی شیرینی کوردیشدا وشەی "تەواوکاری" بە گونجاوترین وشە دەزانین، بۆیە هەر ئەویشمان بەکارهێناوە.

---

[1] المعجم الوسیط، ج٢، ص٧٩٨.

[2] معجم اللغة العربیة، ج١، ص٨٠٠.

• **بڕگەی دووەم: وشەی (المعرفه) زانیاری**

وشەی (المعرفة) لە بنچینەی زمانی عەرەبیدا، چاوگێکی میمییە، لە کاری رابردووی "عرف" وەرگیراوە. بە مانای هەستکردن و زانینی هەقیقەتی شتێکی دیاریکراو دێت وەك خۆی، بێ زیاد و کەم[1]. بۆیە کاتێك باسی کەسێك دەکرێت، کە کەسێکی تر باش دەناسێت، دەگوترێت: (یعرفه حق المعرفة).

سەبارەت بە وشەی (المعرفة) وەکو چەمکێکی زاراوەیی، بەمانای بەرهەمی فێرکردنی چەند ساڵە بەکاردێت.

بۆنموونە کاتێك دەگوترێت (المعرفة الإنسانية) واتە ئەو زانیاری و ئەزموونەی مرۆڤ لە ئادەمەوە تاوەکو ئەمڕۆ پێیگەیشتووە. ئینجا جیاوازی نییە، رێگەی گەیشتنی ئەو زانیاری و ئەزموونە بریتی بێت لە پرۆسەیەکی دیاریکراو و رێکخراوی وەك قوتابخانە، یان هەڕەمەکی و خۆرسك بێت.

کاتێك دەگوترێت (نظرية المعرفة) تیۆری زانین، واتە توێکاری و گەڕان بەدوای چارەسەرکردنی ئەو کێشانەی لە ئەنجامی پەیوەندی نێوان مرۆڤ و بابەتێکی دیاریکراو هاتوونەتە ئاراوە[2].

لە (قامووسی فیقهی)دا پێناسەی مەعریفە و پەیوەندی نێوان مەعریفە و زانست بەمشێوەیە خراوەتەڕوو: (إدراك الشيء بتفكر، وتدبر لأثره، وهو أخص من العلم، والمعرفة تتعلق بذات الشيء، والعلم يتعلق بأحواله)[3].

---

[1] معجم لغة الفقهاء، محمد رواس قلعجي وحامد صادق قنيبي، دار النفائس، ط٢، ١٩٨٨م، ج١، ص٤٤٠.

[2] معجم اللغة العربية المعاصرة، ج٢، ص١٤٨٧.

[3] القاموس الفقهي، د.سعدي أبو حبيب، (دمشق: دار الفكر، ط٢، ١٩٨٨م)، ج١، ص٢٤٩.

واتە، مەعریفە بریتییە لە ناسین و دەرخستنی شتێك بە بیرلێکردنەوە و تێڕامان لە کاریگەرییەکانی، چوارچێوەکەی لە چوارچێوەی زانست بەرتەسکترە، چونکە مەعریفە وابەستەیە بە خودی شتەکە، لەکاتێکدا زانست پەیوەستە بە سەردەم و بارودۆخی هەمان شت.

پێناسەکە ئەوە دەگەیێنێت زانست گشتگیرترە لە مەعریفە، بەلام بیرمەندان رای جیاوازیان هەیە لەسەر ئەم پرسە، هەندێکیان وای بۆدەچن زانیاری فراوانترە و هەندێکیش زانست بە فراوانتر هەژماردەکەن. بەشێکیش لە زانایان هەردوو چەمکی زانست و مەعریفە بە هاومانا هەژمار دەکەن [١].

هەروەها لە پەرتوکی "دستور العلماء"دا چەمکی مەعریفە بەم شێوەیە پێناسە کراوە: "المعرفة إدراك الأمر الجزئي أو البسيط مطلقاً..كما أنَّ العلم إدراك الكلي أو المركب... ولهذا يقال عرفت الله ولا يقال علمت الله"[2]. واتە: مەعریفە بریتییە لە پەیبردن بە شتێکی جوزئی یان سەرەتایی بە رەهایی، هەروەك چۆن زانست بریتییە لە پەیبردنی گشتی یان لێکدراو، بۆیە دەگوترێت خودام ناسیی، ناگوترێت خودام زانی.

بەشێوەیەکی گشتی مەعریفە بەو کۆمەڵە زانیاری و دەرەنجام و ئەنجامانە دەگوترێت، کە لەڕێگەی میتۆدێکی توێژینەوەی تۆکمە، سەبارەت بە دیاردە سروشتی و کۆمەڵایەتییەکان بەرهەم دێن[3].

---

[1] زكريا الأنصاري، الحدود الأنيقة والتعريفات الدقيقة، تحقيق: د.مازن المبارك، بيروت: دار الفكر المعاصر، ط١، ١٤١١ه، ص٦٦.

[2] دستور العلماء، عبدالنبي بن عبدالرسول الأحمد نكري، بيروت: دار الكتب العلمية، ط١، ٢٠٠٠م، ج٣، ص١٩٩.

[3] بروانە: حامد العطية، نظام المعرفة ومنهج البحث في القرآن الكريم، بيروت: دار الأنوار، ٢٠٠٦م، ص٨.

هەردوو دیدگای ئیسلامی و نائیسلامی سەبارەت بە پێناسە و ناوەڕۆکی مەعریفە بەیەك دەگەن، هەردووکیان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە، مەعریفە کۆمەڵێك راستی رێکخراو و راڤەکراون لەهەمبەر گەردوون و بوونەوەر، مرۆڤ دەتوانێت لەڕێگەی عەقڵ و میتۆدێکی تۆکمە بەدەستیان بێنێت[1].

مەعریفە لە قورئاندا بریتییە لە گشت زانیاری، رێسا، یاسا، بنەما و بنچینەکانی بەدەستهاتوو لەڕێگەی دیراسەکردنی گەردوون و قورئان. ئەگەرچی تێڕوانینی بەشێك لە موسڵمانان و هەندێ مەزاهیبی هزری و فیقهی، مەعریفە بەسەر هەردوو بەشی مەعریفەی شەرعی و مەعریفەی دەستکردی مرۆڤ دابەش دەکەن، بەشێوەیەك یەکەمیان بەرهەمی دەقە ئایینییەکانە و خوازراو و پەسەندە، پێویستە مرۆڤ تێکڕای تواناکانی بۆ خەرج بکات. دووەمیان بریتییە لە بەرهەمی عەقڵی مرۆڤ، بەشێکە لە خورافە و پێویستە خۆی لێ بەدوور بگرین. بەڵام قورئان دابەشکارییەکی لەم چەشنە ناناسێت، وەك لە داهاتوودا زیاتر ئەم بابەتە روون دەکەینەوە.

شیاوی ئاماژەپێکردنە چەندین جیاوازی خودی و بابەتی (الذاتي والموضوعي) لەنێوان زانست و زانیاری (العلم والمعرفة) هەن، بەڵام لێرەدا بەپێویستی نازانین درێژەی پێبدەین.

پسپۆڕانی بواری پەروەردە و فێرکردن پێکهاتەی قووچەکی زانیاری (الهرم المعرفي) لە چوار نهۆم دەخەنەڕوو: داتاکان (البيانات)، زانراوەکان

---

[1] حامد العطية، نظام المعرفة ومنهج البحث في القرآن الكريم، ص١٠.

(المعلومات)، زانیارییەکان (المعارف)، دانایی (الحکمة). بەشێوەیەك داتاکان بریتین لە چەند راستییەکی پچڕپچڕ، کە بەتەنها هیچ مانایەکی دیاریکراو ناگەیێنن، بەڵام کاتێك ئەم راستییە پچڕپچڕانە کۆدەکرێنەوە و رێکدەخرێن، دەبنە زانراو.

ئەوکاتەی زانراوەکان دەتوانن کاریگەری لەسەر هەڵوێست، هەڵسوکەت، بۆچوون و دەربڕینی ئاخاوتن دابنێن، ئەوا دەبێتە زانیاری و مەعریفە. بەمجۆرە بۆمان روونددەبێتەوە زانیاری و زانراوەکان نابنە مەعریفە، مەگەر لە یەکێك لە بوارەکاندا بەگەڕ بخرێن. واتە چۆن ناتوانین بەبێ بەگەڕخستن سوود لە وزەی کارەبا ببینین، بەهەمانشێوە ناتوانین بە تەنها زانیارییەکان بە مەعریفە هەژمار بکەین، تاوەکو بۆ ئامانجێکی دیاریکراو بەگەڕنەخرێن[1].

بە پشتبەستن بە بۆچوون و پێناسە ئاماژەپێدراوەکان لەسەرەوە، دەکرێت لە چوارچێوەی توێژینەوەکە چەمکی مەعریفە بەمشێوەیە پێناسە بکەین. مەعریفە: بریتییە لە کارلێکردن لەنێوان زانیاری، ئاراستەکان، یاساکان، بەها و شێوازەکانی کارکردن، پاڵپشت بە تێکڕای ئەزموونی مرۆڤایەتی، لەم رێگەیەوە مرۆڤ وەکو تاك، یان تاقم و دەستە، دەتوانێت کێشەکان چارەسەر بکات و بڕیارەکان یەکلایی بکاتەوە.

کەواتە تێکڕای ئەو زانیاریانەی مرۆڤ بە رێگا جۆراوجۆرەکان بەدەستی هێناون، لەکاتی مامەڵەکردن لەگەڵ پرسە جۆراوجۆرەکان یارمەتیدەر دەبن

---

[1] المعرفة، مفهومها –خصائصها– أنواعها، ماجد محمد أبو شرحة، بەرواری سەردان کردن: ٢٠١٦/١٠/٣، بۆ درێژەی بابەتەکە بروانە ئەم بەستەرەی خوارەوە،:

http://www.slideshare.net/mjdabusharha/ss-٥٣٤٢٤٢٦٥.

بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان و گەیشتن بە ترۆپکی بڕیاردانن، ئەو زانیاریانـە پێیان دەگوترێت مەعریفە.

مەعریفە بەرەهایی خـاوەن چـەندین تایبەتمەندییـە، لەوانـە: مرۆڤانەیـە، واتە تایبەتە بـە مـرۆڤ، بـەو مانایـەی گیانلەبـەرانی تـر هـەڵگرى هـیچ جـۆرە مەعریفەیەکی هاوچەشنی مەعریفەی مرۆڤایەتی نین.

مەعریفـە کەڵەکـەبووە (تەراکومییـە)، واتـە مەعریفـەی مـرۆڤ ڕێـژەیی و کەڵەکە بووە، ئەوەی نەوەکانی پێش ئێمە پێیگەیشتوون هەر مـاوە و لـەنێو نەچووە، نەوەی ئێستا دەتوانێت سـوودی لێوەربگرێـت و زیاتریـشی بکـات. مەعریفە تۆمار دەکرێت، هەروەك چۆن لەدایك دەبێت و گەشە دەکات.

یەکێکی تر لە تایبەتمەندییەکانی مەعریفە ئەوەیە، گونجاوە بۆ فێربوون، بـە بـەکارهێنان زیـاد دەکـات نـەوەك کەمبێتـەوە و لەنێوبـچێت. کەواتـە، گـرنگترین تایبەتمەندییـەکانی مەعریفـە ئەمانـەن، مرۆییـە، کەڵەکـەبووە، شایستەی تۆمارکردنە، گونجاوە بۆ فێربوون و بە بەکارهێنان زیاد دەکات.

لە دواخاڵی ئەم بڕگەیە، بەپێویستی دەزانین ئاماژە بۆ ئەوە بکـەین، لـە زمانی ئینگلیزیدا وشەی*Knowledge* لە بەرامبـەر المعرفـە بـە کاردێـت، هـەروەها *Epistemology* وەك چـەمکێکی هـزری و مـەعریفی لـە بـری "نظرية المعرفة"، یان "النظام المعرفي" زمانی عەرەبی بەکاردێت.

قوتابخانەی ئیسلامیەتی مەعریفە چەمکی*Knowledge* لـە بەرامبـەر المعرفە بەکاردێنێت، بۆیە دەوترێت *Islamization of Knowledge* واتە "إسلامية المعرفة" یان "أسلمة المعرفة".

- **بڕگەی سێیەم (التكامل المعرفي) وەك زاراوە.**

ناوەڕۆك و پێكهاتەی پڕۆژەی تەكامول لە بابەتە جیاجیاكان بەگشتی و، لە بابەتە هـزری و مەعریفییـەكان بەتایبـەتی، ریـشەیەكی دوور و درێـژی لـە مێژوودا هەیە. ئەگەرچی بەكارهێنانی تەكامول وەك پڕۆژەیەكی هزری رەنگە بەشـێوەیەكی رێـژەیی نـوێ بێـت. بەكارهێنانیـشی لەلایـەن بیرمەنـدانی پەیمانگەی جیهانی هزری ئیسلامی بەگشتی و رابەرانی پڕۆژەی ئیـسلامیەتی مەعریفە بەتایبەتی نوێترە.

ئەم چەمكە (التكامل المعرفي) هەندێ توێژەر، نووسەر و بیرمەند بە مانای زانیارینامەیی (مەوسوعی) بەكاری دەهێنن.

بە واتایەكی تر، كاتێك ئەم چەمكە بەكاردێت، كە باس لـە كەسـایەتییەك دەكرێـت، شـارەزابێت لـە چـەند زانـستێكی جۆراوجـۆر، ئەگەرچـی بـا ئـەو شارەزایەش تەنها بریتبێت لە شارەزایەكی رووكەشی و دوور لـە پـسپۆڕیەتی ورد.

لە دیارترین نموونەی بەكارهێنانی تەكامول بەم مانایە، بەكارهێنانیـەتی بۆ ئەو كەسانەی شارەزاییان لـە بـوارە جۆراوجۆرەكـان هەیـە، وەك: زمـان، وێــژە، فیقــه، زانــستەكانی قورئــان، زانــستەكانی فــەرموودە، مێــژوو، گەردووناسی، فەلەكناسی، فەلسەفە و بیركاری... هتد.

چەندین جاریش گوێبیست بووین ئەم چەمكە بۆ ئەو زانایانە بەكارهاتووە كە لە سەردەمی خۆیان، لە یەك كاتدا بریتیبوون لە راڤەكاری قورئان، زانای فیقهی ئیـسلامی، زانـستە ئیـسلامییەكان، زانـستی پزیـشكی، فەلەكناسـی و

بیرکاری.. هتد ، بۆنموونە پێشەوا محەممەدی کوڕی جەریری تەبەری، ئـیبن روشد و ئیبن سینا... هیتد.

ئاشـکرایە مەوسـوعیبوون یـەکێك بـووە لـە تایبەتمەندییـەکانی زانایـانی موسڵمان بەر لـە چـاخی تەقلیـد و چەقبەسـتوویی هـزر و فیقهـی ئیـسلامی. بابــەتی پــسپۆڕی و تایبەتمەنــدی تــەنها زانــستێك یــان لقێکــی زانــستێکی دیاریکراو و دیاردەیەکی سەردەمی و بەرهەمی دوای مۆدێرنەیە. بەهۆی ئـەم هەڵاوســانە زۆرەی هاتــە ســەر کــۆی زانــستە مرۆڤایەتییــەکان و زانــستە ئەزموونی و کردارییەکانی تری وەك کیمیا، فیزیا، پزیشکی و تەکنـەلۆژیا... هتد.

کار گەیشتووەتە ئەوەی دیاردەی پسپۆڕیەتی لە بەشـێکی بـچووکی لقـی زانــستێك ببێتــە مایــەی شــانازی. لــەبری هەوڵــدان بــۆ مەوســوعیبوون و شارەزابوون لـە چـەند زانـستێکی جۆراوجـۆر لەیـەك کاتـدا. سـەرەنجام کـار گەیشتە ئـەوەی لـە پـەنجاکانی سـەدەی رابـردوودا، بەشـێك لـە بیرمەنـدانی رۆژئاوایی بانگەشەی لەیەك نزیککردنەوەی زانستە مرۆڤایەتییەکان و زانستە سروشـــــتی و کردارییـــــەکان بکـــــەن، دوای دەرکـــــەوتنی کـــــەلێن و دوورکەوتنەوەیەکی زۆر لەنێوان شوێنکەوتوو و پسپۆڕانی ئەو زانستانە.

جاران بانگەشەی یەکانگیری و تەکامول دەکرا لەنێوان هزر و کار، دانایی و شەریعە، نەهێشتنی تێکگیران و دژەوانە لـەنێوان حـوکمی عـەقڵ و نـەقڵ، هــەبوونی پەیوەندییــەکی تۆکمــە لــەنێوان بەرهــەمی عــەقڵی تەندروســت و فەرموودەی دروست، کۆکردنەوەی تەریقەت و هەقیقـەت. دواتـر بانگەشـەی تـەکامول لـەنێوان بنـچینە و بنـەما، لەگـەڵ تیـۆری و دیـد و بۆچـوونەکان و

**توێژینەوە زانستییەکان لەلایەك، جێبەجێکردن و بەکارهێنانیان لەلایەکی تر هاتەئاراوە. بە واتایەکی تر، دروستکردنی پەیوەندی و هەماهەنگی فرەلایەنە لەنێوان زانست و تەکنەلۆژیا بە ئامانجی تەواوکاری و کاملّکردنی بوارەکانی کرداری و خستنەگەڕیان بۆ خزمەتی مرۆڤایەتی.**

**لە بواری زانستەکان، لە سەدەی بیستەمدا لەڕێگەی چەندین توێژینەوەی زانستی هەمەجۆر سەلمێندرا فیزیا پێویستییەکی زۆری بە بیرکاری هەیە، هەروەها بایلۆژی و زیندەوەرناسی بە زانستی کیمیا. دواتر سەلمێندرا هیچ زانستێك، بەتایبەت زانستە ئەزموونی و کردارییەکان ناتوانن جیا لە زانستەکانی تر پێشکەوتن تۆمار بکەن و بەشێوەیەکی هاوسەنگ و پوخت گەشە بکەن[1].**

**دوای بانگەشەی هێنانەکایەوەی تەکامول لەنێوان ئەم بابەت و زانستانەی رابردوو، کار گەیشتە بانگەشەکردن بۆ تەکامول لەنێوان زانست و ئایین[2]، لەپێناو رەتکردنەوەی بەریەککەوتن و هەبوونی دژایەتی و تێکگیران، لەنێوان ئەم دوو تێزە دەیان و سەدان توێژینەوە و نەدوە و سیمینار سازکران.**

---

[1] فتحي ملكاوي، منهجية التكامل المعرفي، ص٢٣–٢٤.

[2] طه عبدالرحمن، النقاشات الراهنة حول العلم والدين: كيف نفكر في الصلة بين العلم والدين، مجلة كلية الآداب، جامعة محمد الخامس–مغرب، العدد ٨، أيلول ٢٠٠٧. هەروەها، العلم والدين: تصادم أم تكامل؟ بابەتێکەلە پێگەی **DW** بەشی علوم وتكنولوجيا بلاّوکراوەتەوە، دیارترین ئەنجامی بابەتەکەبریتیەلە: ((الإيمان بدون علم رجعية، والعلم بدون إيمان عماء)) واتە: باوەڕ بەبێ زانست دواکەوتوویيە، زانستیش بەبێ باوەر کوێرەوەرییە. بەستەری راستەوخۆی بابەتەکە: /العلم–والدين–تصادم–أم–تكامل**http://www.dw.com/ar**.

بابـەتی بانگەشـەی تـەکامول هـەر بـەوەش نەوەسـتا، کـار گەیـشتە هاتنـەئاراوەی باسوخواسـی هەماهـەنگی و تـەکامول لـەنێوان پـەروەردە و فێرکردن و، خستنەبەرباس و بەگەڕخستنی ئەم تێزە بەتایبەت لـە ناوەنـد و پڕۆگرامەکانی خوێندن و پەروەردە و فێرکردن.

لەکۆتاییـدا هـەوڵی یـەکانگیرکردن لـەنێوان کۆباسـەکانی تـەکامول بەردەوامبوو تاوەکو بابەتی پێویستبوونی هێنانەکایەوەی بەیەکبەستنەوە و تەکامولی نێوان کۆن و نوێ، ڕەسەن و سەردەم بەگشتی، لـە تێکـڕای کایـە مەعریفی و هزرییـەکان گـەرموگوڕی بـەخۆوە ببینێـت و ببێتـە باسوخواسـی گەرمی ناوەندە ئەکادیمی و زانستییەکان.

ئەوەی تائێستا لەبارەی ئەو چەمکە باسکراوە، تەنها بریتیبوو لـە واتـای تـەکامولی مـەعریفی بەگشتی و بـەڕەهایی، بگـرە لـەدەرەوەی قوتابخانـەی ئیسلامیەتی مەعریفە و پڕۆژەکەی.

تەکامول لە دیدی رابەر و بیرمەندانی قوتابخانەی ئیـسلامیەتی مەعریفـە، "بریتییـە لـە ئاوێتـەکردنی سەرچـاوەکانی مەعریفـەت بەیـەکتر لەلایـەك، ئاوێتـەکردنی ئامرازەکـانی مەعریفـە لەلایـەکی تـر، ئینجـا بـەدیهێنانی ئاوێتەکردنی سەرچاوە و ئامرازەکانی مەعریفە بەیەکەوە".

ڕەنگە خوێنەر لەکاتی خوێندنەوەی ئەم پێناسەیەی دوایی تێنەگات، یان بە ناڕوونی و پشێوی لێی تێبگات، جیا لەوەی چەندین پرسیار لـە خەیاڵیـدا دەوروژێنێت، بۆنموونە: ئەو سەرچاوانەی مەعریفەت چین پێویستە تەکامول لەنێوانیان بەرهەم بێـت؟ ئـاخۆ دەبێـت ئامرازەکـان چـی بـن؟ چـۆن چـۆنی دەکرێت سەرچاوەکان بە جیا، ئینجا ئامرازەکان بە جیا، ئینجا هـەردووکیان

بەیەکەوە ئاوێتە بکرێن؟ پشت بە خودا ئەو پرسیارانە و دەیان پرسیاری تری لەو چەشنە، لە بەشەکانی داهاتوودا بە شیکاری و توێکاری ورد وەڵام دەدەینەوە.

سەرەتا لە بەشی داهاتوودا، تیشك دەخەینە سەر ناوەڕۆکی ئەم چەمکە لەژێر رۆشنایی پڕۆژەی ئیسلامیەتی مەعریفە و دیدە هزری و فەلسەفییەکەی، لای بیرمەند و رابەرانی قوتابخانەی ئیسلامیەتی مەعریفە.

# بەشی چوارەم
# تەکامولی مەعریفی
# لە گۆشەنیگای بیرمەندانی پەیمانگا

لەم بڕگەیەدا تیشکێك دەخەینە سەر پێکهاتە و ناوەڕۆکی تەکامولی مەعریفی لە گۆشەنیگای بیرمەند و رابەرانی پڕۆژەی ئیسلامیەتی مەعریفە (پەیمانگای جیهانی هزری ئیسلامی).

بیرمەند و رابەرانی پڕۆژەی ئیسلامیەتی مەعریفە، بانگەشەی ئەوە دەکەن بیرمەندە ئیسلامی و رۆژئاواییەکانی ئەم سەردەمە، تووشی قەیرانێکی هزری کەمەرشکێن بوونە، کە سەری بۆ پشێوی مەعریفی و دیدلێڵی کێشاوە. سەرەنجام دید و تێڕوانینە یەکانگیرە گشتگیرەکەیان "الرؤية التوحيدية الكلية" لێ ون بووە.

بیرمەندە ئیسلامییەکان بەهۆکاری نوێنەبوونەوە و دابڕان لە ئامرازە میتۆدییە سەردەمییەکان تووشی ئەم قەیرانە بوونە. لەلایەکی تر، بەهۆی براگەورەیی دید و تێڕوانینی مرۆڤانە و بەخواکردنی خودی مرۆڤ لەڕێگەی

بنبڕکردنـــی هەســـتی دینـــداری لـــە پێگـــە زانـــستی، ئـــەکادیمی، هـــزری و مەعریفییەکان لە ڕۆژئاوادا، بیرمەندە ڕۆژئاواییـەکانیش ڕووبـەڕووی قـەیرانی هزری کەمەرشکێن بوونەتەوە.

واتە بیرمەندە دیندارەکانی جیهانی ئیسلامی تووشی قەیران بوونەتـەوە، بەهۆی دابڕان لە پێشکەوتنە ماددییەکانی سەردەم و، ڕۆیشتن لەسەر ڕێچکە کۆنەکانی جاران لە بواری زانست و مەعریفەدا، کـە بریتییـە لـە سەرچـاوە و مەنهەجەکانی خوێندنی ئایینی لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا.

ئاشکرایە لە وڵاتە ئیسلامییەکان تـاوەکو ئێـستاش پـشت بـەو مەنهـەج و سەرچـاوانە دەبەسـترێت کـە چـەند سـەدەیەك بـەر لـە ئێـستا نووسـراون، لەکاتێکدا تێکـڕای کایـە زانـستی و مەعریفییـەکان لـەژێر کاریگـەری هـەردوو رەهەندی کات و پێشکەوتن گۆڕانی زۆریان بەسەردا هاتووە.

ئەمەش ڕەنگدانەوەی تەواوی لەسەر پرۆسەی زانست و مەعریفە هەبووە، بـــەهۆکاری ئـــەم درز و گرفتـــەی کەوتووەتـــە نێـــوان دیـــدە مەعریفییـــە لاساییکەرەوەکان و زەمینەی کرداری پێشکەوتوو.

بیرمەندەکانی ڕۆژئاواش بەهۆی پشتگوێخستی لایەنی ڕۆحانی و پچڕاندنی پەیوەنـدی لەگـەڵ پـەروەرێنی بـاڵا، تووشـی قـەیرانی هـزری و مـەعریفی بوونەتەوە[1].

تیۆریستەکانی قوتابخانەی ئیسلامیەتی مەعریفە پێیانوایـە، تێپـەڕکردنی ئـــەم قەیرانـــە بـــە هـــەردوو لقەکـــەی ئیـــسلامی و ڕۆژئـــاوایی، مەرجـــە بـــۆ

---

[1] أبوبكر محمد أحمد محمد إبراهيم، مفهوم التكامل المعرفي وعلاقته بإسلامية المعرفة، مجلة إسلامية المعرفة، العدد٤٣، ص١٣-١٤.

هێنانەپێشەوەی جێگرەوەیان کە بریتییە لە نوێکردنەوە و هێنانەپێشەوەی مەعریفەی ئیسلامی، لەچوارچێوەی پڕۆژەی ئیسلامیەتی مەعریفە بەگشتی و تەکامولی مەعریفی بەتایبەتی.

ئەنجامدانی کارێکی لەم چەشنە، واتە تێپەرکردنی قەیرانی هزری، نایەتە بەرهەم، بەبێ ئەنجامدانی دووبارە دارشتنەوەی بنەما مەنهەجییەکانی هەردوولا، ئەویش لەڕێگەی هێنانەپێشەوەی مەنهەجێکی تر، کە بنەما ئیسلامییەکان و چەمکە بنچینەیی و مەنهەجییەکانی تێدا پارێزراو بن.

بەهۆی ئەوەی خودی پێکهاتەی ئەم پڕۆژە هزری و مەعریفییە بریتییە لە تێپەڕکردنی ئەو قەیرانە لەڕێگەی مەنهەجێکی جێگرەوە، کە جێگەی هەردوو مەنهەجە ناتەواوەکەی رۆژهەلاتی ئیسلامی و رۆژئاوای دوور لە دین بگرێتەوە. بەشێك لە خەمخۆرانی هزری ئیسلامی هاوچەرخ وایدەبینن، جیاوازییەکی ئەوتۆ لەنێوان پێکهاتە و ناوەڕۆکی تەکامولی مەعریفی و ئیسلامیەتی مەعریفە نییە، بەڵکو هەردووکیان رووی یەك دراون.

ئەگەرچی بەشێکی تری بیرمەندان پێیانوایە ئەم دوو چەمکە خاڵی هاوبەشیان هەیە، بەڵام دوو شتی تەواو لەیەك جیان.

هەر لەنێوان رابەرانی پڕۆژەی ئیسلامیەتی مەعریفەش ئەم دابەشبوونە بەدیدەکرێت، بەشێکیان وایدەبینن هەردوو چەمکەکە هاوواتان و هیچ جیاوازییەکیان نییە، وەك عەبدولحەمید ئەبو سلێمان و کەمال حەسەن.

ئەگەرچی کەمال حەسەن پێیوایە، چەمکی ئیسلامیەتی مەعریفە لەلایەن پەیمانگا تا ١١ی سێپتەمبەر بەکارهاتووە، بەهۆی تەنگپێهەڵچنین و هێرش کردنە سەر پەیمانگا و رابەرەکانی، وەك بۆوچونێکی حەکیمانە، لە

دەروازەی سیاسەتی شەرعی، ناوی پڕۆژەکە لە ئیسلامیەتی مەعریفە بۆ تەکامولی مەعریفی گۆڕدراوە، بەمەبەستی کەمکردنەوەی قەبارەی تەنگپێهەڵچنین بەهۆی ئیسلامفۆبیای رۆژئاواییەکان، دوای رووداوەکانی ١١ی سێپتەمبەری ٢٠٠١ کە هێرش کرایە سەر دوو تاوەرە بەنێوبانگەکەی ئەمریکا.

نووسینەکانی ئەبو سلێمان بەگشتی و، بار و گوزەرانی پڕۆژەکە لە زانکۆی ئیسلامی جیهانی– مالیزیا بەتایبەتی (کە وەك زەمینەی جێبەجێکردنی پڕۆژەکە دەناسێنرێت) راستی ئەم بۆچوونە دەسەلمێنن. چونکە بەکارهێنانی چەمکی تەکامول لە زانکۆی ئیسلامی لە بەکارنەهێنانەوە نزیکترە تاوەکو بەکارهێنان. واتە هەست بە پڕۆژەیەکی لەم چەشنە ناکرێت لە زەمینەی مەعریفی ئەم زانکۆیەدا، ئەوەی هەیە هەر پڕۆژەی ئیسلامیەتی مەعریفەیە بەتایبەت لە هۆڵەکانی خوێندندا.

بەر لە بەراوردکردن و دیاریکردنی خاڵە جیاواز و هاوبەشەکانی ئەم دوو چەمکە، پێویستە لەسەر دوو خاڵ بووەستین، یەکەمیان: ئاوڕدانەوەیەك لە مێژووی ئیسلامیەتی مەعریفە و ئامانجە جەوهەرییەکانی. دووەمیان: هۆکارەکانی پێویستبوون بە تەکامولی مەعریفی، دواتر دەتوانین روونتر لەسەر بابەتی تەکامول بووەستین و لە ئیسلامیەتی مەعریفە جیای بکەینەوە، یان بیسەلمێنین هیچ جیاوازییەکیان نییە.

سەبارەت بە ریشەی مێژویی پڕۆژەی ئیسلامیەتی مەعریفە، ناکرێت باسی گەشەسەندن و تیۆریزەکردنی بکرێت، بەبێ باسکردنی رۆڵی بەرچاوی چوار رابەری ئەم قوتابخانەیە، کە بریتین لە (ئیسماعیل راجی فاروقی

فەڵەستینی، عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبو سلێمانی مەککی، سەید محەممەد نەقیب ئەلعەتتاس و تەها جابر ئەلعەلوانی). ئەم چوار بیرمەندە لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم رۆڵێکی یەکجار گەورەیان لە ناساندن و تیۆریزەکردنی پرۆژەکە هەبووە.

هەریەکە و لە روانگە و گۆشەیەکەوە توانیویەتی تا ئاستی پێگەیاندن و شۆڕشی مەعریفی لەم بوارەدا ئەسپی خۆیان تاوبدەن، هەندێکیان بە دارشتن و کاریگەری لایەنە تیۆرییەکەیەوە وەك عەتتاس و عەلوانی، هەندێکیشیان لە هەردوو لایەنی تیۆری و کردارییەوە، بەڵام زیاتر گرنگییان بە لایەنە کردارییەکەی داوە وەك فاروقی و ئەبو سلێمان، بەتایبەت ئەبو سلێمان کە نزیکەی ١٠ ساڵ سەرۆکی زانکۆی ئیسلامی جیهانیی مالیزیا بووە، لەکاتێکدا خودی ئەم زانکۆیە بۆ جێبەجێکردنی تێزە تیۆرییە مەعریفی و زانستییەکانی ئەم پرۆژەیە بیناکراوە.

مشتومڕێکی زۆر لەئارادایە، سەبارەت بە خاوەنداریەتی پرۆژەکە، هەندێ لە توێژەران بانگەشەی ئەوە دەکەن عەتتاس خاوەنی راستەقینەی پرۆژەکەیە، دواتر فاروقی لە حەفتاکانی سەدەی رابردوودا گرنگی پێداوە، تاوەکو کار گەیشتووەتە ئەوەی  فاروقی وەك خاوەنی راستەقینەی پرۆژەکە بناسرێت.

بەشێکی تر لە توێژەران وای بۆدەچن فاروقی هەر لە سەرەتای پەنجاکانی سەدەی رابردووەوە سەرقاڵی گەڵاڵەکردنی پرۆژەکە بووە، واتە هەر لە بنەڕەتدا ئەو خاوەنی پرۆژەکەیە. سەبارەت بە بۆچوونی توێژەر لە

هەمبەر ئـەم پرسـە، دوای لێکۆڵینـەوە و بەدواداچـوون، بۆمـان روونبـووەوە هیچیان لەم دوو بۆچوونەوەی سەرەوە سەد لە سەد واقیعی نین.

راستە عەتتاس یەکـەم کەسـە پـەرتووکی سـەربەخۆی لەسـەر نـاوەڕۆکی پڕۆژەکە لە کۆتایی شەستەکانی سەدەی رابردوودا نووسیوە، هەروەك چۆن راستە بەشێك لە تێزی دکتۆراکەی فاروقی تایبەت بووە بە کێشە هزرییەکان لـە پـەنجاکانی سـەدەی رابـردوودا، بـەڵام ئەمانـە هیـچیان بەڵگـە نـین بـۆ خاوەنداریەتیکردنی پڕۆژەکە.

ئەوەی گەنگەشە هەڵناگرێت، بریتییە لەوەی خودی پڕۆژەکە لـە رۆژئـاوا لەسەر دەستی خەمخۆران بنەڕەت و بەردی بناغـەی دانـراوە، کارەکـەش بـە تاکە کەسێك نەکراوە، بـەڵکو بـە هـەوڵ و کـاری رێکخراوەکـانی ئـەکادیمی و خوێنــدکارە موســڵمانە نیــشتەجێبووەکانی رۆژئــاوا دەســتی پێکــردووە، ســەرەنجام پڕۆژەکــە لــە ناوەڕاســتی حــەفتاکان لەڕێگــەی چــەند نــەدوە و کۆنفراسـێك راگەیێنـدراوە، گرنگترینیـان کـۆنگرەی مەککەیـە کـە لـە سـاڵی ١٩٧٧ لە مەککە بەستراوە.

کەواتـە خـودی پڕۆژەکـە بـە کـاری بەکۆمـەڵ دەسـتی پێکـردووە، بۆیـە واقیعی نییە تاقە کەسێك (عەتتاس بێت یان فاروقی گرنگ نییـە) بکرێـت بـە خاوەنی. ئەگەرچی ئەم کارەکتەرانەی سەرەوە رۆڵـی بەرچـاوتر و زۆرتریـان بۆ پێگەیاندنی پڕۆژەکە بینیوە.

ئەوەی لـە یەکلاییکردنـەوەی خـاوەنی راسـتەقینەی پڕۆژەکـە گـرنگترە، بریتییە لە تێـزە هـزری و مەعریفییـەکان، کـە ئـەم پڕۆژەیـە خاوەنـدارێتیان

دەکات و لەڕێگەیانەوە هەوڵی دووبارە هەستانەوەی ژیارستانی ئیسلامی دەدات، لە لاپەڕەکانی داهاتوو زیاتر لە سەریان دەوەستین.

ئەوەی لە رابردوودا باسکرا، بریتیبوو لە دیدە گشتییەکەی رابەرانی پەیمانگا سەبارەت بە چەمك و پێکهاتەی تەکامولی مەعریفی. لە بڕگەکانی داهاتوودا، بە دیاریکراوی شیکاری بۆچوونی دیارترین بیرمەندەکانی پەیمانگا سەبارەت بەم پرسە دەخەینەڕوو.

- **بڕگەی یەکەم: تەکامول لە دیدی ئەبو سلێماندا**

سەبارەت بە روونکردنەوەی چەمکی تەکامولی مەعریفی، سەرەتا پێویستە لەسەر دیدی رابەری بە ئەزموونی قوتابخانەی ئیسلامیەتی مەعریفە بووەستین، کە وەك رابەری کرداری و جێبەجێکاری پڕۆژەکە، ١٠ ساڵ راستەوخۆ و نزیکەی بیست ساڵ بەدواداچوون و چاودێریکردن، بەشداری لە جێبەجێکردنی تەکامولی مەعریفی کردووە. هەر لەپێناو هێنانەدی ئەم ئامانجە لە سەرەتای نەوەتەکانی سەدەی رابردوودا، کارەکتەری سەرەکی بەردی بناغەی کۆلێژی (معارف الوحي والعلوم الإنسانية)ی لە زانکۆی ئیسلامی جیهانی– مالیزیا بووە.

دواتر بۆ پەرەپێدانی لایەنی وێناندن –تیۆری–، بڕیاری دامەزراندنی گۆڤارێکی هزری تایبەت بە پڕۆژەی ئیسلامیەتی مەعریفە و تەکامولی مەعریفی داوە، گۆڤارەکە لەم کۆلێژە و ساڵی دوو ژمارە، واتە شەش مانگ جارێك دەردەچێت، یەکەم ژمارەی لە ساڵی ١٩٩٧ زایینی بڵاوکراوەتەوە.

ئەم بیرمەندە ماندوونەناس و کارا و کارامەیە، پرۆفیسۆر (عەبدولحەمید ئەحمەد، ناسراو بە ئەبو سولەیمان)ە دامەزرێنەری کۆلێژی (**معارف الوحي والعلوم الإنسانية**) لە ساڵی ١٩٩٠زایینی، هەروەها لەنێوان ساڵەکانی ١٩٨٩-١٩٩٨ زایینی، سەرۆکی زانکۆی ئیسلامی جیهانی-مالیزیا بووە.

ئەبو سلێمان پێیوایە، زانکۆی ئیسلامیی مالیزیا ئەزموونێکی نوێی ئەکادیمی و زانستی و مەعریفییە، سیمبوولی ئەو زانکۆیەش، کە لە زانکۆ ئیسلامییەکانی دیکەی جیهانیی ئیسلامی جیای دەکاتەوە، بریتییە لە کۆلێژی (معارف الوحي والعلوم الإنسانية)، چونکە خودی ناوی کۆلێژەکە ئاماژەیەکی روونە بۆ ئەستێرەیەکی درەوشاوەی ئەزموونێکی نوێ.

ئەم ئەزموونە نوێیەش خۆی لە یەکبوونی مەعریفەی ئیسلامی دەبینێتەوە، بەتایبەت لە هەردوو سەرچاوەکانی خودایی و مرۆیی.

لەکاتێکدا ئێمە خاوەنی مەعاریفی سرووش (وەحی) و زانستی مرۆیین، ناکرێت لە هەقیقەتی رێنماییە خوداییەکان بگەین، بەبێ تێگەیشتن و ئاشنابوون بە سروشت و تەبیعەتی مرۆڤەکان، لەپاڵ ئاشنابوون بە رووداو و راستییە مرۆیی و گەردوونییەکان، هەروەك چۆن ناتوانین جێدەستمان لە رێنماییکردنی ژیانی مرۆڤ، رامکردنی بوونەوەر و گەردوون و سوودلێوەرگرتنی بنەخشێنین، بەبێ مەشخەڵی بەهاکانی شەریعەت و، ئامانج و رێسا و بنەما گشتییەکانی، کە لەلایەن بەدیهێنەری دانا و کاربەجێ بۆمان رەوانەکراون[1].

---

[1] لە چاوپێکەوتنێکدا ئەبو سلێمان وا دەلێت، کە توێژەر أبوبكر محمد أحمد إبراهيم لە تێزی دکتۆراکەی لە بەرواری ١٨/ ٣/٢٠٠٣ لە گەڵی ئەنجامداوە، بروانە: أبوبكر محمد أحمد إبراهيم، التكامل المعرفي

ئەم چەند دێڕەی رابردوو تەنیا گرنگی هێنانەکایەی یەکانگیری لەنێوان زانستەکانی وەحی و زانستە مرۆڤایەتییەکان روون ناکاتەوە، هەروەك تەنیا بریتیش نییە لە روونکردنەوەی پەیوەندی و نزیکایەتی نێوان ئەم دوو بوارە زانستی و مەعریفییە، بەڵکو ئاماژەیەکی روونە سەبارەت بە پێویستی هێنانەکایەی یەکانگیری لەنێوان هەردوو زانستەکە، بنەما لەسەر پلانێکی کرداری داڕێژراو لەسەر ئامانج و مەبەست و خاڵی دەستپێك، کە پێویستە گەلی موسڵمانان لەوێوە بەرەو ئاڵنگاری و ئاسۆکان هەنگاو بنێن.

بۆیە ئەبو سلێمان بەپێویستی دەزانێت لایەنی ئەکادیمی زانکۆ لەسەر باشترین بۆچوونی ئەکادیمی بنیات بنرێت، پایە گرنگەکانی زانکۆ لەسەر بناغەی فەلسەفەی زانستی دابڕێژرێن، لەگەڵ هەریەکە لە دیدگا گشتییەکەی ئیسلامی و مەنهەجیەتی زانستی و ئەزموونی، لەپاڵ ئامرازەکانی داهێنان. هێنانەدی مەنهەجێکی تۆکمەی لەمشێوەیەش تەکامولی مەعریفەی ئیسلامی بەرهەم دەهێنێت. بەواتایەکی تر، بە دروستکردنی هەماهەنگییەکی تۆکمە لەنێوان (الوحي، والعقل، والطبائع، والوقائع) واتە: (سرووش، ئاوەز، سروشتی مرۆڤ و رووداوەکان) تەکامولی مەعریفی لەدایك دەبێت.

لەکۆتاییدا دیدگای ئیسلامی دێتەوە گۆڕەپانی زانست، کە پەل بۆ هەڵاوێردکردنی هزر و کولتوور دەهاوێژێ، لەپاڵ راستکردنەوەی پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن، دواتر بەرهەمەکەی لە بەدیهاتنی تەکامولی مەعریفی و میتۆدی خۆی دەبینێتەوە، ئەمیش سەردەکێشێت بۆ یەکانگیری لەنێوان

---

وتطبيقاته في المناهج الجامعية، المعهد العالمي للفكر الإسلامي-هرندن-فيرجينيا، ط١، ٢٠٠٧م، ص١٠٠-١٠٥.

تـــاك و كۆمـــەڵ، بـــە ئاراســـتەی پـــەروەردەكردن و دروســـتكردنی تـــاكێكی موسڵمانی تەندروستی پێگەیشتووی تێگەیشتوو[1].

لە هەمان سەرچاوەدا، بە دیاریكراوی ئەبو سلێمان قسە لەسەر ڕەهەنـدە كردارییەكانی تەكامولی مەعریفی دەكات. ئەو پێیوایە، پێكهاتەی تـەكامولی مـەعریفی لـەڕووی ئەكادیمییـەوە خـۆی لـە توێژینـەوە دەبینێتـەوە، ئـەو توێژینەوانەی لێكۆڵینەوە و توێكاری لە بـوارە جیاجیاكـان دەكەنـە ئامـانج، بەمەبەستی خزمەتكردنی وەحی خودایی و پەیامەكانی.

یەكێك لـە ئامانجـە سـەرەكییەكانی تـەكامولی مـەعریفی لـە دیـدی ئـەبو سلێماندا، بریتییە لە كۆمەككردنی تێكڕای پـسپۆڕان لـە بـوارە جیاجیاكـان، لەڕێگەی ئاشناكردنی پسپۆڕ و توێژەران بە مەبەست، مەفهوم، بنەما، بەها، دید، كۆت و بەندە گشتییەكان بۆ هـەر زانـست و بوارێـك، بـۆ بەرهـەمهێنانی بەرهەمێكی زانستی ڕێنوێنیكار و بیناكراو لەسەر ژیارستانییەكی تەندروست.

لە چاوپێكەوتنێكدا كە خوێندكارێكی خوێندنی باڵا لـە زانكـۆی ئیـسلامی لەگەڵی ئەنجامداوە، ئەبو سلێمان بۆچوونی خۆی سەبارەت بـە ئیـسلامیەتی مەعریفە و تەكامولی مەعریفی دەخاتەڕوو، لەو چاوپێكەوتنەدا ئامـاژە بـەوە دەكات، هەردوو پرۆژەكە، واتە ئیسلامیەتی مەعریفە و تەكامولی مەعریفی، لەسەر چەند پایەیـەك دادەمـەزرێن، پایـەكانیش بـریتین لـە بـەردی بناغـەی خەونی هاتنەبەرهەمی ئەم پرۆژە مەعریفی و زانـستییە، لـە خـوارەوەدا ئـەم پایانە ڕووندەكەینەوە.

---

[1] أبوبكر محمد أحمد محمد إبراهيم، مفهوم التكامل المعرفي وعلاقته بإسلامية المعرفة، مجلة إسلامية المعرفة، العدد٤٣، ص٣٧.

- **پایەکانی پڕۆژەی پەیمانگا لە دیدی ئەبو سلێماندا**

بە بۆچوونی ئەبو سلێمان، پڕۆژەی ئیسلامیەتی مەعریفە و تەکامولی مەعریفی لەسەر سێ پایە دادەمەزرێن، کە ئەمانەی خوارەوەن:

**یەکەم: کارلێکردنی ئیجابی لەگەڵ واقیع**، لەڕێگەی خۆدوورگرتن لە هزرێکی رووتی تیۆری فەلسەفی، پشت نەبەستن بە تەنیا پێشکەشکردنی چەند دید و بۆچۆونێك، یان پلان و بەرنامەیەکی پێشتر داڕێژراو، کە لەگەڵ بنەما گشتییە هزرییەکان یەکناگرێتەوە. لە دیدی ئەبو سلێمان، پێویستە ئەم دوو پڕۆژە هزرییە یەکسان بن بەیەك و، بنەما سەرەکییەکانی وەحی لەسەر توانا هزرییەکان، توێکاری ورد و لێکۆڵینەوەی چڕ لە سروشتی خۆرسکی شتەکان، شیکاری رووداوەکان، پاڵپشت بە بنەما عەقڵییەکان و رێسا گەردوونییەکان دابمەزرێن.

**دووەم: گرنگیدان بە چەمك و بەها ئیسلامییەکان.** ئیسلامیەتی مەعریفە یان تەکامولی مەعریفی، بریتییە لە کردارێکی ئەوتۆ کە گرنگی تەواو بە چەمکە ئیسلامییەکان دەدات، هەروەك گرنگی بە بەها و مەعریفەی ئیسلامی دەدات، بەجیددی کار بۆ بەردەوامبوون لەسەر بیرکردنەوەی نوێ دەکات بە ئامانجی نوێبوونەوە و لەدایکبوونی هزر و مەعریفەی ئیسلامی سەردەم.

**سێیەم: پەروەردەی دەروون و ئازادکردنی عەقڵ.** ئیسلامیەت و تەکامولی مەعریفی کردارێکی مەعریفی رووت و وشك نییە، بەڵکو پرۆسەیەکی نەفسی و پەروەردەییە کار بۆ گەشەپێدانی پاڵنەر، پەروەردەی ناخی ئینسان، ئازادکردنی عەقڵی تاکی موسڵمان لە بەڵای خورافیات و وەهم و تێکگیران دەکات.

لەبری ئەوە هەمان چەتری زانست و مەعریفە و بڕوابەخۆبوون و ڕۆحی دەستپێشخەری بریتی بن لە چەتری داپۆشەری عەقڵ، هەموو ئەمانەش وەك دەرچە و دەروازەیەك بۆ چاکسازی و چاکەخوازی، لەپاڵ وردی و دڵسۆزی و داهێنان[1]. بەواتایەکی تر، دەکرێت بۆچوونی ئەبو سلێمان لەم پەڕەگرافەدا کورت بکرێتەوە، هەریەکە لە: خوێندنەوەی واقیع، توێکاری سروشت، شیکاری ڕووداو و پاڵنەرەکان، ڕوونکردنەوەی چەمکە ئیسلامییەکان، گرنگیدان بە بەها گەردوونی و ئیسلامییەکان، گرنگیدان بە هەردوو لایەنی دەروونی و پەروەردەیی، پاڵفتەکردن و کاراکردنی ناخ و ویژدان، کاراکردنی عەقڵ، هەموویان بەیەکەوە بریتی دەبن لە پووختەی چەمکی تەکامولی مەعریفی.

پایەکانی ئەنجامدانی ئەم ئەرکە قورسە لە دیدی ئەودا، بریتین لە بنەما و ڕێسا گشتییەکانی عەقڵ و گەردوون و وەحی (مبادئ العقل، سنن الكون، مقتضى هداية الوحي). واتە هەرکاتێك گرنگی تەواو بە هەرسێ لایەنی عەقڵ، گەردوون و وەحی درا، تەکامول بەرهەم دێت. بەپێچەوانەوە لەکاتی پشتگوێخستنی یەکێك لەم سێ پایە سەرەکییە، نەوەك هەر تەکامول بەرهەم نایەت، بەڵکو تێکڕای پرۆسەکە لاسەنگ و ناهاوسەنگ دەبێت، سەرەنجام ئامانجەکانیشی ناپێکێت.

بەمەش ئەبو سلێمان چەکوشێکی گەورە بە تەوقەسەری قووچەکی مەعریفەی ڕۆژئاوایی دەکێشێت، چونکە کاتێکی دوور و درێژە، ڕۆژئاوا

---

[1] أبوبكر، التكامل المعرفي وتطبيقاته، سەرچاوەی پێشوو، ص١٠١.

دەستی وەحی لە پێگە ئەکادیمییەکان بڕیوە، بەشێوەیەك بیرمەندانی رۆژئاوایی وەحی بە سەرچاوەی مەعریفەش نازانن، نەوەك زانست.

بەڵام بیرمەندانی پەیمانگا بەگشتی وەك لە رابردوودا ئاماژەمان پێدا، وەحی بە یەکێك لە دوو پایە سەرەکییەکەی زانست و مەعریفە هەژمار دەکەن و، ناکرێت پشتگوێ بخرێن، یان بێ بایەخانە سەیر بکرێن. بیرمەندانی پەیمانگا و ئەبو سلێمان بەتەنیا نین لەم دید و تێگەیشتنانە، محەممەد سەعید رەمەزان ئەلبوتی لە پەرتووکی "أزمة المعرفة وعلاجها في حياتنا الفكرية المعاصرة" بەڕوونی جەخت لەسەر ئەم خاڵانەی سەرەوە دەکاتەوە، لەگەڵ هەبوونی چەند جیاوازییەکی کەم.

خاڵی سەرەکی جیاوازی نێوان بۆچوونی ئەبو سلێمان و بوتی، لە ناوهێنانی پرۆژەی چاکسازی هزری خۆی دەبینێتەوە. بوتی خۆی لە بەکارهێنانی چەمکی (أسلمة المعرفة) دەبوێرێت، بەڵکو لەبری ئەم چەمکە، چەمکی (أسلمة النفس) بەکاردەهێنێت. بوتی پێیوایە، بابەتی پاڵفتەکردنی دەروون (تزكية النفس) خاڵی سەرەکییە بۆ تێپەڕاندنی قەیرانی هزری، لەکاتێکدا بیرمەندانی پەیمانگای جیهانی هزری ئیسلامی سەبارەت بە هەمان پرس، بەرەنگاربوونەوەی هەریەکە لە دووفاقیەی خوێندن، هەڵمەتی بە رۆژئاواییکردن، مەنهەجیەتی تەقلیدی، بە خاڵی سەرەکی دەبینن.

ئەم بۆچوونەی بوتی بەواتای رەتکردنەوە و بەرەنگاربوونەوەی پرۆژەی ئیسلامیەتی مەعریفە نایەت، بەڵکو ئەو پێیوایە ئیسلام خاوەنی بیروباوەڕ و سیستەمێکی تۆکمەیە و، دەتوانێت کێشە هزرییەکانی سەردەم چارەسەر بکات، کلیلی ئەم چارەسەرەش بریتییە لە کاراکردنی ناخی مرۆڤ. ئەمیش

لەڕێگـەی پـەروەردە و ئامـادەکردنی ئـەم ناخـە بەشـێوەیەك کـە گوێرایـەڵی تەواوی بڕیارە عەقڵییەکان بێت، خودی ئەنجامدانی کارێکی لـەم چەشـنەش بریتییـە لـە دەسـتپێك و ئامادەکـاری سـەرەتایی بـۆ گـشت کـردار و پرۆسـە هزرییەکان لە دیدی بوتیدا[1].

خاڵی بەیەك گەیشتن لەنێون بۆچوونی ئەبو سلێمان و بوتی، بریتییـە لـە پێویستی هێنانەکایـەوەی تـەکامول لـەنێوان هـەردوو رەهەنـدی مـەعریفی و پـەروەردەکردنی نـاخ، هـەروەها گرنگـی پێـدانیان لـە رێگـا و شـێوازەکانی بیرکردنەوە.

هەر خودی گرنگیدان بەم دوو رەهەندە لە دیـدی ئـەم دوو بیرمەنـدە، بـە مانـای بەرهـەمهێنانی ئـەو مەعریفـە بـەئامانجگیراوەی پـڕۆژەی تـەکامولی مەعریفی نایەت، هەروەك بەتـەنیا شـارەزابوون لـە زانـستە ئەزموونییـەکانی سەردەم و پەروەردەی نـاخ بـەس نـین بـۆ پێکـانی ئامـانج، بـەڵکو ئـەم دوو رەهەندە دەستی توێژەر دەگرن بۆ رەتکردنەوە و ئینکـاریکردن لـە تێکـڕای ئەو کۆباس و تێزانـەی لەگـەڵ بنـەما عەقڵییـەکان و بـەها گەردوونییـەکان و رێسا گشتییەکانی ئیسلام ناگونجێن.

بنەمای رەخنەگرتن و خۆمەڵاسدان بەمەبەستی دەستنیشانکردنی رەخنە هزرییەکان، بریتی نییە لە بەرهەمهێنانی زانـست، بـەڵام رێگەخۆشـکەرن بـۆ پسپۆڕ و کەسە لێهاتووەکان بۆ بەدەسـتهێنانی مەعریفـە. بەشـێوەیەك هـەر کەس تێکڕایی مەرج و لێهاتوویـەکانی داهێنـانی تێـدا بەرجەسـتە بووبێـت،

---

[1] بروانە: البوطي، أزمة المعرفة وعلاجها في حياتنا الفكرية المعاصرة، ص٦٩.

دەتوانێــت بــە پاڵپــشتی ئــەم دوو ڕەهەنــدە، ڕەهەنــدی مــەعریفی و پەروەردەکردنی ناخ، داهێنـانی مـەعریفی و زانـستی دەسـتەبەر بکـات. ئـەم باســەش دەرگایــەکی ترمــان بــۆ دەکاتــەوە، دەرگــای گومــان. بنــەمای "گومانکردنی مەنهەجی" یەکێکی ترە لەو دەلاقانەی مرۆڤ بـەرەو بەرهـەم و داهێنان دەبات.

مەبەست لە گومانی مەنهەجی بریتییە لە هەژمارکردنی گومان وەك چەقی توێژینەوە، بەتایبـەت لـە پێگـە و ناوەنـدە زانـستی و ئەکادیمییـەکان. واتـە پێویستە کادیری ئەکادیمی، پسپۆڕی زانستی، بیرمەنـدی هـزری و مـەعریفی بەگومانەوە سەیری تێکڕای تێزەکان بکات، بەمەبەستی گەیشتن بە دڵنیـایی و یەقین هەرگیز لە لێکۆڵینەوە و توێژینەوە نەوەستێت.

بە کاراکردنی ڕۆحێکی لەم چەشنە، ئیدی مرۆڤ دەتوانێت کلیلی داهێنان و بەرەوپێشـچوون و هەسـتانەوەی ژیـاری بدۆزێتـەوە، چـونکە گومـانکردن کلیلـی گەڕانـە، گـەڕانیش سەرچـاوەی سـەرەکی ئاشـنابوون و گەیـشتنە بـە ڕاستییەکان.

دەرەنجـام بــەبێ گومــانکردن، پرۆســەی بەدواگــەڕان دەســتپێناکات، هــەزاران سـاڵیش مـرۆڤ لـە شـوێنێك دابنیـشێت، هـەنگاوێك بـەرەو پێـشەوە ناچێت، ئیدی دەکرێت بگوترێت: گومانکردن پاڵنەری سەرەکییە بۆ جووڵەی مرۆڤ بەگشتی، تاوەکو ڕۆحی گومانکردن نەکرێتە ڕێبـاز و ژێرخـان، ناکرێـت چەقبەسـتن و بەسـتەڵەکی دواکـەوتن بـشکێندرێت. ئــەو دواکەوتنــەی وەك دێوەزمە یەخەی جیهانیی ئیسلامی گرتووە و، لە ژیارستانی و پێشەنگایەتی

جیهـانی دووری خـستووەتەوە[1]. ئـەبو سـلێمان خـاوەنی کۆمـەڵێك کـار و توێژینەوەی دیکەیە لە بـواری هـزری و مەعریفیـدا، کـەم تـا زۆر لـە تێکـڕای کارەکانیدا خۆی لە قەرەی ئەو بابەتانە داوە. بەتایبەتی ئـەو توێژینەوانـەی باسی قەیرانی عەقڵی موسـڵمان و، قەیرانـەکانی تایبـەت بـە ویست و نـاخی مرۆڤ دەکەن و ئەو پرسانەی تێدا شەنوکەو کردوون.

دوای چەندین توێژینەوەی هزری و مـەعریفی، گرنگترینیـان (أزمـة العقـل المسلم)، لە دوتوێی کتێبێکی تردا، دید و بۆچوونی خۆی زیاتر سەبارەت بـە بابـەتی تـەکامولی مـەعریفی روونکردووەتـەوە، ئـەمیش پـەرتووکی (الرؤیـة الكونیة الحضاریة القرآنیة).

ئەبو سلێمان لە چەندین شوێنی ئـەم پەرتووکـەدا، تیـشك دەخاتـە سـەر هەردوو رەهەندی یەکتاپەرستانە و تەواوکاریانە "البعد التوحیدي والتكاملي"[2] بـۆ گـەردوون و بوونـەوەر و مامەڵـەکردن لەگـەڵ قـەیران و کێـشە سەردەمییەکان.

ئەو پێیوایە، دیدگای گەردوونی "الرؤیة الكونیة"[3] بریتییە لە دیدگایـەکی فرەلایەنـەی زانـستی و رێـسایی، دیـدێکی ئیجابیانـە، دیـدێك هـەڵقوڵاوی خەمخۆری، خۆشەویستی، خێر، چاکەخوازی، رامکردن و ئاوەدانکردنەوەیە، کـە نوێنەرایـەتی بنـچینەی کـاراکردنی هێـز و پاڵنـەرەکانی نـاخی مرۆڤـی

---

[1] مجلة إسلامیة المعرفة ع٤٣، ص٤٠.

[2] عبدالحمید أبو سلیمان، الرؤیة الكونیة الحضاریة القرآنیة، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، ط١، ٢٠٠٩م، ص١٠٠.

[3] عبدالحمید أبو سلیمان، الرؤیة الكونیة الحضاریة القرآنیة، ص١٥٥.

موسڵمانە، لەڕێیەوە ئاوەدانکردنەوەی زەوی و بیناکردنی ژیارستانییەکی تەندروستانە بەرهەم دێت.

ئەم دیدگایە لە پێکهاتە و چوارچێوەدا لەگەڵ دیدی قورئان، بنەماکانی خۆشەویستی، هێزی ویژدان، هێزی عەقڵ و مەعریفە هاوتەریبە. لەگەڵ هێزی چاکەخوازی، هێزی کارایی ناخی مرۆڤ، هێزی بیری دروست و باوەڕی راستگۆیانەش هاوسەنگە. کاراکردنی دیدێکی فرەڕەهەندی لەم چەشنە، بۆ ئەوەیە مرۆڤی موسڵمان بە کاراکردنی سەرجەم ئەم هێزانە بتوانێت بەرجەستەکردنی تێکڕای ئامانجەکانی پرۆژەی تەکامولی مەعریفی لە زەمینەی کرداری بچەسپێنێت.

هەروەها پەیوەندییەکی تۆکمە و تەواوکاریانە لەنێوان تێکڕای ئەم هێزانە دروست بکات، دوای بە دیهاتنی ژیارستانیەتێکی دروست و پتەو، بە کاراکردنی لایەنی رۆحی و کاراکردنی هێزی چاکەکاری و چاکەخوازی، ئەو ئەمانەتە خوداییە جێبەجێ بکات، کە خراوەتە سەر شانی مرۆڤ و، بەشێکی گرنگی ئەم ئەمانەتە بریتییە لە ئاوەدانکردنەوەی زەوی.

ئەو پێیوایە، ئەم دیدە قورئانییە بریتی بووە لە خانەی سەرەکی دروستکاری ئەوەی هاوەڵانی پەیامهێن (دروودی خوای لەسەر)، بۆیە دەرەنجام هاوەڵان توانییان هەموو ئەم شتانە بەدەستبێن کە بەدەستیان هێنان، وەك: دەستکەوتی ژیاری، نوێکردنەوەی ژیارستانی مرۆیی، پەرەدان بە عەقڵ و ئاوەزی مەنهەجی و ئەخلاقی، تاوەکو دەگاتە ئاسۆ فراوانەکانی زانستی و ژیاری.

سـەرەنجامی بەرهـەمی هـاوەڵان، لـەژێر چـەتری مەعریفـەی قورئـانی سـەردەمێکی نـوێ دەسـتی پێکـرد، لـە مامەڵـەکردن لەگـەڵ ڕێـسا گەردوونییـەکان، بـۆ ڕامکـردن و داهێنـانی هەمـەجۆری مـاددی، هـەروەها کاراکردن و پابەندبوون بە بەها و ئامانجە ڕۆحی و ڕەوشتییەکان، لـە بـوارە جیاجیاکـان بەگـشتی و، مامەڵـەکردن لەگـەڵ بەرهـەم و ژیارسـتانیەتی مرۆڤایەتی بەتایبەتی. لەدەرەوەی کارکردن بە میتۆدی تەکامولی مـەعریفی بەم مەفهوم و پێکهاتەیە، تێکۆشانی پچڕ پـچڕ و هەڕەمـەکی و، نائاشـنا بـە خۆرسکی سیستەمی ژیارستانی ئیسلامی، لەپاڵ یاساکانی کارلێکردنی نێوان ژینگە و ژیارستانی، هیچ بەهایەکیان نابێت.

ئـەبو سـلێمان گەیـشتووەتە ئـەو بـاوەڕەی، ئـەم بێئاگـایی و نەفامییـە زانـستییە لـە گـرنگترین هۆکارەکـانی نەگەیـشتنە ئـەنجامی هـەوڵی چاکسازخوازەکان بـووە، لـە هەسـتاندنەوەی بـاری کـەوتووی کۆمەڵگـەی ئیسلامی، سەرەڕای چەندین هەوڵی جۆراوجۆر بەدرێژایی چەندین سەدە، کە تاوەکو ئێستاش بەبێ بەرهەمی بەردەوامن.

دیدگایـەکی لـەم چەشـنە، هـەڵقوڵاوی بنـەمای تەوحیـد و یەکتاپەرسـتی قورئانە، لەکۆتاییدا لە تاقانەیی زاتی پەروەرێن خۆی دەبینێتەوە. هەر ئـەم دیدگایـەش بریتییـە لـە بەرهـەمهێنانی ئاوێتـەبوون و یـەکانگیری لـەنێوان گەردوون و مرۆڤ و ژیان، ئەم یەکانگیرییەش لە کرۆکدا پڕاوپڕە لـە فرەیـی و

فرەڕەنگــی. ئــەم فرەڕەنگییــە بەشــێوەیەك رایەڵــە و پەیوەنــدی نێــوان ژانەرەكانی چنراوە، هاوشێوەی یەكبوونێكی تۆكمە خۆی نمایش دەكات [1].

- **بڕگەی دووەم: تەكامول لە دیدی ئەلتیجانی عبدولقادر**

لــە درێــژەی خــستنەڕووی نــاوەڕۆكی پــڕۆژەی تــەكامولی مــەعریفی، ئەلتیجانی عبدولقادر بـۆ چارەسـەركردنی قەیرانـەكانی پـەروەردە، دووبـارە گرنگیـدان بـە رەهەنـدەكانی وەحـی لـە ناوەنـدە زانـستییەكان بەپێویـست دەزانێت، دوای ئەو كاتە دوور و درێژەی دوورخراوەتەوە، پێویستە جارێكی تر پێگە گرنگەكەی خۆی لە ناوەندە زانستی و ئەكادیمییـەكان پێبدرێتـەوە. بەمــەش دووبـارە پێداچـوونەوە بـە مەنهـەجی زانـستی و مـەعریفی رۆژئـاوا بەپێویست دەزانێت، چونكە ئەم مەنهەجـەی ئێـستای رۆژئـاوا، لـەدەرەوەی چوارچێوەی وەحی و گرنگیدان بە رەهەند و پەیامەكانی وەحی، بیناكراوە.

بۆیــە دووبــارە كــاراكردنی وەحــی و هــەژماركردنی بــە سەرچــاوەیەكی سەرەكی زانست و مەعریفە، وا دەخوازێت دووبارە ئەو مەنهەجـە رۆژئاواییـە دابڕێژرێتەوە، بەشێوەیەك لەگەڵ رێسا ئاسمانییەكان تێكنەگیرێت. بۆیە ئەم بیرمەندە پێیوایە، پرۆسـەی تـەكامولی مـەعریفی تەنانـەت لـە چوارچـێوەی زانـستە ئەزموونییــەكان (پراكتیكییــەكان) پێویـستی بـە كۆمـەڵێك رێكـاری ئامادەســازی پێــشوەختە هەیــە، پێویــستە ئــەم رێكارانــەش بــە ئامــانجی شیكاركردنی نموونە مەعریفییەكەیان و هەڵوەشاندنەوەیان پەیڕەو بكرێن.

---

[1] عبدالحميد أبو سليمان، الرؤية الكونية الحضارية القرانية، ص١٨٧.

جیاوازی نییە ئەم نموونانە بریتی بن لە پێکهاتەی نموونەی کەلەپوورە ئیسلامییەکان، یان نموونەی عەلمانی سەردەم. ئەم شیکار و هەڵوەشاندنەوەیەش بۆ ئاشنابوون و ناسکردنی چەمکە بنچینەییە سەرەکییەکانە، لەپاڵ گریمانە شاراوەکانی ناخی ئەم چەمکانە. بەمشێوەیە کاتێك کرداری هەڵوەشاندنەوە کۆتاییهات، ئینجا سەرلەنوێ پرۆسەی دووبارە بیناکردنەوە و ڕێکخستن دەستپێدەکاتەوە.

پووختەی بیرۆکەی تیجانی لە دووبارە بیناکردنەوە خۆی دەبینێتەوە، چونکە ئەو پێیوایە خودی کرداری دووبارە بیناکردنەوەی زانست و چەمك و مەفاهیمەکان لەسەر بناغەیەکی تەندروست، پرۆسەی تەکامولی مەعریفی بەرهەم دێنێت. هەر بۆیە ئەو وا بیردەکاتەوە، هەرگیز تەکامول بەرهەم نایەت، بەر لە بەرهەمهاتنی رەخنگرتنی هەڵوەشێنەر، ناشکرێت رەخنەی لەم چەشنە بگیرێت، بەبێ هەبوونی میتۆد و کۆمەڵێك چەمکی جیاواز. بەمەش تیجانی پێیوایە، هەردوو پرۆژەی ئیسلامیەتی مەعریفە و تەکامولی مەعریفی ئاماژە بۆ یەك مەفهوم و تێگەیشتن و ناوەڕۆك دەکەن [١].

سەبارەت بە میتۆدی رەخنەیی کە لە پەڕەگراف رابردوودا خرایەڕوو، بریتی نییە لە رەخنەی رووخێنەر و تەنها بۆ خاپورکردن و تێپەڕاندن بێت. بەپێچەوانەوە مەبەست لەم چەمکە بریتییە لە رەخنەیەکی جددی، کە لەپاڵیدا چارەسەر و ئامانجێکی بنیاتنەر بخرێتەڕوو. تیجانی عەبدولقادر لەم بۆچوونەدا تەنیا نییە، بەڵکو کۆمەڵێك بیرمەندی تریش هەمان بۆچوونیان

---

[1] التجاني عبدالقادر، المفهوم القرآني والمتغير السياسي، مجلة إسلامية المعرفة، العدد ١٠، ص٣.

هەیە، بۆنموونە بیرمەندی مالیزی (کەمال حەسەن) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، هەڵوەشاندنەوەی قەناعەت و بیروبۆچوون و، سەرلەنوێ بیناکردنەوەیان لەسەر چەمك و تێزەکانی ئیسلامیەتی مەعریفەی مرۆڤایەتی، بریتییە لە کرۆکی پڕۆژەی ئیسلامیەتی مەعریفە.[1].

بەواتایەکی تر، خانەی دەستپێکی گۆڕانکاری و بەرجەستەکردنی پڕۆژەی هزری ئیسلامیەتی مەعریفە و تەکامولی مەعریفی، بە هەڵوەشاندنەوەی خود (تفكيك الذات) دەستپێدەکات. کەواتە لە دیدی ئەویشدا تیۆری رەخنەگرتن بە ئامانجی رووخاندن و دووبارە بیناکردنەوە تاکە رێگەی گەیشتنە بە ئامانجەکانی ئیسلامیەتی مەعریفە و تەکامولی مەعریفی.

کەواتە: تەکامول لای تیجانی و کەمال حەسەن، بریتییە لە هەڵوەشاندنەوەی نموونە مەعریفییە نادروستەکان و دووبارە بیناکردنەوەیان بەشێوەیەکی تەندروستانە.

---

[1] لە دانیشتنێکدا لەگەڵ د.محمد کمال حسن، لەسەنتەری أسلمة المعرفة لە زانکۆی ئیسلامي جیهانی– مالیزیا، لهمانگی ٧ ی ساڵی ٢٠١٦، بەندە پرسیاری لێکرد سەبارەت بە جیاوازی نێوان (أسلمة المعرفة و التكامل المعرفي)، لە وەڵامدا ووتی: هەردووکیان دوو رووی یەك دراون، لەلایەن پەیمانگای جیهانی هزری ئیسلامی تا ساڵی ٢٠٠١ چەمکی إسلامية المعرفة یان أسلمة المعرفة بەکارهاتووە، دوايي روداوەکانی ١١ی سێبتەمبەر ٢٠٠١ و تەنگەڵچنینی هێزە ئەمنیەکان و هەڵکوتانە سەر بارەگای سەرەکی پەیمانگا لە هرندن–ڤێرجینیا، وەك حیکمەت و سیاسەی شەرعی پەیمانگا چەمکی التكامل المعرفی بەکاردەهێنێت، سەبارەت بە کرۆکی پرۆژەکە، وتی: کارکردن بۆ هەڵوەشاندنەوەی قەناعەت و بۆچوونە نائیسلامیەکانە و دووبارە بیناکردنەوەیانە لەسەر بنچینەیەکی ئیسلامی تۆکمە.

- **بڕگەی سێیەم: تەکامول لە دیدی لوئەی سافی**

لوئەی سافی کە بیرمەندێکی ترە، خاوەنی چەندین توێژینەوەیە لەسەر هەردوو پڕۆژەکە، ئیسلامیەتی مەعریفە و تەکامولی مەعریفی، ئەو پێیوایە، تەکامولی مەعریفی بریتییە لە یەکانگیرکردنی وەحی و ئەزموونی مرۆیی[1].

واتە، کاتێك زانستەکانی وەحی و ئەزموونی مرۆڤایەتی خۆیان لە زانستە ئەزموونییەکان بینیەوە و یەکانگیر بوون، ئەوکات تەکامولی مەعریفی بەرهەم هاتووە. ئەگەرچی هەر خۆی بەگومانەوە دەڕوانێتە کۆباسێکی لەم چەشنە، چونکە یەکسانکردنی ئەزموونی مرۆیی لەگەڵ وەحی خودایی ناتەندروستە.

وەحی، رەها و یەقینییە، بەپێچەوانەوە ئەزموونی مرۆیی سنووردار و گوماناوییە، بەم چەشنە جیاوازییەکی زۆر لەم نێوەندەدا بەدیدەکرێت. قورئان کە تاکە سەرچاوەی وەحی دەستکاری نەکراوە، لە شتە نەگۆڕەکان لەپاڵ بەها باڵاکان پێکهاتووە، هاوکات پڕە لە گێڕانەوەی چیرۆکی کۆمەڵگەکانی پێش ئیسلام، ئامانجی سەرەکیش لەم گێڕانەوە و باسکردنانە، بریتییە لە سوود و پەندوەرگرتن لە مێژووی گەلانی رابردوو[2].

---

[1] لؤي صافي: لەپێناسەی تەکامولی مەعریفی دەنوسێت: "إنه محاولة لتحقيق تكامل معرفي بين الوحي والخبرة البشرية"، لە چاوپەکەوتنێك کە خوێندکاری دکتۆرا أبوبكر محمد إبراهيم لە بەرواری ١٥/ ٥/ ٢٠٠٣ لەگەڵی ئەنجامداوە، بڕوانە: أبوبكر محمد، التكامل المعرفي وتطبيقاته في المناهج الجامعية، المصدر السابق، ص١٠٩.

[2] لؤي صافي، الوحي والعقل: بحث في إشكالية تعارض الوحي والنقل، مجلة إسلامية المعرفة، العدد ١١، ص٧١.

ئەگەر لە دیدی لوئەی سافی مەبەست لە ئـەزموونی مرۆیـی تـەنیا بـریتی بێت لەم چیرۆکانەی لە قورئان باسکراون، ئەوا گومانەکـەی سـافی لەجێگـەی خۆی نییە، چونکە خودی ئەم چیرۆکە قورئانیانەش هەر لەڕێگەی وەحییەوە بەئێمە گەیشتوون، ئیدی لەڕێگەی گەیشتنیان بە ئێمە، جیاوازییەك لەنێوان سەوابتی قورئان و بەها باڵاکان و چیرۆکە قورئانییەکان نامێنێتەوە.

ئەگەر مەبەست لە ئەزموونی مرۆیی بریتی بێت لـە مانـا فراوانەکـە، واتـە تێکڕای ئەو ئەزموونەی مرۆڤ بەدرێژایی ژیانی خۆی کەڵەکەی کـردووە، ئـەوا گومانەکەی سافی لە شوێنی خۆیەتی، چونکە کەلەپووری مرۆڤایەتی پـڕە لـە شتی باش و خراپ، راست و ناڕاست، بەشێوەیەك بەشـێکی ئـەم کەلـەپوورە شتی وای تێدا بەدیدەکرێت، لەگەڵ عەقڵ و ئاوەز ناگونجێت، هەروەك دوور و نزیکیش پەیوەندی بە زانستەوە نییە. ئەمە لەپاڵ هەزاران کـرداری قێـزەون کە لە بەها باڵاکان و رێسا گەردوونییەکان دوورن.

هەرچەندە بەلایەنی کەمەوە، ئەم گومانـەی سـافی ئاماژەیـەکی روونـە بـە ئاراستەی دەلاقەیەکی تر، کە بریتییە لە بابەتی چەمك و مەفهوم. بە دیوێکی تردا، وەستان لەسەر مەفهومەکان و، بەوردی مامەڵەکردن لەگەڵیان کاری لە پێشینەیە لە پڕۆژەی ئیسلامیەتی مەعریفە و پرۆسەی تـەکاملی مـەعریفی، چـونکە نـاڕوونی چـەمك و مـەفهوم، بـۆ دیـدلێڵی لـە گوزارشـتکردن و دیـد و بۆچـوون و تێـڕوانین سەردەکێـشێت. لـە دەروازەی چـەمك و مەفهومـەکان، تیشك دەخەینە سەر بۆچوون و پێشنیازەکانی فاروقی لە هەمبـەر پرسـێکی لەم چەشنە.

- **برگەی چوارەم: تەکامول لە دیدی فاروقیدا**

سەبارەت بە چەمك و مەفاهیمەکان، هەر لە پڕۆژەکەی فاروقی کە بریتییە لە هەنگاوی یەکەم بۆ ناساندن و تیۆریزەکردنی ئیسلامیەتی مەعریفە، بەگرنگییەوە باسی پارێزگاریکردن لە مەفهومەکانی کەلەپووری ئیسلامی دەکات[1].

لە هەمان شوێن، فاروقی باسی گرنگی خستنەڕووی ناوەڕۆکی چەمکەکانی تایبەت بە زانستە کۆمەڵایەتی و ئەزموونییەکان دەکات، لەپاڵ زانستە ئیسلامییەکان، بەپێویستیشی دەزانێت کولتووره ئیسلامییەکە رەچاو بکرێت، لەکاتی وەرگێڕان و داڕشتنەوەی چەمکە زانستی و مەعریفییەکان.

لە زەمینەی کرداری، ئەم پڕۆژەیەی فاروقی بەرجەستەکراوە، بۆ نموونە لەکاتی دامەزراندنی زانکۆی ئیسلامی، جیا لەوەی شێوازی تەلارسازی ئیسلامی رەچاوکراوە، تێکڕای باڵەخانەکانیش بە ناوە ئیسلامییەکان ناونراون. تەنانەت خودی بەشە ناوخۆییەکانی کەمپۆسی زانکۆی ئیسلامیش بەناوی سورەتەکانی قورئان ناونراون. ئەمەش دوا ترۆپکی گرنگیدانی پڕۆژەی ئیسلامیەتی مەعریفە و تەکامولی مەعریفی دەخاتەڕوو، سەبارەت بە پارێزگاریکردن لە کولتووری ئیسلامی و رەنگڕێژکردنی چەمك و مەفهوم و پڕۆژەکانیش بەشێوازێکی تەواو ئیسلامیانە.

---

[1] إسماعيل راجي الفاروقي، إسلامية المعرفة، المبادئ العامة–خطة العمل–الإنجازات، دار الهادي، ط١، ٢٠٠١م، ص١٣٥.

راستە فاروقی لە پەرتووکەکەیدا (إسلامية المعرفة) باسی تەکاملی مەعریفی نەکردووە، بەڵام کرۆك و ناوەرۆکی ئەم پرۆژەیەی لەژێر ناوی (التركيبة الخلاقة) ناوزەد کردووە. روونتر بڵێین، لەژێر درووشمی (وحدة المعرفة) وردتر لەسەر تێکڕای تێزە مەعریفییەکانی تەکاملی مەعریفی دەوەستێت. ئەو پرسە لەداهاتوودا زۆرتر روونده‌کەینەوە. هەروەها کۆباسەکانی تایبەت بە تەوحید لە نووسراوەکانی فاروقی، کە لەم پەرتووکەدا بەچڕی باسمان کردوون، زیاتر دیدی ئەو بۆ پرسی تەکامول شیدەکەنەوە.

- **بڕگەی پێنجەم: تەکامول لە دیدی ئیبراهیم زێندا**

پرۆفیسۆر (إبراهيم زين) لە زانکۆی ئیسلامی بە یەکێك لە چوار شۆڕەسوارەکەی ئیسلامیەتی مەعریفە ناسراوە[1] و، لە نەوەتەکانەوە تاوەکو ئێستا چەندین پۆستی کارگێڕی بەرزی لە زانکۆی ئیسلامیدا بەڕێوەبردوون، دواهەمینیان راگرایەتی کۆلێژی مەعاریف بوو، لە مانگی حەوتی ٢٠١٦ ـەش دەستی لەکار هەڵگرت.

ئیبراهیم زێن لەبارەی پرۆژەی تەکاملی مەعریفی نووسیویەتی: مەفهومی تەکاملی مەعریفی لەسەر شێوازی سیستەمی زانکۆی ئیسلامی لە

---

[1] ابراهيم زين، لە بنەچەدا سودانيە، يەكێك لە چوار شۆرە سوارەكەی ئيسلاميەتی مەعريفەيە، كە دەستێكی باڵايان هەبووە لە بەرجەستەكردنی ئەم پرۆژەيە لە زانكۆی ئيسلاميدا، ئەمانيش: "(إبراهيم محمد زين)ی سودانی، (محمد طاهر الميساوي) تونسی، (قطب سانو)ی كينی، (محمد بن نصر)ی تونسی".

مالیزیا گەشـەی پێـدراوە. خـودی پرۆسـەکە بریتییـە لـە لایـەنی کـرداری و جێبـەجێکردنی مـەفهومی ئیـسلامیەتی مەعریفـە لـە بـواری پـەروەردە و فێرکردن[1]. ئەم تەکامولەش لە دیدی ئەودا هەرگیز بەواتای کۆکردنەوەی دوو دژەوانە نایەت، کە ناکرێت بە پەراوێزخستنی یەکێکیان نەبێت کۆبکرێنـەوە. بەڵکو تەکامول واتە دەستگرتن بە دانایی و حیکمەت لە هەر کوێوە بێت، بێ گوێدانە سەرچاوەکەی.

زێن لە درێژەی روونکردنەوەی چەمکی تـەکامول ئامـاژە بـەوە دەکـات، تـــەکامولی مـــەعریفی بـــەواتای هێنـــان و وەرگێڕانـــی هەرەمـــەکی و ناتێگەیـشتووانەی کـاڵای خـەڵکی تـر نییـە، بـەڵکو بریتییـە لـە وەرگـرتنی بەرهەمی خـەڵکی تـر و تێگەیـشتن لێـی، تـا دەبێتـە بەشـێك لـە ژیارسـتانی ئیسلامی و ژێرخانی هزری ئیسلامی.

زێن جـەخت لەسـەر پێویـستی هەسـتانی زانایـان بـە دۆزینـەوەی لادان و ئینحیرافاتە مەعریفی و هزری و مەنهەجییەکان دەکاتـەوە، هـەر زانایـەك لـە بوار و پسپۆڕییەکەی خۆی، بەتایبەت ئـەو ئینحیرافـات و لادانانـەی بوونەتـە هۆی دوورکەوتنەوە لـە تەوحیـد و یەکتاپەرسـتی. هـەروەها پێویـستە تـاکی موسـڵمان بەگـشتی، وریـا و چـاوکراوە بێـت لـەکاتی بـەکارهێنانی ئـامراز و مەنهەجەکانی خەڵکی تردا، کە لەدەرەوەی چوارچێوەی ئایین داڕێژراون.

---

[1] لە چاوپێکەوتنێکدا کە أبوبکر محمد لەگەڵی ئەنجامداوە لەبەرواری ٢٠٠٢/١١/١٨م، بروانە: أبوبکر، التکامل المعرفي، المصدر السابق، ص١١٠.

- **بڕگەی شەشەم: تەکامول لەدیدی أبوبکر محەممەددا**

(ئەبوبەکر محەممەد ئەحمەد ئیبراهیم) لە سەرەتای هەزارەی نوێوە خوێندکاری خوێندنی باڵا بووە لە زانکۆی ئیسلامی و ساڵی ٢٠٠٤ دکتۆرای بەدەستهێناوە، ناونیشانی تێزی دکتۆراکەی بریتی بووە لە (التكامل المعرفي وتطبيقاته في المناهج الجامعية)، دواتر نامەی دکتۆراکەی لەلایەن پەیمانگای جیهانیی هزری ئیسلامی لە ساڵی ٢٠٠٧ لە دوتوێی کتێبێکدا چاپکرا.

توێژینەوەیەکی چڕوپڕ و پووختە لەسەر ئەم بابەتە، دەکرێت وەك یەکەم کاری ئەکادیمی تایبەت بە تەکامولی مەعریفی، بەو مەفهومەی ئێمە باسی دەکەین، هەژمار بکرێت. کۆمەڵێك بابەتی وردی لەبارەی ئەم پرسە شیکردوونەتەوە. لەم چەند دێڕەی خوارەوەدا پووختەیەك لەبارەی توێژینەوەکەی دەخەینەڕوو.

توێژینەوەکە جەخت لەسەر شیکارکردنی ناوەڕۆکی ئەم چەمکە مەعریفییە دەکاتەوە، دواتر لەڕێگەی گەڕانەوە بۆ سەرچاوە هزری و مەعریفییەکان و ئەنجامدانی چەند چاوپێکەوتنێك لەگەڵ بیرمەندانی پەیمانگای جیهانیی هزری ئیسلامی و بەڕێوەبەرانی زانکۆی ئیسلامی، نووسراوە. لە درێژەی توێژینەوەکەدا بەوردی پەیوەندی نێوان تەکامولی مەعریفی و چەمکە هزرییەکانی تر دیاریکراون، کە بیرمەندانی پەیمانگا بەکاریان دەهێنن، بەتایبەت چەمکی ئیسلامیەتی مەعریفە.

هەروەك چۆن توێکاری بۆ پرۆسەی بەرجەستەکردنی تەکامولی مەعریفی کردووە، لە هەردوو رووی چەندیەتی و چۆنیەتی لە کۆلێژی (معارف الوحي والعلوم الإنسانية)، ئەو کۆلێژەی لە بنچینەوە بۆ بەرجەستەکردنی تەکامولی

مەعریفی بنیاتنراوە. لە دیارترین دەرەنجامەکانی توێژینەوەکە، توێژەر گەیشتووەتە ئەو ئەنجامەی، تەکامولی مەعریفی پەیوەندییەکی زۆری بە ئیسلامیەتی مەعریفەوە هەیە.

ئەم بۆچوونە بەو مانایە نایەت هەردوو چەمکی تەکامولی مەعریفی و ئیسلامیەتی مەعریفە یەك شت بن، بەڵکو هەر توێژەر خۆی بەپێویستی دەزانێت ئەم دوو چەمکە تێکەڵ نەکرێن و لەیەك جیابکرێنەوە، سەرەڕای لەیەك نزیکی و هەبوونی کۆمەڵێك خاڵی هاوبەش لەنێوانیاندا. ئەگەرچی ئەو پێیوایە، ناکرێت ئەم دوو چەمکە لە دووری یەکتر توێکارییان بۆ بکرێت، بەڵکو پێویستە لەیەك کاتدا گرنگی بە هەردوو چەمکەکە بدرێت.

سەرەنجام بە ئاراستەی جیاکردنەوەی هەردوو چەمکەکە نووسیویەتی: "دوای گەنگەشەکردنی بۆچوونەکانی رابردوو، دەکرێت ئیسلامیەتی مەعریفە بە دید و بۆچوون هەژمار بکەین، ئەوکات تەکامولی مەعریفیش دەبێتە ئەو سەر و سیمایەی کرداری پەروەردە و فێرکردنی پێ دەناسرێتەوە، لەو ناوەندە ئەکادیمیانەی هەڵگری ئەم دیدو بۆچوونەن"[1].

بەواتایەکی تر، هەر ناوەندێکی ئەکادیمی و زانستی لەڕووی تیۆری، هزری و مەعریفییەوە خۆی بکاتە خاوەنی دیدگای ئیسلامیەتی مەعریفە، پێویستە لە حاڵەتی بەرجەستەکردنی پرۆژەکەدا، تەکامولی مەعریفی بەرجەستە بکات.

---

[1] إبراهيم، التكامل المعرفي وتطبيقاته، ص١٢١.

کەواتە ئیسلامیەتی مەعریفە بریتییـە لـە لایـەنی هـزری و مـەعریفی، کـە هەمیشە تیۆرییە، لایەنی تـەکامولی مـەعریفیش بـریتی دەبێـت لـە هـەنگاوە کردارییەکان. کەواتە دیدە مەعریفییەکە، ئیسلامیەتی مەعریفەیە و تەکامولی مەعریفیش بریتییە لـە دابەزانـدنی ئـەم دیـدە مەعریفییـە لـە تیۆرییـەوە بـۆ کرداری.

سەبارەت بە خودی (دیدگا مەعریفییە)کە، بە بۆچوونی توێژەر، بریتییـە لە بەرەنجامی هەوڵ و تێکۆشـانی رێکخـراو و خـاوەن بەرنامـە، ئامانجەکـەی بریتییە لە هێنانەپێشەوەی رێبـازێکی رەخنـەیی شـیکاری لێکـدراو، کـار بـۆ گەشەپێدانی دیدگایەکی تاقانە و یەکتاپەرستانە دەکات، کە تێکڕای زانـست و مەعریفەکان لەوەوە سەرچاوە بگرن.

ئەم دیدگا مەعریفییە بەم واتایە دێت، کە لەم رۆژگارەدا لەلایەن کۆمەڵێك دەزگا و ناوەندی کارا لە بواری هـزری ئیـسلامی گەشـەی پێـدەدرێت، وەکـو پڕۆژەیـــەکی گـــەورەی هـــزری دەردەکـــەوێت و کـــار بـــۆ زیندووکردنـــەوەی تێکۆشانی هزری دامەزراوەیی و قوتابخانـەیی دەکـات، هـەڵگری رۆحـی تـیم (فریق) ئاسایە و دیدگای تاکەکەسی تێپەڕاندووە، ئەو دیـدگا تاکەکەسـییەی ژینگەی هزری و زانستی و رۆشنگەری جیهانیی ئیسلامی پـێ دەناسـرێتەوە. ئەم بزووتنەوە هزرییە کارایە، پێویستە کـار لەسـەر تێکـڕای مەعریفەتـەکان بکات، کۆن بن یان نوێ، لەسەر دەستی موسڵمانان بیناکرابن یـان خـەڵکانی تر.

ئـەم دیـدە مەعریفییـە پـشت لـە لاسـاییکردنەوە و وەرگـرتنی تێکـڕای کولتـووری ئیـسلامی دەکـات. ئـەو لاسـاییکردنەوەیەی پـشتی لـە داهێنـان

کـــردووه لـــه تێکـــڕای ئاســـتەکان، لـــه دیـــدگای ئـــەم دیـــده مەعریفییـــه ڕەتدەکرێتەوە. هاوکات ئەم پڕۆژە هزری و مەعریفییه بەهیچ قوتابخانەیەکی هزری و جیهانبینی تر پابەند نابێت، مەگەر پشت بە توێکاری و توێژینەوەی ورد و پووخت ببەستێت. ئەم پڕۆژەیە بـاوەش بـۆ هـەر هـزر و مەعریفەیـەك دەکاتەوە، بەمەرجێك لە چوارچێوەی ڕێساکانی ئیسلام، بنـەما عەقڵییـەکان و ڕێسا گەردوونییەکان دەرنەچێت.

ئەم جیاکارییە لەنێوان هەردوو چەمکی ئیسلامیەتی مەعریفە و تەکامولی مـــەعریفی دەبێتـــە دیـــدێکی باڵادەســـت لـــە دامـــەزراوە پـــەروەردەیی و فێرکارییەکان. چونکە دەکرێت لەڕێگەیەوە مەنهەجی ئەم دامەزراوانە لەسەر فەلسەفەیەکی ئیـسلامی تۆکمـە بنووسـرێت، کـارێکی لـەم چەشـنەش بـۆ ڕێکخـستنی پرۆســەی فێرکـردن لـەژێر ڕۆشـنایی توێژینـەوە زانـستییەکانی تایبەت بە مەنهەج و فێرکردن زۆر پێویستە. ئەم جیاکارییەش ڕێگا لەبەردەم بەرجەستەبوونی هەقیقی ئەم دیدگا مەعریفییە (ئیسلامیەتی مەعریفە) خۆش دەکات. هاوکات تێگەیشتن لـە کرۆکـی ئیـسلامیەتی مەعریفـە وادەخوازێـت، زانیـاری ورد و قـــووڵ ســـەبارەت بـــە قوتابخانـــە هزرییـــەکان و فەلـــسەفەی سـەردەم، لـەپاڵ هۆشـیارییەکی قـووڵ و تۆکمـە لـەبارەی ئیـسلام فەراهـەم بکرێت، بەمەش هزری ئیسلامی بەشێوەیەك باڵا دەبێت، بتوانێت ڕووبەڕووی گۆڕانکارییـــەکان و پێکۆڵـــە ژیارســـتانییە نوێیـــەکان ببێتـــەوە. بـــەئامانجی هەڵمژینی تێکڕای ئـەو ئەزموونـەی مرۆڤایـەتی لـە مەیدانـە جۆراوجۆرەکـانی مەعریفـەدا پێیگەیـشتووە، دواتـر تێکهەڵکێـشان لەگـەڵ ژێرخـانی هزریـی ئیسلامی بکات لەسـەر شـێوازێك کـە بنـەما و تایبەتمەندییـەکانی ئـەم هـزرە

ئیسلامییە پارێزراو بن، ئەوانیش بریتین لە خاڵی جەوهەری و جیاکەرەوەی هزری ئیسلامی لە قوتابخانە هزرییەکانی تر.

پرۆسەیەکی لەم چەشنە بەئاسانی بەرهەم نایەت، مەگەر لەڕێگەی هەوڵێکی زانستی تۆکمە و ڕێکخراو نەبێت، کە لەلایەن دامەزراوەیەکی پەروەردەییەوە سەرپەرشتی بکرێت، دواتر بکرێتە بەرنامەیەکی کرداری دیاریکراوی خاوەن پلانێکی تۆکمە. دواجار دەبێتە پاشخانی هزریی زانای موسڵمان، لەڕێگەیەوە دەتوانرێت لە سەرجەم بوارە مەعریفی و ئەزموونییە جیاجیاکاندا مامەڵە لەگەڵ تێکڕای باس و خواسە سەردەمییەکان بکرێت.

سەرەنجام هێنانەپێشەوەی پڕۆژەیەکی مەعریفی و کرداری لەم چەشنە، توانادار دەبێت لەسەر هێنانەدەرەوەی مرۆڤی موسڵمان و گەلە موسڵمانەکان لە دواکەوتن و چەقبەستن. نەوەك هەر ئەوەندە، بەڵکو دەبێتە دەرچەیەکی دڵخۆشکەر بۆ ئەوەی موسڵمانان لەڕێگەیەوە هەم وەك تاك، هەمیش وەك کۆمەڵگە، بێنە پێشەوە و بەشدارێکی کارا بن لە ژیارستانی و ڕێنوێنیکار و ئاراستەکار بۆ ژیارستانی مرۆڤایەتی. کەواتە کرداری تەکامولی مەعریفی بەم واتایە، تەنها بریتی نییە لە کردارێکی مەعریفی، بەڵکو بریتییە لە پرۆسەیەکی نەفسی و پەروەردەیی، هەوڵی ئازادکردنی عەقڵ، ئازادکردنی ناخی موسڵمان، گەشەپێدانی پاڵنەرەکانی پێشکەوتن و، داهێنان و چاکسازی دەدات[1].

---

[1] بروانە: أبوبكر محمد إبراهيم، التكامل المعرفي وتطبيقاته في المناهج الجامعية، المصدر السابق، ص١٢٠–١٢١.

- **بڕگەی حەوتەم: تەکامول لە دیدی فەتحی مەلکاوی**

لەم بڕگەیەدا پووختەی پرسی تەکامولی مەعریفی لە دیدی (فەتحی حەسەن مەلکاوی) بیرمەندی گەورەی ئەردەنی دەخەینەڕوو. ئەو پێیوایە، تەکامولی مەعریفی لە دەروازەی تێڕوانینی ئیسلامیانە بۆ گەردوون بەرهەم دێت، لەڕێگەیەوە فەهم و تێگەیشتنی دروست بۆ گەردوون و ژیان و مرۆڤ گەڵاڵە دەبێت[1]. تێڕوانینی ئیسلامیانە، چەمکێکی فەلسەفییە و بەواتایی دیدگای گشتی بۆ جیهان، بە سەرجەم بەش، توخم، پێکهاتە و سیستەمەکان دێت. هەروەها سەیرکردنی شتەکان، لە چوارچێوە گشتییە فراوانەکەیدا، بریتییە لە بنچینە و چەتری لێڤەگەری باڵا (مەرجەعی باڵا) بۆ هزر و ئاکار لە چوارچێوەی سیستەمی بەها گشتییەکانی کۆمەڵگەدا.

لەلایەکی تر، تێڕوانینی ئیسلامیانە بریتییە لە وێناکردنی گشتی راستییەکانی گەردوون و ژیان و مرۆڤ، وەڵامدانەوەی سەرجەم پرسیارە سەرەکییەکانی تایبەت بە بوونگەرایی، مەعریفەسازی و بەها باڵاکانی پەیوەندیدار بەم راستیانە و دیاریکردنی رایەڵە و پەیوەندی نێوانیان.

مەلکاوی تەنیا باسی تەکامولی مەعریفی نەکردووە، بەڵکو رەهەندی مەنهەجیەتی تەکامول لە سەرجەم کایەکان دەخاتەڕوو، لەپاڵ گرنگیدان بە کاراکردنی بنەما و بەها باڵاکانی وەك: تەوحید، پاڵفتەکردنی دەروون و ئاوەدانکردنەوەی زەوی (التوحيد، التزكيه، العُمران).

---

[1] فتحي ملكاوي، منهجية التكامل المعرفي، المصدر السابق، ص٤٢.

مەلكاوی پێداگری لەسەر ئەوە دەكات، تەكامولی مەعریفی لەڕێگەی ئاوێتەبوونی سەرچاوەكانی دەستخستنی مەعریفە بەیەكتر لەلایەك، ئاوێتەبوونی ئامرازەكانی مەعریفە لەگەڵ یەك لەلایەكی تر، ئینجا ئاوێتەكردنی سەرچاوە و ئامرازەكان بەیەكتر، لەگەڵ هەماهەنگی فرەلایەنە لەنێوان سەرجەم سەرچاوە و ئامرازەكان بەرهەم دێت[1]. لە بەشەكانی داهاتوودا زیاتر ئەم پرۆسەیە بە شیكاری ورد ڕووندەكەینەوە.

دوای خستنەڕووی پێكهاتە و ناوەڕۆكی تەكامولی مەعریفی، مەلكاوی باسی پێداویستییەكانی جێبەجێكردنی تەكامولی مەعریفی دەكات. ئەو بەپێویستی دەزانێت لە پرۆسەی بەرجەستەكردنی تەكامولی مەعریفی سێ خاڵی سەرەكی ڕەچاوبكرێن:

**خاڵی یەكەم: ڕوونكردنەوەی دەلالەتی چەمكی تەكامول.**

ئەم چەمكە فرە دەلالەت و واتایە، لە كۆمەڵێك بواری جیاجیا بەكاردێت، لە هەر بوارێكیشدا مانای تایبەت دەبەخشێت.

زۆربەی كات دەلالەتی ئەم چەمكە بریتییە لە مەوسووعی بوون، واتە شارەزایی لە كۆمەڵێك بوار و زانستی جیاجیادا، لەبری پسپۆریەتی ورد تەنیا لەیەك بابەتدا. ئەم بەكارهێنانەش بۆ پێویستیی زانستەكان بەیەكتر دەگەڕێتەوە، سەبارەت بە گەشەكردن و پێشكەوتنی زانست و، بەرجەستەكردن و بەگەڕخستنی بنەما زانستییەكان لەڕووی كردارییەوە.

---

[1] ملكاوي، منهجية التكامل المعرفي، ص٥٧.

لە دیدی مەلکاوی، دەلالەتی تەکامول لەسەر سێ پایە دەوەستێت، ئاوێتەکردنی سەرچاوەکان، ئاوێتەکردنی ئامرازەکان، دواتر ئاوێتەبوونی سەرچاوە و ئامرازەکان بەیەکتر، لەپاڵ تێکهەڵکێشکردنی خوێندنەوەی پەرتووکی بینراو و پەرتووکی خوێنراو (گەردوون و قورئان).

بەشێوەیەکی وردتر، دەکرێت بگوترێت دەلالەتی ئەم چەمکە لای مەلکاوی، وەك بەشێك لە ئیسلامیەتی مەعریفە و هەوڵی چاکسازیی هزریی هاوچەرخی ئیسلامی، ئەمەیە:

– دەستخستنی مەعریفەیەکی پێویست، سەبارەت بە بنەما و ئامانجەکانی ئیسلام.

– مەنهەجیەتێکی گونجاو بۆ بەگەڕخستنی ئەم بنەما و ئامانجە ئیسلامیانە.

– کاراکردنی ئەم مەنهەجیەتە بۆ تێگەیشتن لە زانستە هاوچەرخ و سەردەمییەکان و مامەڵەکردن لەگەڵیان.

–پێگەیاندنی کەسایەتییەکی ئیسلامی هاوچەرخ، بە پابەندی و کاراییەوە (التماسك والفاعلية) بناسرێتەوە.

–هەوڵی شیاندنی ئوممەتی ئیسلام بۆ بەشدارییەکی تۆکمەی جوان لە ژیارستانی مرۆڤایەتی و ڕێنوێنیکردن لەژێر هیدایەت و ڕێنماییەکانی سروشی خودایی[1].

---

[1] ملكاوي، منهجية التكامل المعرفي، ص٢٩١.

**خاڵی دووەم: مامەڵەکردن لەگەڵ ئامانج و ناوەڕۆکی زانستەکان**

لەبری بەتەنیا وەستان لەسەر مێژووی زانستەکان.

ناوەڕۆکی چەمکی تەکامول بەپێویستی دەزانێت، شێوازی ئێستای خوێندن و لێکۆڵینەوە لە زانستە شەرعییەکان تێبپەڕێندرێت، کە بریتییە لە شیکردنەوەی بیروباوەڕ و خوداپەرستییەکان بەشێوەیەکی مێژووییانە و سەپاندنی تێگەیشتن لە ئایین تەنیا لەژێر چەتری رابردوودا.

کاتێک ئەم بیروباوەڕە دروست بوو، پێویستە ئەم بارودۆخە تێبپەڕێندرێت و هەنگاو بەرەو پێشکەشکردنی ئیسلام بنرێت، وەك زانستێکی پەیوەندیدار بە رێنمایکردنی هۆش و هزری مرۆڤ و هاندانی بەرەو هەڵسان بە ئەرك و بەرپرسیارێتییەکانی لە ژیاندا، هەروەها هاندانی مرۆڤ بۆ نەخشاندنی جێپەنجەی لە زەمینەی کرداری و کارکردن بۆ داهێنان و کارابوون لە ژیارستانیەتدا[1].

**خاڵی سێیەم: تەکامول لە مەرجەکانی جێبەجێکردنی**

تەکامولی مەعریفی.

بەرجەستەکردن و جێبەجێکردنی تەکامولی مەعریفی پێویستی بە چوار مەرجی وابەستەی یەکتر هەیە[2]:

**یەکەم:** شارەزابوونی تێروتەسەل لە دید و تێڕوانی ئیسلام بۆ جیهان، بۆئەوەی ئەم دید و تێڕوانینە ببێتە چوارچێوەی تێگەیشتن لە هزر و

---

[1] ملکاوي، منهجية التكامل المعرفي، ص٢٩٢.

[2] هەمان سەرچاوە، ص٢٩٢–٢٩٣.

شیکارکردنیان. بەواتایەکی تر، تێگەیشتن لـە زانیـاری و زانـستە ئیـسلامییە پەیوەندیدارەکان بە بابەتی توێژینەوە، لەڕێگەی دەقە پیرۆزەکانی قورئان و فەرموودە، یان راڤەی پێشینان و سەلەف، بە لەبەرچاوگرتنی رەهەندی کات و شـوێن و بـار و گـوزەرانی راڤـەکان، هـەروەها دووبـارە پێداچـوونەوە و ئیجتیهـادکردن بـە راڤەکانـدا، لـەژێر رۆشـنایی نـوێترین زانـست و زانیـاری هاوچەرخ. دوای تێگەیشتنێکی لەم چەشنە، تێگەیشتنێکی نوێ بۆ ئامـانجی دەقــەکان و، کاراکردنیــان بــە رەچــاوکردنی رەهەنــدی کــات و، شــوێن و نوێگەرییەکانی زەمینەی کرداری و بارودۆخەکان پێویستە.

**دووەم:** تێگەیشتن لە زانست و زانیارییە **هاوچەرخەکانی** پەیوەندیـدار بـە بابەتی توێژینــەوە و شـارەزابوون لێیـان، تـاوەکو دوایـین ئاسـتی شـارەزایی مرۆڤــی **هاوچــەرخ**. ئەمــەش راســتی و تێگەیــشتن و بنــەما و تیۆرەکــان و، ژێرخـانی فەلـسەفی و پاشـخانی مێـژوویی و کۆمەڵایـەتی سـەرهەڵدانی ئـەم زانستانە دەگرێتەوە، **هاوکات** لەگـەڵ رۆڵبینیـی ئـەم ژێرخـان و پاشـخانە لـە داڕشتن و بەگەڕخستنی ئەم زانستانەدا.

**سێیەم:** پەرەپێدان بە دیدی شیکاریی رەخنەیی (الرؤية التحليلية النقدية) و، کاراکردنی بۆ جیاکردنەوەی بۆچوونە مەزهەبی و مەرجەعییـە هزرییـەکان لەیەکتر، لە **هەردوو** ئەزموونی زانستە ئیسلامییەکان و ئەزموونی مرۆیـی، لـە سەرجەم قوتابخانە و مەرجەعـەکان لـەژێر چـەتری دیـدێکی گشتگیر (نظـرة كلية) دواتر بڕیاردان لەسەر پێکهاتەکانیان.

کردارێکی لەم چەشنە بۆ دەستنیشانکردنی گرفت و کـەموکوڕیی زانـستە ئیـسلامییەکان و زانـستە ئەزموونییـەکان پێویـستە، دواتـر پێـشکەشکردنی

جێگرەوە و چارەسەری ریشەیی و، پلانی تۆکمە بۆ جێبەجێکردنیان، بە هاوکاری و بەشداری پێکردنی پسپۆڕانی دیکەی بوارە جیاجیاکان.

**چوارەم:** ئەگەر ئەم سێ مەرجەی رابڕدوو دەستەبەرکران، واتە کۆششی تێگەیشتن بەرهەم هاتووە و قۆناغی چوارەم بریتی دەبێت لە تێپەڕاندن. تێپەڕاندن بەواتای فەرامۆشکردن و جێهێشتن نا، بەڵکو بەواتایی تێپەڕین بە ئەزموونی رابردوو، ئەزموونی ئێستا، هەنگاونان بەرە و بنیاتنانی داهاتوویێکی نوێ و گەش، لەژێر رێنمایی و ئامانجەکانی وەحی، رێسا سروشتییەکانی گەردوون، دیاردە کۆمەڵایەتییەکان، تێزە دەروونی و ئەزموونی مرۆیی کەڵەکەبووی تایبەت بەم پرسانە.

بنیاتنانی داهاتوو، بەمانایی گەڕانەوە نایەت بۆ چاخەکانی رابردوو، یان دووبارەکردنەوەی فۆڕمێك لە فۆڕمەکانی ژیارستانیەتەکانی رابردوو، بەڵکو بریتییە لە هەنگاوێك بەرەو پێشەوە، کە تێیدا عەقڵی موسڵمان وێنەیەکی نوێی شارستانی پێشکەش بکات، کە هیچی کەمتر نەبێت لە چاخی یەکەمی ئیسلام. ئەمەش لەڕێگەی کاراکردنی هیدایەتی وەحی و گۆشکردنی مرۆڤی موسڵمان بەم هیدایەتە خوداییە، بە ئومێدی جووڵە و هەوڵ و تێکۆشانی بەردەوام، دەرەنجام بەرهەمەکەی بریتی بێت لە رۆشنبیرییەکی نوێ، ژیارستانیەتێکی نوێ و دەستکەوتێکی نوێی مرۆیی، کە پێشتر مرۆڤایەتی بەخۆیەوە نەیبینیوە.

بەبۆچوونی مەلکاوی، واقیعی مرۆڤایەتی هاوچەرخ لە پێویستترین باردایە بۆ هەڵێنانی هەنگاوێکی داهێنەرانەی لەم چەشنە، کە بەهۆیەوە دەکرێت دووبارە ژیارستانیەتی هاوچەرخ بنیات بنرێتەوە، دەستکەوتەکانی

بەگەڕبخرێن و وزەکانی ڕێنوێنی بکرێن، چونکە چیتر مرۆڤایەتی توانای بەرگەگرتنی کۆستەکانی ئەم ژیارستانیەتەی ئێستای نەماوە.

کاتێك جارێکیتر ئیسلام بە نامۆیی وەك جاری جاران سەرهەڵدەداتەوە، نامۆکانیش دەتوانن چەشنی نەوەی یەکەمی ئیسلام دەستکەوت و داهێنان پێشکەش بکەن، لەڕێگەی نوێکردنەوەی چەمکی دین و دینداری، هەستان بە ئەرکی جێنشینایەتی سەر زەوی و ئاوەدانکردنەوەی ماف و راستی و دادگەری و ئاشتی.

لە درێژەی کۆباسەکانی تری تایبەت بە پرسی تەکامول لە دیدی مەلکاوی، بەپێویستی دەزانین چەند دێڕێکی تر سەبارەت بە تایبەتمەندییە میتۆدییەکانی تەکاملی مەعریفی لە کرداری بیرکردنەوە بخەینەڕوو.

- **تایبەتمەندییە میتۆدییەکانی تەکامولی مەعریفی لە بیرکردنەوەدا[1].**

مەلکاوی دەنوسێت: مرۆڤ بوونەورێکی خاوەن بیرە، بیرکردنەوەش یەکێکە لە تایبەتمەندییە جیاکەرەوەکانی مرۆڤ، میتۆدی بیرکردنەوە بریتییە لە بنچینەی توێژینەوە و کاراکردنی کردار و ئاکاری تاك و کۆمەڵ. مەنهەجیەتی بیرکردنەوەش لە دیدگای ئیسلامیدا بە چەند تایبەتمەندییەك دەناسرێتەوە، کە ئاوێتە و وابەستەی یەکترن، دەکرێت لەم خاڵانەی خوارەوە کورت بکرێنەوە:

---

[1] ملكاوي، منهجية التكامل المعرفي، ص٢٩٤–٢٩٥.

١- بيركردنەوەيەكی مەقاصيديانە، بەواتای تێگەيشتن لە دەقەكان، لەژێر رۆشنايی حيكمەتی دابەزينيان و كەتوار (واقيع) و پەيوەندی نێوانيان.

٢- بيركردنەوەيەكی گشتگيرانە (التفكير الكلی).

٣- بيركردنەوەيەكی رێساييانە (التفكير السننی) بەواتای گرێدانی رووداني رووداوەكان، ئەنجامەكانيان و هۆكارەكان بەيەكتر.

٤- بيركردنەوەيەكی كرداری: سەيركردنی بابەتەكە و پەيوەندی بابەتەكە لەگەڵ واقيع، گەڕان بەدوای شوێنگرەوە و گريمانەكان، بە ئامانجی دۆزينەوەی چارەسەركردنی كێشەكان.

٥- بيركردنەوەيەكی ستراتيژيانە بۆ بنياتنانی داهاتوو و بەدواداچوون بۆ هەستانەوەی ژياری ئومەتی ئيسلامی، بەو مەرجەی ئەرێنی و گەشبينی تێدا پێشەنگ بێت.

مەلكاوی كۆمەڵێك بابەتی تری پەيوەنديداری بە تەكاموڵی وروژاندوون، بەتايبەت لە بواری مەنهەجيەتی تەكامولانە، بەڵام بەهۆی نەبوونی پەيوەندييەكی راستەوخۆ بە توێژينەوەكەوە، بەوەندە كۆتايی پێدێنين.

# بەشی پێنجەم

# تەکامولی مەعریفی لە کەلەپووری ئیسلامیدا

ئەگەر ئاوڕێك لە مێژوو بدەینەوە بەتایبەت لە کەلەپووری ئیسلامیدا، بەڕوونی بۆمان دەردەکەوێت بەر لە چاخی سەردەم، کۆمەڵێك زانای ناوداری موسڵمان باسیان لە پڕۆژەیەکی لەم چەشنە کردووە، لەخوارەوە زۆر بەکورتی باسی بۆچوونی دیارترین ناودارانی جیهانیی ئیسلامی لەهەمبەر ئەم پرسە دەکەین.

- **بڕگەی یەکەم: ئەبو حامیدی غەزالی**

ئەبو حامیدی غەزالی لە پەرتووکی (جواهر القرآن ودرره) و ناوەناوەش لە (احیاء علوم الدین)دا، ئاماژەی بە گرنگیدان بە بوارە جیاجیاکان کردووە و، بەڕوونیش باسی پێکهاتە و ناوەڕۆکی چەمکی (الوحدة البنائیة في المعرفة)ی کردووە کە ئێستا لە ناوەندە زانستییەکان بەم ناوە دەناسرێتەوە.

ئەو پێیوایە، ئەو ئایەتانەی باسی ئەستێرە، خۆر، مانگ، ئاسمان و بابەتە گەردوونییەکان دەکەن، مرۆڤ ناتوانێت بەبێ هەبوونی زانیاری ورد لە بواری زانستی فەلەك و گەردوونناسی، بەتەواوی لە راستییان تێبگات. تێگەیشتن لەو ئایەتانەش ئەستەمە کە باسی بابەتە پزیشکییەکانی هاوشێوەی دروستبوونی مرۆڤ دەکەن، بەبێ زانین و شارەزایی لە زانستی پزیشکی.

دەرەنجام غەزالی بەپێویستی دەزانێت مرۆڤی زانا لەپاڵ زانیاری تەواو لەبارەی زانستە شەرعییەکان، زانستە ئەزموونییەکانی تریش بزانێت. دەکرێت ئەمەش لە دیدی غەزالیدا بە ئاماژەیەکی روون بۆ پرۆژەیەکی لەم چەشنە هەژمار بکرێت. سەرەڕای ئەوەی غەزالی و زاناکانی دیکەی هاوشێوەی ئەو، بەکردەیی کاریان لەسەر پرۆژەی لەم جۆرە کردووە، چونکە ئەوان چەشنی مەوسوعە، لە یەك کاتدا شارەزاییان لە کۆمەڵێك بواری جیاجیادا هەبووە [1].

- **بڕگەی دووەم: ئیبن روشد**

هاوشێوەی غەزالی، (ئیبن روشد) بانگەشەی بۆ بابەتی تەکامولی مەعریفی کردووە، ئەگەرچی بەڕوونی هەست بە جیاوازی لە دیدی ئەم دوو بیرمەندەدا دەکرێت.

غەزالی بانگەشەی بۆ خاڵی هاوبەشی نێوان زانستەکان کردووە و بەپێویستی زانیوە لە بنچینەی مەعریفیدا زانستەکان یەکانگیر بکرێن، بەڵام ئیبن روشد زیاتر یەکانگیری لەنێوان زانستەکان بەپێویست زانیوە.

---

[1] بروانە: أبو حامد الغزالي، جواهر القرآن ودرره، بيروت: دار الجيل، ١٩٨٨م، ص٢٧.

بەبۆچـوونی ئـیبن روشـد، ئـەو ئایەتانـەی لـە قورئانـدا باسـی تێفکـرین و بیرکردنـەوە و پەنـدوەرگرتن دەکـەن، بـەڕوونی هـانی مـرۆڤ دەدەن لـە شـتە بەردەسـتە دروسـتکراوەکاندا وردببنـەوە، چـونکە هێنـدەی لـە دروسـتکراوەکان وردتـر ببینـەوە، باشـتر لێیـان تێدەگـەین، هەرچـەند لـە نـاوەڕۆکی دروستکراوەکانیش تێبگەین، زۆرتر و خێراتر بە ئافرێنەر و بەدیهێنەریان ئاشـنا دەبین[1].

بەمشێوەیە لای ئیبن روشـد، تـەنیا خوێندنـەوەی تێکستە ئاینییـەکان و ئایەتە قورئانییەکان بۆ ناسینی خودا بەس نین، بەڵکو شارەزابوون لە گشت بوارەکان بـۆ تێگەیـشتنی راسـتەقینە لـە قورئـان کـارێکی هـەرە پێویـستە، چونکە بەبێ ناسینی راستەقینەی بەدیهێنراو، مرۆڤ ناتوانێـت بەتـەواوی لـە خـودی بەدیهێنـەر ئاشـنا ببێـت. هەرچـەندە مـرۆڤ بـە پـەروەرێن و بەدیهێنەرەکەشی ئاشنابێت، زیاتر ملکەچ و گوێڕایەڵی دەبێت.

- **بڕگەی سێیەم: ئیبن تەیمیە**

لە سەردەمی بانگەشەی تێکگیرانی نێوان زانـستە ئایینییـەکان و زانـستە ئەزموونییەکان، ئیبن تەیمیـە تایبـەت بـە رەتکردنـەوەی تـێکگیران لـەنێوان بەرهەمی عەقڵ و نەقڵ، پەرتووکێکی قەبارەگـەورەی بـەناوی (درء تعـارض العقل والنقل) بۆ رەواندنەوەی گومان و تۆمەتـە بێبنـەماکان نووسـیوە. لـەم

---

[1] أبو الوليد، ابن رشد، فصل المقال في تقرير ما بين الحكمة والشريعة من الاتصال، تحقيق: محمد عابد الجابري، بيروت، مركز دراسات الوحدة العربية، ١٩٩٧م، ص٨٨.

پەرتووکەدا بەگشتی تێکڕای هێڵەکانی نێوان زانستە ئایینییەکان و زانستە ئەزموونییەکانی بەتایبەتی دیاریکردوون.

دوای توێکاری و شیکارییەکی دوور و درێژ بەو ئەنجامە گەیشتووە، ئەو زانستانەی بەرهەمی عەقڵن چ فەلسەفی بن یان سروشتی و گەردوونی، بەراورد بە دەقە گواستراوەکان، کە بریتین لە تێکستە ئایینییەکانی وەکو قورئان و فەرموودە... هتد، هیچ تێکگیرانێك لەئارادا نییە.

ئەو پێیوایە، سەرجەم ئەو زانستە ئەزموونیانە لەگەڵ تێکستە ئایینییە راست و دروستەکان دژیەك نین، بەڵکو مانای یەکتر بەهێزتر دەکەن و، هەرگیز ناتوانرێت تێکگیران لەنێوان بەرهەمێکی عەقڵی دروست لەگەڵ دەقێکی ئایینی دروست بدۆزرێتەوە، تەنانەت ئەگەری روودانی کارێکی لەم چەشنە بەئەستەم دەزانێت.

ئیبن تەیمیە لە درێژەی روونکردنەوەی ئەنجامی بەدواداچوونەکەی ئاماژەی بەوە داوە، بەدواداچوونی بۆ گشت ئەو بابەتانە کردووە کە خەڵك کێشەیان لەبارەیەوە هەیە. ئەو دەڵێت: "سەرجەم ئەو بابەتە ئەزموونیانەی لەگەڵ دەقە ئایینییە راستەکان تێکدەگیرێن، جگە لە گومانێکی بێبنەما شتێکی تر نین، کە عەقڵ دەتوانێت ناڕاستییان بسەلمێنێت، نەك بەتەنیا هەر ئەوەندە، بەڵکو عەقڵ دەتوانێت پێچەوانەکەیان بسەلمێنێت، کە بریتییە لە یەکانگیرییان لەگەڵ دەقە ئایینییەکان، نەوەك تێکگیران و دژەوانە"[1].

---

[1] ابن تيمية، درء تعارض العقل والنقل، تحقيق: محمد رشاد سالم، الرياض: جامعة الملك محمد بن سعود، ١٩٧٩م، ج١، ص١٤٧.

له لاپەڕەکانی رابردوودا ئاماژەمان بە گەشەکردنی ناوەڕۆکی تەکامولی مەعریفی کرد، کە لەسەر شێوەی چەند ناو و زاراوەیەکی دیکە نمایشکراون، وەك ئەوەی غەزالی بانگەشەی ناوەڕۆکی بابەتی (الوحدة البنائية في المعرفة)ی کردووە، دواتر ئیبن روشد هەماهەنگی نێوان زانستە ئاسمانی و زانستە ئەزموونییەکانی بەپێویست زانیوە.

دوای ئەوان ئیبن تەیمیە وزە و توانایەکی زۆری لە خستنەڕووی حەقیقەتی پەیوەندی نێوان ئەم دوو بوارە مەعریفییە خەرجکردووە، هاوکات لەژێر پەردەی نەهێشتنی تێکگیران لەنێوان بەرهەمی وەحی و بەرهەمی عەقڵ، دەرەنجامی هەوڵەکانی خستووەتەڕوو. دواتر ئەم هەوڵانە بەردەوام بوونە و تاوەکو ئێستاش بەردەوامن لە دۆزینەوەی رێگەچارەیەکی گونجاو بۆ تیۆریزەکردنی ئەو بابەتە لەڕووی هزرییەوە، پاشان بەرجەستەکردنی ئەم وێناندنە –تیۆری– لە ئەرزی واقیعدا.

- **بڕگەی چوارەم: سەعید نورسی**

لەم بڕگەیەدا بەپێویستی دەزانین ئاماژە بە پێشنیازەکەی بیرمەندی گەورە سەعید نورسی بکەین، کە تایبەتە بە پیادەکردنی پڕۆژەیەکی نزیك لە تەکامولی مەعریفی.

سەعید نورسی لە ساڵی ١٩٠٧ ی زایینی پێشنیازی بۆ (سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم) کردووە زانکۆیەکی هاوشێوەی (ئەزهەر) بەناوی قوتابخانەی (زەهرا) دابمەزرێنێت و، بەهەماهەنگی هەردوو بواری زانستە ئایینییەکان و زانستە ئەزموونییەکانی تێدا بخوێندرێن.

ئەو پێیوایە زانستە ئیسلامییەکان ڕووناکی دڵ و دەروون و ناخن، زانستە ئەزموونییەکانیش ڕۆشنایی عەقڵ و ئاوەزن، بە تێکەڵکردنی هەردوو بوارەکەش حەقیقەت درەوشاوەتر و باڵاتر دەبینرێت، حەقیقەتیش چەندە درەوشاوەتر و باڵاتر دەربکەوێت، تێکۆشانی فێرخواز بەرزتر و گەشەسەندووتر دەبێت[1]. بەپێچەوانەوە دابڕکردنی ئەم دوو بوارە زانستی و مەعریفییە دەمارگیری لە بواری زانستە ئیسلامییەکان و، فرتوفێڵ و گومانیش لە زانستە ئەزموونییەکان بەرهەمدێنێت[2].

بەمشێوەیە دەکرێت بگوترێت نورسی بەلایەنی کەمەوە ٧٠ ساڵ بەر لە بیرۆکەی ئیسلامیەتی مەعریفە و تەکامولی مەعریفی هەوڵی بەرجەستەکردنی پڕۆژەیەکی لەم چەشنەی داوە، تەنانەت لەڕووی حەقیقەت و ناوەڕۆکی پڕۆژەکەش زۆر لە ئامانجەکانی پەیمانگای جیهانی هزری ئیسلامی نزیکە.

بۆنموونە: نورسی جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، چۆن باڵندە ناتوانێت بە باڵێك بفڕێت، بەهەمانشێوەش فێرخواز ناتوانێت بە باڵێك پێبگات، ئینجا جیاوازی نییە باڵی زانستە ئیسلامییەکان بێت یان زانستە ئەزموونییەکان، بەڵکو پێویستە هەردوو زانستەکە کۆبکرێنەوە.

---

[1] دەقی قسەکەی نورسی بە عەرەبی: ((ضياء القلب هو العلوم الدينية ونور العقل هو العلوم الحديثة فبامتزاجهما تتجلى الحقيقة فتتربى همة الطالب وتعلو بكلا الجناحين وبافتراقهما يتولد التعصب في الأولى والحيل والشبهات في الثانية)) بڕوانە: https://www.goodreads.com/author/quotes/510021_.

[2] بۆ زیاتر بڕوانە: خالد الصمدي، الحكمة وفصل الخطاب في منهج التربية عند النورسي، مقال منشور في موقع "النور للدراسات الحضارية والفكرية"، تاريخ التصفح: ٢٠١٦/١٠/٢٤، الرابط المباشر: http://www.iikv.org/ar/nurmajalla/article.php?c=4&cid=2&id=280.

له رووێکی تردا پاراستنی شوناسی ئیسلامی له پرۆژەکەی ئەودا جێگـەی بایەخە، چونکە نورسی بەڕوونی باسـی لـەوە کـردووە، ئـەو زانکۆیـەی ئـەو پێـشنیازی کـردووە لـە رۆژهـەڵاتی ئـەنادۆڵ دابمـەزرێت، نـاوی مەدرەسـەی لێبندرێت، بۆئەوەی هەڵقوڵاوی کولتوور وکەلەپووری ئیسلامی بێت. ئەمەش لــە هــەردوو دیــوی تێکهەڵکێــشکردنی زانــستە ئیــسلامییەکان و زانــستە ئەزموونییەکان، لە گەڵ جەختکردنەوە لەسەر پاراستنی شوناسی ئیسلامی، ســەتا ســەت لەگــەڵ پرۆژەکــەی پــەیمانگای جیهــانی هــزری ئیــسلامی یەکدەگرێتەوە.

وەك لە رابردوودا روونمان کردەوە، پەیمانگا چـەمکی *(Integration)* لەبەرامبەر چەمکی تەکامول بەکاردێنێت، لەکاتێکدا یەکێك لە ماناکـانی ئـەم چەمکە ئینگلیزییە بریتییە لە (مزج، امتزاج). ئەگەر بەوردی سەرەنج بدەین، نورسی هـەمان وشـەی (امتـزاج) ی بـۆ پرۆسـەی یـەکانگیری نێـوان زانـستە ئیسلامییەکان و زانستە ئەزموونییەکان بەکارهێناوە[1].

ئەگەرچـی نورسـی چـەمکی تـەکامولی بـەکار نـەهێناوە، بـەڵام خـودی پرۆژەکە لە ئامانج و ناوەڕۆکەوە زۆر لە یەکترەوە نزیکن.

رەنگە کەسـانێك گومـان بکـەن بیرمەنـدانی پـەیمانگا ئـەم بیرۆکـەیان لـە نورسی وەرگرتبێت، چونکە نورسـی ٧٠ سـاڵ پـێش ئـەوان پرۆژەیـەکی لـەم چەشنەی هەبووە، زیاتر لە ٢٠ ساڵیش بەر لە دامەزراندنی پـەیمانگا کۆچـی دوایی کردووە، بەڵام ئـەم گومانـە لـە شـوێنی خـۆی نییـە، چـونکە تێکـڕای

---

[1] ضیاء القلب هو العلوم الدینیة، ونور العقل هو العلوم الحدیثة، فبامتزاجهما تتجلی الحقیقة...له رابردوو ئاماژەمان بە سەرچاوەکەیدا.

نووسینەکانی نورسی بە زمانی تورکی بوون و، لە حەفتاکان و هەشتاکانی سەدەی رابردوودا بۆ سەر زمانی عەرەبی وەرگێڕدراون، کە ئەوکات پرۆژەی ئیسلامیەتی مەعریفە لە دایك بوو بوو.

گرنگترین خاڵ ئەوەیە، لەبارەی بیرۆکەی تەکاملی مەعریفی زۆر خاڵی هاوبەش لە هزری نورسی و بیرمەندانی پەیمانگادا بەدیدەکرێن، ئەگەرچی پرۆژەکەی نورسی هەر لە چوارچێوەی وێناندن و تیۆری مایەوە و لەڕووی کردارییەوە لەدایك نەبوو، لەکاتێکدا یەکێك لە خەونە گەورەکانی نورسی دامەزراندنی زانکۆیەکی هاوشێوەی زانکۆی ئیسلامیی جیهانی– مالیزیا بوو، بەڵام خەونەکەی ئەگەر لەسەر دەستی خۆی و فێرخوازەکانیشی نەبوو، پەیمانگا بەهاوکاری هەشت وڵات (مالیزیا، تورکیا، سعودیە، میسر، لیبیا، پاکستان، مالدیڤ و بەنگلادیش) خەونێکی لەممجۆرەیان هێنایەدی.

وەك لە سەرەتاشەوە ئاماژەمان پێکرد، زانکۆی ئیسلامی لە بنچینەدا بۆ جێبەجێکردنی دیدی ئیسلامیەتی مەعریفە و پرۆسەی تەکاملی مەعریفی دامەزراوە، خودی پرۆژەیەکی لەم چەشنەش لەڕووی مێژووییەوە لەنێو کەلەپووری ئیسلامیدا ریشەی دوور و درێژی هەیە، هەروەها کاری تاکەکەسی و پرۆژەی تاك نییە، بەڵکو هەر لە بنەڕەتەوە هەم لەسەر ئاستی پەیمانگا، هەمیش لەسەر ئاستی جیهان بەگشتی و جیهانی ئیسلامی بە کاری بەکۆمەڵ دەستی پێکردووە.

# بەشی شەشەم
# چەند دەستەواژەیەکی پەیوەندیدار
# بە تەکامولی مەعریفی

لە توێژینـەوە زانـستییەکانی سـەرجەم بوارەکـان بەگـشتی و لـە زانـستە مرۆڤایەتییــەکان بەتایبــەتی، دوای روونکردنــەوەی زاراوە ســەرەکییەکانی بابەتی توێژینەوە، ئاماژە بەو چەمك و زاراوانەش دەکرێت، کـە بەشـێوەیەك لــە شــێوەکان بــە چــەمك و زاراوە ســەرەکییەکانی بابــەتی توێژینــەوە پەیوەندیدارن و، لە عەرەبیدا بە (الألفاظ ذات الصلة) ناوزەد دەکرێن.

ســەبارەت بــەو زاراوانــەی بــە چــەمك و زاراوەی تــەکامولی مــەعریفی پەیوەندیدارن، جیـا لـە "إسـلامیة المعرفـة، الرؤیـة الکونیـة"[1]، گرنگترینیـان ئەمانەی خوارەوەن:

---

[1] لە رابردوودا ئەم دوو بابەتەمان روونکردنەوە، بۆیە بەپێویستی نازانین، لێرەدا دووبارەی بکەینەوە.

- **بڕگەی یەکەم: یەکبوونی مەعریفە "وحدە المعرفە"**

ئـەم بابەتــە بــە بنــەمای لایــەنی لــۆژیکی و فەلــسەفی بابــەتی تــەکامولی مەعریفی هەژمار دەکرێت. لێـرەدا تیـشك دەخەینـە سـەر پەیوەنـدی نێـوان هەریەك لـە چـەمکەکانی (یـەکبوونی مەعریفـە و تـەکامولی مـەعریفی) جگـە لەمانە، لە دیدی بیرمەندانی هزری ئیـسلامی بەگـشتی و هـزری ئیـسلامیەتی مەعریفە بەتایبەتی، چەندین چەمك و زاراوەی تـریش راسـتەوخۆ بـە بابـەتی یـەکبوونی مەعریفـەوە پەیوەندیـدارن، بـەڵام لێـرەدا تـەنیا جـەخت لەسـەر بابەتی یەکبوونی مەعریفە دەکەینەوە.

زانایانی موسڵمان کۆکن لەسەر گرنگی یەکتاپەرستی لە گشت بوارەکاندا، بەتایبەت لە بـواری هـزری و مەعریفیـدا، چـونکە یەکتاپەرسـتی بریتییـە لـە بەردی بناغەی ئیـسلام، چـەندە ئـەو بناغەیـە تۆکمـەتر و دامـەزراوتر بێـت، دینداری و پابەندبوونیش جوانتر و تۆکمەتر دەبێت.

یەکتاپەرسـتی سەرچـاوەی ناسـنامە و شوناسـی ژیارسـتانی ئیـسلامییە، راسـتە نـاوەڕۆك و پێکهاتـەی یەکتاپەرسـتی بریتییـە لـە کۆلکـەی هاوبەشـی نێــوان ئایینــە ئاسمانییــەکان، بــەڵام کەلــەپووری ئایینــە ئاسمانییــەکان گەواهیــدەدەرە لەســەر ئــەوەی نــاوەڕۆکی یەکتاپەرســتی ئیــسلامی لــەم سەردەمەدا، لـە نـاوەڕۆکی یەکتاپەرسـتی لـە ئایینـە ئاسمانییـەکانی تـر زۆر جیاوازترە.

ئـەم جیاوازییـەش بـۆ دەسـتکاریکردن و بەلاڕێـدابردنی ئایینـەکانی تـر و دوورخـستنەوەیان لـە پێکهاتـە راسـتەقینەکەیان دەگەڕێتـەوە، لـە هـەردوو رێگەی زیاد و کەمکردن، بەشێوەیەك زۆر شت لە بەرژەوەنـدی پـەیڕەوکاران

زیــادکراون، زۆر شــتی تــریش لەبــەر هــەمان مەبەســت شــاردراونەتەوە و قرتێندراون.

نەك بەتەنیا زانا و بیرمەندانی ئیسلامی، بـەڵكو بیرمەنـدانی نائیـسلامیش دان بە هـەبوونی جیاوازییـەکی زۆردا دەنـێن، لـەنێوان پێکهاتـە و نـاوەڕۆکی یەکتاپەرستی (توحید) لەنێوان ئایینی ئیسلام و ئـایین و ئایینزاکـانی تـردا، بێگومان ئەم جیاوازییەش راستەوخۆ کاری کردووەتـە سـەر دیـدی مـرۆڤ بـۆ خودای تاقانە و، بۆ رایەڵە و پەیوەندییەکانی نێوان مرۆڤ و پەروەرێن.

شــەهید ئیــسماعیل راجــی فــاروقی، بیرمەنــدی گــەورەی پــەیمانگا، پەرتووکێکی تایبەتی بە ناونیـشانی (التوحیـد ومـضامینه في الفکـر والحیـاة) لــەبارەی ئــەم بابەتــە نووســیوە، تێیــدا دیــدگای گــشتی یەکتاپەرســتی و گرنگییەکـــەی لـــەپاڵ هـــەردوو رەهەنـــدە ژیـــاری و ژیارســـتانییەکانی روونکردووەتەوە، ئەمانیش بریتین لە هەردوو لایەنی تیـۆری کـە فەلـسەفە و هزر لەخۆدەگرێت، لەگەڵ لایەنی کرداری، بەواتایەکی تر، لە روانگەی ئیسلام یەکتاپەرستی رۆڵی زۆر کارای لە هەردوو بواری هـزری و کرداریـدا هەیـە، بـە پەراوێزخستنی هەر یەکێکیان هاوسەنگی تێکدەچێت.

لـەو پەرتووکـەدا فـاروقی بـەڕوونی تێبـینی کـردووە، بابـەتی یـەکبوونی مەعریفــە و هێنانەپێــشەوەی تــەکامول و تــەواوکاری لــەنێوان لقــەکانی مەعریفەدا، لەڕێگەی پێشکەشکردنی دیدگایەکی رۆشن و ساکار بۆ پێکهاتەی ئــەو تەوحیــد و یەکتاپەرســتییە لــە دەرگــای دەدرێــت، واتــە پێویــستە شـیکارکردنی یەکتاپەرسـتی ئاسـانتر بکرێـت، لـەو راڤـە و شـیکاریانەی لـە

کەلەپووری ئیسلامیدا لەژێر ناوی زانستی کـەلام و فەلـسەفەی ئیـسلامییەوە بۆی کراون.

زۆربەی کات بابەتی یەکتاپەرستی لـەنێوان چـینی خـوارەوەی کۆمەڵگـە، بەهۆی ناڕوونی و قورسی ئەو شـێوازەی یەکتاپـەرسـتی لـە زانـستی کـەلام و فەلـسەفەی ئیـسلامیدا پـێ شـیکراوەتەوە، پـەراوێزخراوە. فـاروقی پێیوایـە خستنەڕووی بابەتی یەکتاپەرستی بەشێوەیەکی ئاسان کە تێکڕای خوێنەران لێـی تێبگـەن، کـارێکی هــەرە پێویـست و لــە پێـشینەیە، چـونکە بـەبێ شـارەزابوون لـە حەقیقـەتی یەکتاپەرسـتی، مـرۆڤ ناتوانێـت هـیچ یـەکێك لـە ئامانجەکانی بە دروستی بپێکێت.

فاروقی لە روانگەی ئەم بابەتەوە دەیـەوێت کـار بـۆ پێکـانی دوو نیـشانە بکات، ئەمانیش بریتین لە ئەنجامدانی چاکسازی لە هزری ئیسلامی و ئـەرزی واقیعـی جیهـانی ئیـسلامی، واتـا ئەنجامـدانی چاکـسازی لـە هـزر، ئینجـا لـە واقیعدا. ئەمەش ئاماژەیەکی روونە لە دیدی ئەودا کە واقیع بەرهەمی هـزرە، بۆیە ئەگەر بمانەوێت واقیـع بگـۆڕین، پێویـستە لـە هـزرەوە دەسـتپێبکەین، بەپێچەوانەوە ئەنجامی دڵخۆشکەری نابێت.

یەکتاپـەرستی لای زانا و بیرمەنـدانی ئیـسلامی دیدگایـەکی گشتییە بـۆ حەقیقەت، گـەردوون، مێـژوو، کـات، شـوێن و چارەنووسـی مـرۆڤ، دەکرێـت بگوترێت بنەمای یەکتاپەرستی داپۆشەری گشت لایەنەکانی ژیانـە لـە دیـد و تێڕوانین و هزری ئیسلامیدا.

ئیسلام، جیهان بەسەر دوو بەرەی پیس و پیرۆز دابەش ناکـات، هـەروەك چـۆن لەگـەڵ دابەشـکردنی بـەهاکان نییـە بەسـەر بـەها ئـایینی و بـەهای

لائیکەکان (عەلمانییەکان)، هەروەها دابەشکاری لەنێوان پیاوانی ئایینی و پیاوانی دونیایی ڕەتدەکاتەوە و، سەرجەم ئەو دابەشکاریانە و هاوشێوەکانی لە دیدگای گشتی ئیسلامیدا ڕەتدەکرێنەوە، چونکە لەڕووی ناوەڕۆك و پێکهاتەوە بە ئیسلام نامۆن، بەڵکو هەڵقوڵاوی دابونەریتی کۆمەڵگە و کەسانی نائیسلامین.

پەیامی قورئان سەبارەت بەم بابەتە زۆر روونە، بۆنموونە ئەگەر دوو خودا لە گەردوون حوکمڕانی بکەن، گەردوون نەك ناوەستێت، بێگومان سەرتاپای تێکدەچێت، چۆن بەڵگەنەویستە تاقانەی پەروەرێن بۆ بەردەوامی گەردوون و لەسەرپێوەستانی گرنگە، بەهەمانشێوەش لە ژیانی تاك و کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا گرنگە.

دوای دانپێدانان بە پەروەرێنی تاقانە، پێویستە مرۆڤ دان بە یەکبوون و یەکیەتی حەقیقەتدا بنێت، چونکە حەق و حەقیقەت بۆ حەقیقەتی تەوحید و یەکتاپەرستی سەردەکێشن، بۆیە فاروقی پێیوایە یەکتاپەرستی وەك بنەمایەکی میتۆدی، وادەخوازێت حەقیقەتیش تاك بێت. ئەم یەکبوون و تاکایەتییەش لەسەر سێ بنەمایی لاوەکی تر دادەمزرێت، ئەویش پەیوەندی بە سروشتی ئەو مەعریفەیەوە هەیە کە مرۆڤ لەڕێگەی سەرچاوەکانیەوە بەرهەمی دێنێت.

ئەم سێ بنەمایەش بە کورتی بریتین لە:

١- ڕەتکردنەوەی تێکڕای ئەو شتانەی لەگەڵ حەقیقەت ناگونجێن.

٢- ئینکارکردنی هەبوونی تێکگیران لەنێوان عەقڵ و وەحی.

٣- كرانـەوە بـەڕووی زانـست و ڕێـساکانی گـەردوون و بوونـەوەر، بـە ئامانجی دەستخستنی بەڵگە و گەیشتن بە حەقیقەتی شتەکان[1].

بەمەش فاروقی دەیەوێت بڵێت، هەرچی گومان و ئەفسانە و شتی بێبنەما و نامۆ هەن کە خزێندراونەتە نێو بابەتی یەکتاپەرستی، پێویستە ریشەکێش بکـرێن و تـەنیا جـەخت لەسـەر ئـەو یەکتاپەرستییە بکرێتـەوە کـە قورئـان پێناسەی دەکات. خاڵی دووەم ڕوونکردنەوەی دیدگای فاروقییـە بـۆ بابـەتی گەنگەشـەکردنی حـوکمی عـەقڵ و نـەقڵ[2]، ئـەم بابەتـەش لـە ئـەدەبیاتی ئیسلامیدا بریتییە لە گـەرمترین بابەتـە یـەکلایی نـەکراوەکان، ئایا حـوکمی عەقڵ لەپێشەوەیە یان حوکمی نەقڵ؟.

لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا دەیان و سەتان زانـا ئەسـپی خۆیـان تـاوداوە، بەڵام فاروقی لە هەمبەر بابەتێکی وەها گرنگدا، بەڕوونی و بێ پەناوپەسـیو، پرسیارێکی لەم چەشنە بە نالۆژیکی لەقەڵەم داوە.

ئەو پێیوایە، عـەقڵ و وەحـی تەواوکـەری یـەکترن و هاوتـەریبن، هیـچیان پێش ئەوی دی ناکـەون و هـەر کـاتێکیش لـەنێوان حـوکمی ئـەم دوو جـۆرە گرنگـە هەسـت بـە تێکگیرانـی رووکەشـی کـرا، ئـەوا پێویـستە توێـژەر پێداچـوونەوە بـۆ تێگەیـشتنەکانی سـەبارەت بـە وەحـی بکـات، یـان پێداچـوونەوە بـە دەرەنجـامی کۆشـشە عەقڵییـەکانی بکـات، یـان بـە

---

[1] لە پەرتووکی "قوتابخانەی ئیسلامیەتی مەعریفە" زیاتر ئەم بابەتەمان ڕوونکردۆتەوە، بروانە لاپەرە ١٩٢.

[2] الفاروقي، إسلامية المعرفة، ص١٢٣.

هەردووكیاندا بچێتەوە، سەرەنجام بەرهەمی عەقڵ و نـەقڵ بەیـەك دەگـەن و جەخت لەسەر یەك حەقیقەت دەكەنەوە.

لە خـاڵی سـێیەمدا فـاروقی دەرگـا بـەڕووی تێكـڕای بەڵگـە زانـستییەكان دەكاتەوە، ئینجا ئەو بەڵگانە جەخت لەسەر دروستی ئەم تێزانە بكەنەوە كە موسڵمانان باوەڕیان پێیان هەیـە، یـان بەپێـچەوانەوە، ئەمـەش دوا تـرۆپكـی خاكیبوونی هزرییە، لە كەلەپووری ئیسلامیشدا هەمیشە لـەژێر بـەكارهێنانی دروشمی (والله أعلم)دا رەچاوی بابەتێكی لەم چەشنە كراوە.

مەبەست لە دروشمی (الله أعلم) جێهێشتنی گریمانە و ئەگەرە بـۆ لایـەنی بەرامبـەر، هـەروەك قـسەی ژمارەیـەك زانـا بەنموونـە دەهێنێندرێتـەوە كـە گوتوویانە بۆچوونی من راستە، بەڵام ئەگەری هەڵەبوونیشی هەیە، وەك چۆن بۆچوونی بەرامبەر هەڵەیە، بەڵام ئەگەری ئەوەش هەیە راستبێت.

كاراكردنی ئەم خاڵە لە ژیانی رۆژانەی تـاك و كۆمەڵگـەدا زۆر زۆر گرنگـە، چونكە كاتێك مرۆڤ باوەڕی بۆ دروست دەبێت خۆی لـە سـەتا سـەت لەسـەر حەق و حەقیقەتی رەهایـە، نەیارەكانیـشی لـە سـەتا سـەت لەسـەر باتیـڵ و ناحەقین، تێكڕای دەرگاكانی گفتوگۆ و گەنگەشە بەڕووی یەكتر دادەخـەن و ئیدی هیوایەك بۆ لەیەك نزیكبوونەوەی نەیارەكان نامێنێتەوە.

بەپێـــچەوانەوە، هەمیـــشە دەرگـــای گفتوگـــۆ و گەنگەشـــە واڵایـــە بـــۆ لێكتێگەیـشتن و هـەنگاونان بـەرەو یەكیـەتی و ئـاوێزانبوون و كۆكردنـەوەی چـینە جیاجیاكـانی كۆمەڵگـە، كـە دەرەنجـام فرەیـی لـە دیـد و بۆچـوون رێزلێگیراو دەبێت و را و بۆچوونی جیاواز پەسند دەكەن. بەمـشێوەیە چـۆن یەكتاپەرسـتی بڕیـاری تاقانـەی پەروەرێنـە و بریتییـە لـە بڕیـاردان لەسـەر

یـەکبوون و تاقانـەی حەقیقـەتیش، دواجـار بڕیاردانیـشە لەسـەر یـەکبوونی سەرچاوەکانی حەقیقەت.

ئەگەر بەوردی سەیری قورئان بکەین، بەڕوونی بۆمان ڕووندەبێتەوە چۆن پەروەرێن سەرچاوەی سروش و وەحییە، بەهەمانشێوەش سەرچاوەی گشت بوونەوەر و گەردوونە، کۆی دیـاردە ڕۆحـی و دەروونـی و گەردوونییـەکانیش لای ئـەوەوە دەسـت پێدەکـەن. بـەمجۆرە پێـداگر دەبـین لەسـەر ئـەو دەرئەنجامەی، سەرچاوەی ڕاسـتەقینەی زانـستە ئاسمانییـەکان بریتییـە لـە وەحی، وەحیش لەلایەن پەروەرێنی تاقانـە بـەش بـەش بـۆ مـرۆڤ هاتووەتـە خوارەوە، هاوکات پەروەرێنی تاقانـە سەرچـاوەی حەقیقـەتی ڕەهایـە، هـەر ئـەویش ئاگـاداری ورد و درشـتی دیـوی دووەمـی شـتەکانە، هـەروەك چـۆن زاناترینە بە حەقیقەتی مرۆڤ و کار و چالاکی و تواناکی.

ئەو خاڵەی گەنگەشە هەڵناگرێت، بریتییـە لـە خوداییبـوونی سەرچـاوەی زانستە ئاسمانییەکان، کە بـە ئیلاهیـات یـان (تیۆلـۆجی) ناسـراون، زانـستە ئەزموونییەکانیش بریتین لە زادە و بەرهەمی هەوڵ و تێکۆشانی مرۆڤ، کە لە مرۆڤـی یەکەمـەوە (ئـادەم) دەسـتپێدەکەن و تـاوەکو ئێـستا بـەردەوامن، مرۆڤیش دروستکراوی ئافرێنەرە، هەر ئەویش لـە هـەموو کـەس شـارەزاتر و ئاشناترە بە توانا ئاشکرا و شارەواکانی مرۆڤ، چونکە دروستکراوی خۆیەتی.

بەمشێوەیە ئـەو ڕاسـتییە دەسـەلمێت سەرچـاوەی ڕاسـتەقینەی زانـستە ئایینییەکان و زانستە ئەزموونییەکان یەکە، کە بریتییە لە زاتی الله ی تاقانە، ئەمەش پوختەی ناوەڕۆکی (وحدة المعرفة) یە.

بەم مانا و تێگەیشتنەی سەرەوە، یەکەی مەعریفە بە بەردی بناخەی تەکامولی مەعریفی دادەندرێت.[١]

کەواتە لەسەر ئاستی یەکبوونی مەعریفە، کە بریتییە لە یەکەم بەردی بناخەی تەکامول، زاتی الله بریتییە لە سەرچاوەی راستەقینەی مەعریفە، بەڵام لەسەر ئاستی تەکامولی مەعریفی جیاوازە. لە بەشەکانی داهاتوودا زیاتر قسە لەسەر سەرچاوەکانی مەعریفە دەکەین و شیکاریان دەکەین.

- **بڕگەی دووەم: مەعریفەی گەردوونی**

لەسەر هەمان پرس، بیرمەندانی تریش بۆچوونی خۆیان خستوەتەڕوو، بۆنموونە: بیرمەندی بەڕەگەز ئێرانی (سەید حوسێن نەسر) لەبارەی بابەتی یەکەی مەعریفە و رۆڵی یەکتاپەرستی، خاوەنی چەند بۆچوونێکی نزیك لە بۆچوونەکانی فاروقییە.

نەسر پێیوایە لە هەرەمی مەعریفەی ئیسلامیدا، یەکتاپەرستی بریتییە لە ژێرخان و گرنگترین بنەما، یەکتاپەرستیش گەیشتنە بە لووتکە و کۆتا ئامانج، لە سەرجەم هەوڵ و کۆششە هزرییەکانی مرۆڤی موسڵماندا.

خاڵی جەوهەری جیاکەرەوەی نێوان بۆچوونی فارووقی و نەسر لەسەر ئەم بابەتە، بریتییە لە گرنگیپێدان. فارووقی بە یەك چاو دەڕوانێتە پێویستی کاراکردنی رۆڵی یەکتاپەرستی لە هەردوو بوارە مەعریفیەکەی زانستە ئیسلامییەکان و زانستە ئەزموونییەکاندا، لەبەرامبەردا نەسر زیاتر جەخت لەسەر زانستە ئەزموونییەکان دەکاتەوە.

---

[1] بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بەم پرسە، بروانە: ملكاوي، منهجية التكامل المعرفي، ص٢٧.

بەبڕوای نەسر، بەرزنرخاندنی رۆڵی فەلسەفە و میتافیزیکی ئیسلامی لە زانستە ئەزموونی و سروشتییەکاندا، دەروازە و دەرچەی سەرەکییە بۆ تێگەیشتن لە رایەڵە و پەیوەندی نێوان مەعریفەی زانستی و مەعریفەی ئایینی (التکامل المعرفی). نەسر هاوشێوەی (رازی، ئیبن سینا و شیرازی) هەمان ئەو زاراوە و چەمکانە بەکاردێنێت کە ئەوان بەکاریان هێناون، وەك: زانستە گەردوونییەکان و مەعریفەی گەردوونی (علم الکونیات والمعرفة الکونیة). نەسر و بیرمەندە هاوبیرەکانی، لەچوارچێوەی بەکارهێنانی ئەم زاراوانەدا، توێکاری و بەراوردکارییان بۆ بابەتە مەعریفییە پەیوەندیدارەکان کردووە.

هەر لە سۆنگەی شیکارکردنی سروشت و بوونەوەردا، کە لقێکە لە میتافیزکی ئیسلامی، هەردوو بوونەوەری گەورە و بچووك بەراورد کراون. بوونەوەری گەورە بریتییە لە گەردوونی مەزن و فراوان، بوونەوەری بچووکیش بریتییە لە مرۆڤی وردیلە. بەردەوامبوون لەسەر توێکاری و شیکاری ئەم کۆباسانە، بە پشتبەستن بە بنەمای دەستنیشانکردنی پەیوەندی و رایەڵە تەواوکارییەکان بەئەنجام دەگەیێندرێت، لە چوارچێوەی یەکەیەکی گشتی دەستکردی پەروەرێنی باڵا، هاوشێوەی جەستەییەکی تەندروست.

بەبۆچوونی نەسر، ئەو زانستەی وەك هەوێن دەبێتە هۆکاری دروستکردنی هەماهەنگی و یەکانگیری لەنێوان سەرجەم لق و یەکە پەرشوبڵاو و جۆراوجۆرەکانی بوونەوەردا، لەگەڵ ناوەڕۆك و رۆحی ئیسلامدا تێکدەکاتەوە، ئەو زانستەش بەڕەوای دەبینێت خۆی لە بیروباوەڕی

بنــەڕەتی ئیــسلام بدۆزێتــەوە، کــە بریتییــە لــە یەکتاپەرســتی بــە مانــا فراوانەکەی.

بەپێــچەوانەوە هــەر زانــستێك دژی بنــەما و بنــچینەکانی ئیــسلام بێــت، ناتوانێــت ببێتــە دەروازەی بەیەکگەیــشتنی زانــستەکان و بەرهــەمهێنانی تــەکامول، هەرچــەندە راڤــە و شــیکارەکانیش جۆراوجــۆر بــن، کاریگــەرییان لەســەر بنــەمای بنــەڕەتی نابێــت، کــە بریتییــە لــە پێکهاتــە و نــاوەڕۆکی حەقیقەتی جیهان.

حەقیقەتی بوونەوەر و گەردوون بەگشتی و، زەوی و ژینگەی دەوروبــەری مرۆڤ بەتایبەتی، لــە کۆمــەڵێك یەکــەی جیاجیــای یــەکانگیرکراو پێکهــاتوون، تاوەکو کار گەیشتووەتە ئەوەی ئەم یەکە زۆر و زەوەندانــە لەســەر شــێوەی جەستەیەکی تۆکمە دەربکەون، لەبەرامبــەر ئــەم یەکــە کۆکراوانــەدا، کــە لــە حەقیقەتدا هەزاران و لە رووکەشدا یەك پارچــە دەردەکــەون، تاقانــەیی زاتــی پەروەرێنی باڵا زیاتر دەدرەوشێتەوە[1].

لێرەدا چەند خاڵێکی پەیوەندیدار بەم پرسە روونکەینەوە:

١- پەیوەندییــەکی جەســتەیی لــەنێوان زانــست و مەعریفــەی پــەنهانی یــەکانگیر (المعرفــة الغيبيــة التوحيديــة) هاوشــێوەی پەیوەنــدی نێــوان ئەندامەکانی جەستە بەدیدەکرێت.

---

[1] Seyyed Hossein Nasr. An Introduction to Islamic Cosmological Doctrines. Thames And Hudson. 1978. P.275-281.

٢- جیهانی پڕ له جیاوازی و فرەڕەنگی بریتییـه لـه گۆڕەپـانی کـرداری زانستەکان، زانستەکانیش ئامێزان و تواوەی نێو مەعریفەی تاقانەپەرستین.

٣-سرووشی خودای تاقانه بریتییـه لـه سەرچـاوەی مەعریفـەی غـەیبی، مەعریفەی غەیبیش بریتییه له سەرچاوەی مەعریفەی گەردوونی، مەعریفـەی گەردوونیش بریتییه له سەرچاوەی زانسته ئەزموونییەکان، زەمینـەی کـار و کرداری زانسته ئەزموونییەکانیش بریتییه له جیهانی فرەیی.

ئەم ئەنجامگیرییەی سەرەوە وادەخوازێت، مەعریفـەی گـەردوونی ببێتـه سەرچاوەی ئامرازە پێویستەکانی بابەتی تـەکامولی مـەعریفی، چـونکه ئـەم مەعریفه گەردوونییه توانـاداره لەسـەر پێـدان و بەرهـەمهێنانی ئامرازەکـانی تەکامولی چەمکی(أدوات التكامل المفاهيمي).

ئامـانجی تـەکامول بریتییـه لـه دەسـتەبەرکردنی ئـەو زانـستەی دەبێتـه دەروازە و شاشەی نمایشکردنی یـەکانگیری و ئـاوێزانبوونی شـتەکان لەگـەڵ یەکتر، لەلایەکی تـر، ئـەرکی خـستنەڕووی ئاسـتەکانی تـەکامول لـه خانـەی ژێرەوەی شێوازە قوچەکییەکەی تەکامول بۆ دوا ئاست و خانەی لووتکه لـه ئەستۆی ئەو زانستەدایه، لەپاڵ خستنەڕووی پەیوەندی و رایەڵـەکانی نێـوان ئەم ئاستانەی تەکامول لەگەڵ یـەك، ئینجـا لـەنێوان ئاسـتەکانی تـەکامول و پەروەرێنی بالاّ.

کەواته بـەم تێگەیـشتنە، مەعریفـەی گـەردوونی بریتییـه لـه سەرچـاوەی ئامرازەکانی تەکامول، هەروەك خودی خۆی بریتییه له نمایشکاری پێکهاتەی تـەکامول و ئاسـت و پەیوەندییـەکانیان لەگـەڵ یـەك، لـەپاڵ خـستنەڕووی پەیوەندی نێوان تەکامولی شتەکان و زاتی پەروەرێنی تاقانه.

بەمـــشێوەیە، مەعریفـــەی گـــەردوونی مەعریفەیـــەکی ڕێگەخۆشـــکەر بـــۆ هێنانەپێشەوەی تەکامول و تەواوکاری لەنێوان چـەند یەکەیـەکی جۆراوجـۆر لەسەر شێوەی جەستەیەکی تۆکمە بەرهەم دێنێت[1].

وەك نەسر ئاماژەی پێداوە، زانستە ئەزموونییەکان و بیرکاری بـریتین لـە چەند زانستێکی سنووردار و پەیوەندیدار بە چـەند لایـەنێکی حەقیقـەت، لـە کاتێك حەقیقەتی بـاڵای یەکتاپەرسـتی بریتییـە لـە زانـستی میتافیزیـك، کـە راســتەوخۆ پەیوەســتە بــە غەیبــەوە، زانــستی میتــافیزیکیش لــە گــشت زانـستەکانی تـر گـشتگیرترە، چـونکە پەیوەسـتە بـە حەقیقـەتی بـاڵا، ئـەو حەقیقەتــە باڵایــەی هــەموو حەقیقەتــەکانی تــر لــەخۆدەگرێت و ناکۆتــا و بێسنوورە.

مەعریفەی باڵای یەکتاپەرستی و زانستەکان جۆرێك لە مەعریفە بەیەکیان دەبەستێتەوە، کە پێیدەگوترێت مەعریفەی گەردوونی (المعرفة الكونية). لـە دیـدی نەسـر مەعریفـەی گـەردوونی بریتییــە لـەو زانـستەی وابەسـتەیە بـە پێکهاتـەی گـەردوون و ناوەڕۆکـە جۆرییەکـەی (المحتـوي النـوعي) لـە زانـستە تەقلیدییــە ئیــسلامییەکان، زانـستی گـەردوون (گەردووناسـی) بەشـێکە لـە میتافیزیــك هــەروەك فــارابی لــە (إحــصاء العلــوم) ئامــاژەی بــۆ کــردووە، زانستەکانی تریش لە میتافیزیکەوە سەرچاوە دەگرن.

مەعریفـەی گـەردوونی لـە دیـدی سـەید حوسـێن نەسـر، بـەم نـاوەڕۆك و پێناسەیە چوارچێوەی چەمکەکانی یەکانگیری زانستە مـاددی و رۆحییـەکان

---

[1] Seyyed Hossein Nasr. Science and Civilization in Islam. http://sourcebooks.fordham.edu/med/nasr.asp.

پێکدێنێت. بەواتایەکی تر، دەکرێت بگوترێت هێنانەپێشەوەی مەعریفەی گەردوونی کە سەرچاوەکەی یەکتاپەرستی و زەمینەی کردارییە، زەمینەی کرداریش واتە زانستە ئەزموونییەکان، خاڵی دەستپێکی پرۆسەی بەرهەمهێنان و بەرجەستەکردنی تەکامولی مەعریفییە لە دیدی نەسردا.

- **بڕگەی سێیەم: مەعریفەی رۆحی و دەروونی گەردوونی**

(المعرفة الروحية والنفس الكونية)

عوسمان بەکر، هاوشێوەی نەسر زاراوەی مەعریفەی گەردوونی بەکاردێنێت، بەڵام ئەو روونتر لە نەسر باسی تایبەتمەندییەکانی ئەو مەعریفە گەردوونییە دەکات و هەر لە دەستپێکەوە هاوەڵناوی (الطبیعة الروحیة) دەداتە پاڵ مەعریفەی گەردوونی.

بەمانایەکی تر، ئەو مەعریفە گەردوونییەی بریتی دەبێت لە دەروازەی تەکامولی مەعریفی، واتە خاوەن دیوێکی رۆحییە و لەژێر هەژموونی لایەنە رۆحییەکان گەشەی کردووە، بەپێچەوانەی ئەو مەعریفە و زانستە ئەزموونیانەی رۆژئاوا کە لەدەرەوەی چوارچێوەی رۆحانییات گەشەیان پێدراوە، بەشێوەیەك تەنیا جیهان و ئەزموون بە سەرچاوەی زانست و مەعریفە دەناسێنن.

عوسمان بەکر، هەردوو زاراوەی مەعریفەی رۆحی و دەرونی گەردوونی (المعرفة الروحية والنفس الكونية) بەکاردێنێت. یەکەمیان ئاماژەیە بۆ ناسینی خودا و یەکتاپەرستی، دووەمیشیان ئاماژەیە بۆ ئاشنابوون بە گشت دروستکراوەکانی پەروەرێنی تاقانە کە لە بوونەوەر و گەردوونی فراوان

دەبیندرێن، بە ئامانجی ئاشنابوون بە پەیوەندی ئەم دروستکراوانە لەگەڵ بەدیهێنەر، ئەمەش گرنگترین خاڵی بەیەکگەیشتنی مەعریفەی زانستی و مەعریفەی رۆحییە.

ئاشنابوون بەم پەیوەندییە وادەخوازێت بۆ سەرچاوەکانی مەعریفە لە ئیسلامدا بگەڕێینەوە، کە بریتییە لە وەحی (قورئان و فەرموودە).

قورئان سەرچاوەی وزە هزری و رۆحییەکانە بۆ تاکی موسڵمان و سەرچاوەی گشت مەعریفە و زانستەکانە، بەو واتایە نا سەرجەم وردەکاری زانستە جۆراوجۆرەکانی تێدا خرابنەڕوو، بەڵکو دیدگایەکی جیاوازی (تاقانە پەرستی) بۆ کۆی بوارەکانی مەعریفە هەیە، واتە لە دیدی قورئان هەموو جۆگەکانی مەعریفە لە سەرچاوەیەکەوە هەڵدەقوڵێن، کە بریتییە لە زاتی اللهی پەروەرێن.

لە دیدی زانایانی موسڵمان بەدیاریکراوی لە بەشە باڵاکەی حەقیقەت کە بریتییە لە خواناسی، مامەڵە لەگەڵ بوونەوەر و رێساکانی گەردوون و نهێنییە شاراوەکانی ناکرێت، بەڵکو لەکاتی توێکاری سروشت و بوونەوەر و شتە ماددییەکان، هەرگیز پەیوەندی تووندوتۆڵی جیهانی غەیب و پەنهان بە جیهانی بینراو لەبیر ناکرێت. بۆنموونە، لێکۆڵینەوە لە رەچەڵەکی ژیان تەنیا بە توێکاری شتە بیندراو و بەرجەستەکان ناگاتە ئەنجامێکی یەکلاییکەرەوە، چونکە ژیان تەنیا بریتی نییە لە بوونێکی ماددەگەراییانەی سروشتی و بەس، بەڵکو بریتییە لە هێزێکی زیندوو و توانادای دەرەوەی ئەم بوونەوەرە ماددییە، کە رەهەندی بوونەوەرە ماددییەکەی بڕیوە و بەویستی خۆی چالاکی تێدا ئەنجام دەدات، ئەم هێز و توانایەش لە دیدی مرۆڤی ئاییندارادا بریتییە لە خوداوەندی بەدیهێنەر.

بۆیــە عوسمــان بــەکر جــەخت لەســەر خــاڵی بەیەکگەیــشتنی دەرونــی گەردوونی و مەعریفەی رۆحی دەکاتەوە، ئەو پێیوایـە گرنگیـدان بـە زانـستە ئەزموونی و گەردوونییەکان و وابەستەکردنیان بە یەکبوونی مەعریفە، مانـای وازهێنــان و دوورکەوتنــەوە نییــە لــە رێگــا ئەزموونییــەکان و ئــامرازە ســەردەمییەکانی توێژینــەوە و توێکــاری زانــستی، کــە ســەرکەوتوویی رێژەییانەی خۆیان لە بـوارە ئەزموونییـەکان سـەلماندووە، بـەڵکو پێویـستە گۆڕانکارییەکی ریشەیی لە رێبـازە سـەردەمییەکان و ئاراسـتەکانیان ئـەنجام بدرێت، بە دانان بە لایەنی رۆحی، لە رێگاکانی هەنگاونان بەرەو مەعریفـە و حەقیقـەت. وەرگـرتن و داننـان بـەم جـۆرە زانـستە گەردوونییـە، دەبێتـە کۆکەرەوەی رێچکە زانستییە سەردەمییەکان و لایەنە ئایینی و رۆحییـەکان، کاریگەرییەکی گەورەی دەبێت لە سەر رێبازەکانی توێژینەوە و لێکۆڵینەوە.

عوسمـان بـەکر بەپێویـستی دەزانێـت، رێـچکەی زانـستی ئـەم سـەردەمە دەسـتبەرداری ئـەو بۆچـوونە ناڕاسـتە ببێـت، کـە بەتـەنها رێبـازە زانـستە ئەزموونییەکانی خۆی بە رێگەی گەیشتن بـە حەقیقـەت بناسـێنێت، بـەڵکو دەبێت دان بە رێگاکانی تریشدا بنێت کە مرۆڤ بە حەقیقـەت ئاشـنا دەکـەن. لە شیکاری سەرچاوەکانی مەعریفە زیاتر ئەم بابەتە ڕووندەکەینەوە.[1].

[1] Osman bakar, Tawhid and Science. 1993. See full essay: http://onlinelibrary.wiley.com/doi/10.1111/j.1478-1913.1993.tb03584.x/epdf?r3_referer=wol&tracking_action=preview_click&show_checkout=1&purchase_referrer=www.search.ask.com&purchase_site_license=LICENSE_DENIED.

هەر لەبارەی دیدگای گەردوونی و مەعریفەی گەردوونی، ئەبو سلێمان لە پەرتووکی (الرؤية الكونية الحضارية القرآنية) بەوردی بۆچوونەکانی خۆی تایبەت بەم پرسە خستوونەتەڕوو، لە رابردوودا پوختەیەکمان سەبارەت بەم بابەتە باسکرد، بۆیە بەپێویستی نازانین لێرە دووبارەی بکەینەوە.

- **بڕگەی چوارەم: ئایەتە بیندراو و نوسراوەکان**
  **"آيات الله المنظورة والمسطورة"**

بیرمەندی گەورەی پەیمانگا (تەها جابر عەلوانی) لەبارەی ئەم پرسە کۆمەڵێك تێزی وردی وروژاندوون، گرنگترینیان بابەتە پەیوەندیدارەکانن بە خوێندنەوەی هەردوو پەرتووکی بیندراو و خوێندراو، کە بریتین لە گەردوون و قورئان[1].

عەقڵ و ئاوەزی موسڵمان لە سەرەتای هاتنی پەیامی ئیسلام تاوەکو چاخی شەشەمی کۆچی (سەدەی دوانزەیەمی زایینی) پێشکەوتنێکی بەرچاوی بەخۆوە بینیوە. هەر ئەو پێشکەوتنە عەقڵییە بووەتە هۆکاری گرتنەدەستی کاروباری جیهان، بەشێوەیەك موسڵمانان بۆ ماوەی شەش سەدە بەدوای یەکدا جڵەوی ژیارستانی جیهانیان گرتەدەست.

بەبۆچوونی عەلوانی، ئەو پێشەنگایەتییەی جیهان لەلایەن موسڵمانان بە یەکانگیرکردنی زانستە ئیسلامییەکان و زانستە ئەزموونییەکان بەرهەمهاتووە، راستە لە رابردوودا ئەم دوو چەمکە (زانستە ئیسلامییەکان و

---

[1] طه جابر العلواني، الجمع بين القرائتين قراءة الوحي وقراءة الكون، القاهرة: مكتبة الشروق الدولية، ط١، ٢٠٠٦م، ص١٤.

زانسته ئەزموونییەکان) بەکار نەهاتوون، بەڵام ناوەڕۆکی هەردووکیان بە پێکهاتەی ئێستا بەردەستبوون.

لێکۆڵینەوە لە قورئان و زانستە ئەزموونییەکان (پزیشکی، ئەندازیاری، بیرکاری، کیمیا، فیزیا، زیندەوەرزانی، دەروناسی، کۆمەڵناسی و گەردووناسی.. هتد) بریتیبوون لە کلیلی گەیشتن بە پێشەنگایەتی جیهان. دیدگای تاکی موسڵمان بۆ بوونەوەر و ژیان و مرۆڤ لە دیدگایەکی گەردوونی هەمەلایەنەی گشتگیری ئیسلامیانە سەرچاوەدەگرێت، پێکهاتەکەی بریتییە لە وردبوونەوە لە هەردوو پەرتووکی بیندرا و خوێندراو (گەردوون و قورئان).

یەکەمیان بریتییە لە گەردوون بە گشت پێکهاتەکانی، وەك: تەنە مادديیەکان، رووداوەکان، دیاردە گەردوونییەکان، رایەڵە و پەیوەندی و رێساکان، کە لەڕێگەیەوە مرۆڤ توانای رامکردن و بەگەڕخستنی گەردوونی دەبێت بۆ خزمەتکردنی مرۆڤایەتی و، جێبەجێکردنی ئەرك و ئەمانەتی جێنشینایەتی و ئاوەدانکردنەوەی زەوی.

بەشی دووەمی ئەم دیدگا ئیسلامییە بە پەرتووکی خوێندراو (قورئان) تەواودەبێت، لەڕێگەی رێنمایی و زانست و حیکمەت و حوکمە جۆراوجۆرەکان. دوای هاتنەکایەوەی دیدگایەکی دروست لەڕێگەی تێگەیشتن و وردبوونەوە لە هەردوو پەرتووکەکە (قورئان و گەردوون) دەرگای تێگەیشتن لە سروشت و باری کۆمەڵایەتی و پێکهاتەی لایەنە دەروونییەکان لەڕێگەی کاراکردنی عەقڵ و هەست دەخرێتە سەرپشت.

بەواتایەکی تر، هەر کەسێك بیەوێت لە حەقیقەتی گەردوون، باری کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی، پێکهاتە و ناوەڕۆکی ناخی مرۆڤ تێبگات،

ئـەوا تاکـە دەروازە بریتییـە لـە بەگەڕخـستنی عـەقڵ و هەسـتەوەرەکان بـۆ تێگەیـــشتن و گرێـــدانی تێزەکـــانی زانـــستە قورئانییـــەکان و زانـــستە گەردوونییەکان بە یەکتر. بە خوێندنەوەیەکی لەم چەشـنە، مـرۆڤ دەتوانێـت دیدگایەکی روونی بەرامبەر سەرجەم پرسەکانی تایبەت بـە هـەردوو جیهـانی بینـدراو و نەبینـدراو هـەبێت. جیهـانی بینـدراو، بریتییـە لـەو بوونـەوەر و گەردوونەی مرۆڤ بە چاوەکانی دەیانبینێت و بە هەستەوەرەکانی هەسـت بـە دیاردە و رووداو و شتەکانی دەکات.

جیهانی پەنهانیش (عـالم الغیـب) بریتییـە لـەو جیهانـەی مـرۆڤ لەڕێگـەی عەقڵ و هەستەوە بە ئاسانی ناتوانێت هەست بـە پێکهاتەکـەی بکـات، تاکـە سەرچاوەی ئاشنابوون بەم جیهانە پەنهانەش بریتییە لـە سروشـی خـودایی، تاکە سروشی دەستکاری نەکراویش تاوەکو ئێستا بریتییە لە قورئانی پیرۆز.

تێگەیشتن لەم دوو جیهانە کۆمەڵێك ئامانج دەپێکێـت، گرنگترینیـان بریتییـە لە ناسینی ئەرك و بەرپرسیاریەتی مرۆڤ بەرامبەر خـودا، بوونـەوەر و مرۆڤـەکانی تری دەوروبەر، هەروەها بەگەڕخستنی زانست و تواناکانی بـۆ ئاوەدانکردنـەوەی زەوی لەڕێگەی بیناکردنی ژیارستانییەکی دروست و تەندروست.

کەواتـــە پرســـی تـــەکاملی مـــەعریفی لای عـــەلوانی، لەڕێگـــەی دوو خوێندنـەوەی وردی پەیوەسـت بەیـەکتر بـۆ قورئـان و گـەردوون (القـرائتین المتدبرین المتلازمتین) بەرهەمدێت. دوای بەرهەمهێنانی مەعریفـە و هزرێکـی لـەم چەشـنە، مـرۆڤ دەتوانێـت هەرسـێ جیهـانی گـەردوونی، کۆمەڵایـەتی و دەرونی بەیەکەوە گرێبدات.

بەواتایەکی تر، تێگەیشتن و لێکۆڵینەوە لە لایەنە ماددیەکانی گـەردوون، وەك: تەنــە ماددیــەکان، دیــاردە سروشــتی و گەردوونییــەکان، رووداو و رێساکان، لـەپاڵ توێکـاری جیهـانی کۆمەڵایـەتی، وەك رێـساکانی گـۆڕان و گۆڕانکــاری، یاســاکانی پاڵنــەر و دەستاودەســتکردن لــە بــوارە کۆمەڵایەتییەکان، هاوڕێ لەگەڵ جیهانی دەرونی، وەك چاکە، خراپە، باوەڕ، بێباوەڕی، رۆشنهزری و.. هتد، بریتین لە پایەکانی تەکامولی مەعریفی.

کەواتـە عـەلوانی پێیوایـە، سـەیرکردنی ئـەم چـوار جیهانـە (گـەردوون، بوونـەوەر، لایـەنی کۆمەڵایـەتی و بـاری دەرونـی) بەیـەك پـاکێج بـریتین لـە تەکامولی مەعریفی لەلایەنی هزری و تیۆرییەوە. هەر بەوەندەش ناوەستێت، بەڵکو خوێندنەوەی قورئان و فەرموودە بە هەردوو لایـەنی ریوایـە و دیرایـە، لــەپاڵ بەگەڕخــستنی هەســتەوەرەکان و کــاراکردنی عــەقڵ و ئــاوەز لــە تێگەیشتن و راڤەکردن و شیکارکردنی ئەم دوو سەرچاوە رەسەنەی زانـستە ئیسلامییەکان لەلایەك، کۆکردنەوە تێکهەڵکێشکردنی لایەنە بەرجەسـتەکانی گـەردوونی بینـدراو و قورئـانی خوێنـدراو، لەگـەڵ هـەواڵی جیهـانی پـەنهان سـەبارەت بـە بنـچینەی گـەردوون و بوونـەوەر و پێکهاتەکـەی لـە روانگـەی زانستی سروش (وەحی) و، ریواتەکانی تایبەت بەو پرسە لە سۆنگەی زانستە ئیسلامییەکان لەلایەکی تر، رەهەندە فراوانەکەی تەکامول پێکدەهێنن.

دەرەنجـام پوختــەی بیرۆکـەی تـەکامولی مـەعریفی لـە دیـدی عـەلوانی، بریتییە لە هێنانەکایەوەی هەماهەنگی لەنێوان شـیکاری قورئـان و توێکـاری گەردوون، لەڕێگەی قورئان و فەرموودە و زانستە ئەزموونییـەکان، هـەروەها کـاراکردنی عـەقڵ و هەسـتەوەرەکان بـۆ شـیکارکردنی دیـاردە گـەردوونی و

کۆمەڵایەتی و دەروونییەکان، لەپاڵ وابەستەکردنی هەردوو جیهانی پـەنهان و بیندراو بەیەکتر، ئەنجامدانی پرۆسەیەکی لەم چەشنەش بە یەك پاکێج و بـێ دابڕکاری، بریتییە لە تەکامولی مەعریفی.

عەلوانی پێشبینی ئەوە دەکات، دەرەنجامی بەگەڕخستنی پرۆژەیـەکی لەمشێوەیە لەڕووی کردارییەوە، بریتی دەبێت لە هەستانەوەی ژیارستانیەتی موسڵمانان و هاتنەپێشەوەیان بۆ پێشەنگایەتی جیهـان، هـەروەك چـۆن لـە سەرەتای هاتنی ئیسلام تـاوەکو سـەدەی شەشـەمی کۆچـی پێشەنگایەتی جیهانیان لەدەست بوو.

هەر لەم رێگەیەوە موسڵمانان دەتوانن ببنە باشترین ئوممـەت، کـە وەك شـایەت بەسـەر گـەلانی تـر دەبنـە جێنـشین و ئاوەدانکـەرەوەی زەوی و جێبەجێکاری ئەو ئەمانەتە خوداییەی خراوەتە ئەستۆی مرۆڤ. مێژوو شایەتە تـاوەکو هـزر و مەعریفەیـەکی لـەم چەشـنە لـە جیهـانی ئیـسلامی نـەبێت، پێشەنگایەتی و خەیرییەت و شایەتی موسـڵمانان بەسـەر گـەلانی تـر روون و ئاشکرا نابێت و موسوڵمانان ناتوانن قەڵەمڕەوی و پێشکەوتنی جیهان بکەن.

دوای هەڵایسانی جـەنگی نێـوان عـەقڵ و نـەقڵ و جیاکردنـەوەی زانـستە ئیـسلامییەکان و زانـستە ئەزموونییـەکان لـە یـەکتر، دواکـەوتوویی و کێشمەکێـشم و پـشێوی هـزری و مـەعریفی، لـەپاڵ دابـڕان لـە واقیـع و دوورکەوتنەوە لە پێشکەوتنە دونیاییەکان و کاولکاری وڵاتـە ئیـسلامییەکان، نەمانی بەیداخ و پەیام و حوکمڕانی ئیـسلامی لێکەوتـەوە، تـاوەکو کـاروانی هزری و مەعریفیش بەمشێوەیە لە جیهانی ئیسلامی گـوزەر بکـات، ئومێـدی هەستانەوە زیاتر خامۆش دەبێت.

عەلوانی جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، پەکخستنی هەردوو پەرتووکەکە بەواتای لەسێدارەدانی مەعریفە، خاپوورکردنی گەردوون و هەستانی قیامەت دێت. هەروەك پەراوێزخستنی یەکێك و کاراکردنی ئەویتریان، بەواتای لەسێدارەدانی نیوەی بناخەکانی ژیان و بەفیڕۆدانی نیوەی مرۆڤایەتی دێت، بە مانا گشتگیرییەکەش بریتییە لە وێرانکردنی ژیان[1].

عەلوانی لە نووسینەکانیدا زۆر بەدرێژی بابەتی تێکهەڵکێشکردن و گرێدانی هەردوو پەرتووکی بیندراو و خوێندراوی روونکردووەتەوە، توێژەر لە پەرتووکی (قوتابخانەی إسلامیة المعرفة) بە تێروتەسەلی و بە زوبانی شیرینی کوردی ئاماژەی بە بۆچوونەکانی عەلوانی کردووە، بۆیە بەپێویستی نازانین لێرەدا دووبارە باسیان بکەینەوە و خوێنەر دەتوانێت بۆ کتێبەکە بگەڕێتەوە، لەوێدا خوێنەر دەتوانێت بە سەرجەم بۆچوونەکانی عەلوانی ئاشنابێت، بەتایبەت ئەو پرسانەی وابەستەی ئەم بابەتەن، وەك: دەرهاوێشتەکانی خوێندنەوەی تاك پەرتووکی، پەراوێزخستنی دیراسەکردنی قورئان یان گەردوون، چۆنیەتی گرێدانی هەردوو پەرتووکەکە بەیەکتر، دەروازەکانی دیارسەکردنی قورئان و گەردوون، ڕێبازەکانی تێکهەڵکێشکردنی هەردوو پەرتووکەکە، چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ قورئان و فەرموودە و بیناکردنی مەعریفەیەکی سەردەمیانە، لەپاڵ چەند پرسێکی تری هزری و مەعریفیدا[2].

---

[1] طه جابر العلواني، العقل وموقعه في المنهجية الإسلامية، مجلة إسلامية المعرفة، ع٦، ص١٠.

[2] کوسرەت صالح، قوتابخانەی إسلامیة المعرفة، ص ٢٤٢–٢٧٥.

# بەشی حەوتەم

# بۆچی تەکامولی مەعریفی پێویستە؟

دەکرێت لەم چەند بەشەی سەرەوە کە تایبەت بوون بە ریشەی مێـژوویی ئیـسلامیەتی مەعریفـە و بابەتـەکانی پەیوەندیـدار بـە ناوەڕۆکەکـەی، لـەوە تێبگـەین لـە ناوەڕاسـت و کۆتـایی حـەفتاکانی سـەدەی بیـستەم، لەلایـەن بیرمەنــدانی موســڵمانی شــارەزا لــە زانــست و مەعریفــەی رۆژئــاوایی، بەسەرپەرشـتی چـەند دەزگایـەکی توێژینـەوەی چـالاك لـە شـێوەی چـەند لێکۆڵینەوەیـەکی هـزری، کـار لەسـەر چـەند ئاراسـتەیەکی هـزری ئیـسلامی کراوە.

بنچینەی ئەم ئاراستە هزرییە نوێیانە، بە شێوازی گەنگەشـە و گفتوگـۆی ســەرەتایی گــشتگیر و فرەڕەهەنــد لــە کۆتــایی شەســتەکانەوە دەســتی پێکردووە، دواتر وردەوردە و هەنگاو بـە هـەنگاو گەشـەی کـردووە، تـاوەکو بووەتـە پرۆژەیـەکی هـزری جێـی بایـەخ و ئومێـد. ئـەو بابەتانـەی ئـەوکات لەلایـەن بیرمەنـدە ئیـسلامییەکان گەنگەشـەکراون، بـە کـۆدەنگی توێـژەر و

بیرمەندە بەشداربووەکان، زیاتر بۆ دۆزینەوەی چارەسەری ریشەیی سێ گرێکوێرەی جیهانی ئیسلامی بوون، کە بە هەرسێکیان پێکهێنەری قەیرانی هزرین.

**سێ گرێکوێرەکان ئەمانەن:**

یەکەم: دووفاقیی پەروەردە کە لەسەر کەسایەتی تاکی موسڵمان رەنگی داوەتەوە، کاریگەری لەسەر عەقڵ و هۆش و هزر و شێوازی ژیانیشی هەیە.

دووەم: مەترسی عەلمانیەت و کاریگەری جووڵانەوەی بەڕۆژئاواییکردنی تاك و کۆمەڵگەی ئیسلامی، ئەمەش هەڕەشەیەکی جددییە لەسەر رۆشنبیری و رۆشنبیریەتی ئیسلامی بەگشتی و هزری ئیسلامی بەتایبەتی.

سێیەم: شێوازی میتۆدی و مەنهەجی تەقلیدی ئیسلامی و کەموکورتییەکانی، بەتایبەت دەستەوەستانی ئەم مەنهەجە تەقلیدییە لەبەرامبەر پێشکەشکردنی بەدیلێکی تر بۆ مەعریفەی ئیسلامی، کە لەئاست پێداویستی و داخوازییەکانی ژیاری و کۆمەڵایەتی ئوممەتی ئیسلام بێت لەم سەردەمەدا.

ئەم سێ خاڵە بریتین لە پاڵنەری سەرەکی دروستبوونی پڕۆژەی ئیسلامیەتی مەعریفە، کە هەموو تێکۆشانی ئەم قوتابخانەیە و پڕۆژە هزرییەکەی تایبەتە بە دۆزینەوەی چارەسەرێکی گونجاو بۆ ئەم سێ گرێکوێرەییەی دەستیان خستووەتە بینەقاقای ئوممەتی ئیسلام، بەهۆی ئەم قەیرانانەشەوە چەقبەستنێکی فرەلایەنە کۆی سێکتەرە کۆمەڵایەتی، زانستی، سیاسی، هزری، مەعریفی، حوکمڕانی، ئابووری، تەکنەلۆژی و ... هتدی لە وڵاتە ئیسلامییەکان گرتووەتەوە. دەستنیشانکردنی ئەم سێ خاڵە

وەك پێكهاتەی دەردی سەرەكی موسڵمانان، بە هەنگاوێكی یەكجار مەزن هەژمار دەكرێت، دواتر دیاریكردنی چارەسەر هەوڵێكی جددیترە بۆ لەبنهێنان و چارەسەركردنی دەردەكە. بەپووختی چارەسەری ئەم سێ كێشەیە لە دیدی رابەرانی ئەم قوتابخانە هزرییە دەخەینەڕوو:

- **برگەی یەكەم: دوو فاقیی پەروەردە و فێركردن**

پرۆسەی پەروەردە و فێركردن لە جیهانی ئیسلامی بەسەر دوو جەمسەر دابەش بووە، دەكرێت ئەم دووجەمسەرییە بە دووفاقییەیەكی ترسناك هەژمار بكرێت و، ئەگەر چارەسەری بۆ نەدۆزرێتەوە، رەنگە لە داهاتوودا مەرگی یەكجارەكی هزری و مەعریفی نەوەكانی داهاتوو لەم وڵاتانە بەدوای خۆیدا بهێنێت.

ئەم دووجەمسەریە بریتییە لە دابەشكردنی پرۆسەكە بەسەر هەردوو بەشی خوێندنی ئایینی و خوێندنی گشتی، لەكاتێكدا كەرتی پەروەردەش بەسەر دوو لقی دیكە دابەش بووە، یەكەمیان گشتی، دووەمیان تایبەتی[1]. مێژووی ئەم دابەشكارییە لە وڵاتە ئیسلامییەكان بۆ سەردەمی محەممەد عەلی پاشا دەگەڕێتەوە، كە لە ساڵی (١٨٠٥–١٨٤٨)ی زایینی حاكمی میسر بووە. خوێندنی ئایینی بریتییە لە خوێندنی قوتابخانە ئایینییەكان و حوجرەی مزگەوتەكان، كۆلێژ و پەیمانگاكانی تایبەت بە زانستە ئیسلامییەكان. كۆڵەگەی ئەم جۆرە خوێندنە بریتییە لە زانستە

---

[1] الفاروقي، إسلامية المعرفة، ص٥٨.

تەقلیدییەکانی کەلەپووری ئیسلامی وەك (نەحو، سەرف، بەلاغە، فیقه، ئوسولٚ فیقه و... هتد) ئەم زانستانەش بریتین لە سەرچاوەی هزری و مەعریفی، هەروەك چۆن بریتین لە سەرچاوەی ئیلهامی دید و بۆچوون و جیهانبینی سەرجەم کادیر و بیرمەند و پێشەوایانی جیهانی ئیسلامی دەرچووی ئەم جۆرە خوێندنە تەقلیدیانە.

بەشی دووەمی خوێندن بریتییە لە کەرتی گشتی پەروەردە، ئەمەش خۆی لە وەزارەتی پەروەردە و خوێندنی باڵا و دامودەزگا پەروەردەیی و زانستییەکانیان دەبینێتەوە. ئەم کەرتە بە چەند تایبەتمەندییەك لە جۆری یەکەم (خوێندنی ئاییني) جیادەکرێتەوە، گرنگترینیان پەروەردەیەکی عەلمانی دوور لە دینە، لە باشترین دۆخدا بریتییە لە کۆپی پەروەردەی یەکێك لە وڵاتە رۆژئاواییەکان، لەکاتێکدا یەکێك لە بنەما میتۆدییەکانی پەروەردە و فێرکردن لە رۆژئاوا، فەلسەفەی هێلینی و ئیغریق و رۆمانە، کە بەهیچ شێوەیەك لە سەردەمی مۆدێرن و جیهانگیرییدا، دان بە ئایین و بەها ئایینییەکاندا نانێت بە شێوەیەکی شایستە.

ئەگەرچی لە کەرتی گشتی پەروەردە و فێرکردن، وانەیەك بەناوی پەروەردەی ئیسلامی دانراوە، بەڵام نەك هەر لە ئاستی داخوازی و پێویستیدا نییە، بەڵکو لە گیانەڵادایە و هەبوونی لە نەبوونی نزیکترە.

بە ئەزموون سەلمێندراوە کۆپیکردنی پرۆگرامی پەروەردە و فێرکردن لە رۆژئاواوە بۆ رۆژهەڵات، دەرئەنجامی دڵخۆشکەری نەبووە، وەك ئەوەی سەدەی بیستەم لە تورکیا، میسر و یەمەن روویدا، دواهەمینیشیان لەدوای ساڵی ٢٠٠٧، تاقیکردنەوەی سیستەمی بەریتانی (ناسراو بە سیستەمی

سویدی) بوو لە کوردستان، بەڵام نەك هەر نەیتوانی جێگەی ئومێد بێت، بەڵکو خۆشی بووە دەردێکی تر بەسەر دەردە کەڵەکەبووەکان، ئەمەش لەبەر دوو هۆکار، یەکەمیان مەعنەوی و دووەمیان ماددی.

خاڵە مەعنەوییەکە بریتییە لە جیاوازی بارودۆخی هزری و مەعریفی نێوان رۆژهەڵاتی ئیسلامی و رۆژئاوای عەلمانی. پەروەردەی عەلمانی دوور لە دین، لە کۆمەڵگەی عەلمانی دوور لە دین، دەستکەوتی زۆری هەبووە و هەیە، بەڵام پەروەردەی عەلمانی و زەمینەی مەعریفی ئیسلامی وەك ئەوەی لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا هەیە، پارادۆکس و دووفاقییەی بەرهەمهێناوە، بۆیە ئەنجامی نەبووە.

سەبارەت بە خاڵی دووەم کە بابەتە ماددییەکەیە، پەروەردە رۆژئاواییەکە بنەما لەسەر ئامراز و کەلوپەلە ماددیە بەردەستەکانی رۆژئاوا دارێژراوە، وەك بینای دامەزراوە پەروەردەییەکان، جیاوازی هۆڵەکانی خوێندن، سنووردارکردنی ژمارەی خوێندکاران لە هۆڵەکان، کەلوپەلە پێویستییەکانی وەك کۆمپیوتەر و ئینتەرنێت و تاقیگە...هتد، کە سەتا دەشی لە وڵاتە ئیسلامییەکان بەردەست نین، بەراورد بە وڵاتانی رۆژئاوا.

کەواتە لەڕووی گەوهەری و رووکەشییەوە جیاوازی لەنێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوادا هەیە، بۆیە کۆپیکردنی پرۆگرامی رۆژئاوا بەم بارودۆخە ماددی و مەعنەوییە، بۆ وڵاتە ئیسلامییەکان گونجاو و تەندروست نییە، دەکرێت ئەم کرداری راگواستنە بە راگواستنی دارخورما لە نیشتمانی عەرەب بۆ کوێستانەکانی کوردستان بچوێنرێت. بەهۆی ژینگە و بارودۆخی جیاواز دارخورما هەرگیز لە کوێستانەکان ناڕوێت، بەهەمان چەشنیش پرۆسەی

کـۆپیکردن و راگواسـتنی مەنهـەجی پـەروەردەیی لـە رۆژئـاوا بـۆ وڵاتـە ئیسلامیەکان سەرکەوتوو نابێت.

یەکێکی دیکە لە کێشە بنـچینەییەکانی ئـەم کەرتـە گشتییەی خوێنـدن، بریتییە لە دابەشبوونی بەسـەر دوو جەمـسەری تـر، کـە ئـەوانیش خوێنـدنی گـشتی و خوێنـدنی تایبـەتن، نـەوەی خانـەوادە ئاسـایی و هـەژارەکان بـۆ خوێندنـە گـشتییە فەرامۆشـکراوەکە، منـداڵ و نـەوەی بـەرپرس و دەسترۆیـشتووەکانیش بـۆ خوێنـدنی تایبـەت و بـەپارە، خـودی ئـەم دابەشکارییەش هۆکارێکی ترە بۆ قووڵکردنەوەی کێشەکە، چونکە هەمیـشە لەسەر حیسابی کەرتی گشتی، زۆرتر گرنگی بە خوێنـدنی تایبـەت دەدرێـت، بەجۆرێك هەمیشە بەرپرسەکان لەبەر چاوی کاڵی منداڵـەکانیان بەبایەخـەوە لە خوێندنە ئەهلییەکە دەڕوانن، بەپێچەوانەی کـەرتی گـشتی پـەروەردە کـە بەشێوەیەکی مەترسیدار و بێ ئەندازە پەراوێزخراوە.

بیرۆکـەی یەکـەم کـۆنگرەی جیهـانی بـۆ پـەروەردەی ئیـسلامی کـە بـە کۆنگرەی مەککە ناسێندرا، بریتیبوو لە دیـاریکردنی کێـشەی پـەروەردە لـە سەرتاسەری جیهانی ئیسلامیدا، ناوەڕۆکی کۆنگرەکەش بـەکورتی بریتیبـوو لـەم چـەند بڕگەیـەی لەسـەرەوە ئاماژەمـان پێـدان، هـەر ئەمـەش بـووە چوارچـێوەی تیـۆری پـڕۆژەی ئیـسلامیەتی مەعریفـە، کـە دواتـر فـاروقی و هاوڕێکانی لە پەیمانگای جیهانی هزری ئیسلامی کاریان لەسەر دەکرد.

لە کۆنووسی کۆتایی کۆنگرەکـە بەتایبـەت لـە راسـپاردەکانیدا، بـەڕوونی ئاماژە بەوە دراوە کێشەی جیهانی ئیـسلامی لـە سـەدەی پـازدەی کۆچـیدا،

بریتییە لە کێشەی پەروەردە و پێویستە بەجددی و زۆر بەخێرایی چارەسەر بکرێت[1].

هیچ چارەسەرێکی تر جگە لە تێکهەڵکردنەوەی هەردوو کەرتەکەی پەروەردە لەئارادا نییە، بەشێوەیەك هەموو سیستەمی پەروەردە بکرێتە یەك سیستەمی گشتگیر و سەرجەم وزە ماددی و مرۆییەکانی لەپێناودا خەرج بکرێن، هەروەها لە دارشتنەوەیدا رەچاوی بنەما و بەها و رێسا ئیسلامییەکان بکرێت، لەپاڵ گرنگیدانێکی تەواو بە زانستە ئەزموونی و پراکتیکییەکان، خودی بنبڕکردنی ئەم دابەشکاریەش (خوێندنی ئیسلامی و خوێندنی گشتی _عەلمانی) کلیلی چارەسەرە.

تێکهەڵکێشکردن و کارکردن بە مۆدێلێکی نوێی پەروەردە کارێکی ئێجگار قورسە و، چاکسازی لە پرۆگرامی خوێندنی ئایینی و خوێندنی گشتی تەنها بە تێکهەڵکردنەوەیان بەدی نایەت، چونکە بناخەی فەلسەفی و هزری هەردوو جۆری خوێندنەکە تاوەکو سەر ئێسقان لەیەك جیان، یەکەمیان هەڵقوڵای هەناوی ئایینە، دووەمیشیان بەرهەمی فەلسەفەی خوانەناسی رۆژئاوایە، واتە دژەوانەن و بەتووندی تێکدەگیرێن، بەواتایەکی تر لە کرۆك و گەوهەردا خاڵی هاوبەشیان نییە، تاوەکو بە تێکەڵکردنەوەیان قەیرانەکە چارەسەر بکرێت. رابەرانی ئیسلامیەتی مەعریفە، فاروقی و هاوڕێکانی، بەپێویستی دەزانن بەرنامەیەکی فێرکاری و پەروەردەیی نوێ ئامادە بکرێت، کە پێکهاتە و ناوەڕۆکی پرۆگرامەکە بەشێوەیەك داڕێژرابێ، هەردوو کەرتەکەی خوێندن لەخۆبگرێت.

---

[1] بروانە: عبدالرحمن حبنكة الميداني، غزو في الصميم، بيروت: دار القلم، ط١، ١٩٨٢م، ص٢٥٩ .

واتە پڕۆگرامی نویّ بەشێوەیەك ئامادە بكرێت، كۆكەرەوەی رێسا و یاسا و بەها باڵاكانی ئیسلام و، فەلـسەفە و دیـدە هـزری و مەعریفییەكـەی بێـت، لەپاڵ گرنگیدانی تەواو بە سەرجەم زانستە سەردەمییەكانی رۆژئاوا. بەمەش تـاكێكی شـارەزا لـە ئیـسلام و زانـستی سـەردەم پـەروەردە دەكرێـت، كـە بەشـێوەیەكی تەندروسـتانە بتوانێـت زانـستە ئیـسلامییەكان و زانـستە ئەزموونییەكان تێكهەڵێكێش بكات، ئینجا بەگەڕیان بخات، بەشێوەیەك ببێتە جێبـەجێكردنی سـیّ بـەها باڵاكـەی ئیـسلام (یەكتاپەرسـتی، تەزكییـە و پاڵفتەكردنی دەروون، ئاوەدانكردنەوەی زەوی).

خودی پڕۆژەی تەكامولی مـەعریفی بـۆ رەتكردنـەوەی تێكهەڵكێـشیە لـە نێوان هەردوو كایە پەروەردەییەكـە (ئـایینی و عـەلمانی) بـەم پێكهاتەییـەی ئێستا، چونكە ناكرێت دوو دژەوانە لەیەك كایەدا كۆبكرێنەوە. لەبری ئەمـە، وا باشترە خـودی دووفاقییەكـە لەڕێگـەی هـەردوو پڕۆسـەكە رەتبكرێتـەوە، بـەئامانجی بینـاكردن و كـاركردن بـە سیـستەمێكی دیكـەی فێركـاری، كـە هـەردووكیان لـەخۆبگرێت و پـشتئەستوور بێـت بـە فەلـسەفەی ئیـسلامی و ئامـادەیی زانـستە ئەزموونییـەكان بـە باگراونـدێكی ئیـسلامییەوە، واتـە هەڵوەشاندنەوەی سیستەمە كۆنەكان، ئینجا بیناكردنی سیستەمێكی تـازە، بەجۆرێك سەرجەم وزە ماددی و مرۆییەكانی تێدا بەكاربهێندرێن[1].

مێژووی تەكامول بەم تێگەیشتنە، لەڕووی هزری و كردارییەوە دەكەوێتە دوای دەسـتپێكردنی پـڕۆژەی ئیـسلامیەتی مەعریفـە و، دوای هەوڵـدان بـۆ

[1] الفاروقي، إسلامية المعرفة، ص٦٥.

چاکــسازیکردن لــە خوێنــدنی ئایینیــدا، لەڕێگــەی زیــادکردنی زانــستە کۆمەڵایەتییە سەردەمییەکان بەبێ دەستکاریکردنی بنەما فەلسەفییەکەیان بــۆ خوێنــدنی ئــایینی، لەکاتێکــدا ئــەم زانــستە کۆمەڵایەتییانــە لەســەر فەلسەفەیەکی ڕۆژئاوایی خوانەناس ئامادەکرابوون.

لەلایــەکی تــر، پڕۆســەی چاکــسازیکردن لــە پــەروەردەی گــشتی تــەنها بریتیبوو لە زیادکردنی چەند وانەیـەکی ئیـسلامی بـۆ پڕۆسـەی پـەروەردە و فێرکردن، وەك ئەوەی فەزل رەحمان، وەزیـری پـەروەردەی پاکستان دوای کۆنگرەی مەککە لە وڵاتەکەی ئەنجامیدا.

بەبۆچــوونی رابــەرانی ئــەم چاکــسازییە، تــەنها بــە زیــادکردن و ئــەم تێکهەڵکێشکردنە کێـشەی پـەروەردە و فێرکـردن کۆتـایی دێـت و چارەسـەر دەبێت، بەڵام بە ئەزموون و کردار سەلمێندرا بەبێ دەستکاریکردنی بناخەی فەلسەفیی زانستە ئەزموونییـەکان، هـیچ هـەوڵێکی تـەواوکاری و یـەکانگیری سـەرکەوتوو نابێـت، بەمـەش کێـشەکە نـەك هـەر چارەسـەر نابێـت، بگـرە قووڵتریش دەبێتەوە، کوردەواری گوتەنی: لە قەل بووین و لە کۆتریش.

- **برگەی دووەم: مەترسی پرۆسەی بە رۆژئاواییکردن**

بنــەما بنــچینەییەکانی تێــزە مــەعریفی و هزرییــەکانی عــەتتاس لــەبارەی پــڕۆژەی ئیــسلامیەتی مەعریفــە، بــریتین لــە خــستنەڕووی مەترســییەکانی مۆدێرنە و بەڕۆژئاوایکردنی جیهان بەگشتی و جیهـانی ئیـسلامی بەتایبـەت، عــەتتاس هــەوڵی جووڵانــەوە و رابــەرانی مۆدێرنــە (نوێخوازەکـان) لــە وڵاتــە ئیسلامییەکان، بە سەرەتای کرداری ریشەکێـشکردنی کەلـەپووری مـەعریفی ئیسلامی هەژمار دەکات.

ئـەو پێیوایـە کـۆی کەلـەپووری مـەعریفی و هـزری ئیـسلامی لـەژێر مەترسـییەکی زۆر ترسـناکدایە، کـە بـە سـتراتیژ و پلانێکـی تۆکمـە بـەرەو ریشەکێشکردنی کەلەپووری ئیسلامی هەنگاو دەنرێـت. مـۆدێرنیزم خەریکـە پێشەنگایەتی هزری و رۆحی رۆژهەڵاتی ئیـسلامی دەگرێتەدەسـت و، رۆژ بـە رۆژ کەلـەپووری مۆدێرنـە و مـۆدێرنیزم زلـتر و زەبـەلاحتر دەبێـت، کـۆی چـالاکییەکانی ئـەم رەوتـە عەلمانییـە رۆژئاواپەرسـتە، کـە لـە بنەڕەتـدا رۆژهـەڵاتین و خۆیـان بـە فریـادڕەس و ریفۆرمخـوازی ئـایینی سـەردەم هەژماردەکـەن، خزمـەت بـە نـەیارانی ئیـسلام دەکـەن و، سـەرجەم هـەوڵ و کارەکانیـان ئـەنجامێکی دڵخۆشـکەریان نـەبووە و هەمیـشە سەرچـاوەی دیدلێڵی و ژاوەژاوی هزری و رۆحی و مەعریفین.

عەتتاس هەوڵەکانی هەوادارانی مۆدێرنە، بـە ئاراسـتەی ریشەکێـشکردنی کەلەپووری ئیسلامی و کەمکردنـەوەی کاریگەرییـە هـزری و مەعریفییەکـەی بەڕۆژئاواییکردنی مەعریفە (تغریب المعرفـة) نـاوزەد دەکـات، بۆیـە دووبـارە کاراکردنەوەی کەلـەپووری مـەعریفی ئیـسلامی، بـە هێنانەپێـشەوەی دیـد و تێڕوانینە فەلسەفییەکەی بۆ بوون و گەردوون، لەپاڵ جیهـانبینیی ئیـسلامی لـەبارەی پرسـە کۆمەڵایـەتی و مرۆڤایەتییـەکانی رۆژگـار، بـە تاکـە رێگـەی شکستپێهێنانی هەڵمەتی بەڕۆژئاواییکردنی جیهانی ئیسلامی هەژمار دەکات.

بەگوێرەی ئەو بار و گوزەرانە هزری و مەعریفییەی لەم رۆژگارەدا رۆژئاوا تێیـدا گـوزەر دەکـات، عـەتتاس شـیکردنەوە بـۆ بنـچینە فەلـسەفییەکانی عەلمانیـەت دەکـات، بـەئامانجی روونکردنـەوەی پۆخڵـەواتی فەلـسەفەی

عەلمانیەت و جیهانبینییەکەی، لەپاڵ مەترسی و کاریگەرییە خراپـەکانی بـۆ سەر هزر و مەعریفەی تاك و کۆمەڵگەی ئیسلامی.

لەچوارچـــێوەی گەنگەشـــەی تێزەکـــانی تایبـــەت بـــە مۆدێرنـــە و بەڕۆژئاواییکردن، عەتتاس ئاماژە بە جیاوازییـەکی ریـشەیی دەدات لـەنێوان عەلمەنـە و عەلمانیـەت، ئـەو پێیوایـە عەلمانیـەت دیـدێکی داخـراوە و لـە کۆمەڵێك بەهای رەها پێکهاتووە، کـار لەسـەر گرنگـی و هـەژمارکردنی مـرۆڤ دەکـات وەك چـەقی گـەردوون و خـاڵی بـاڵا دەیناسـێنێت، بەپێـچەوانەوە، عەلمەنـــە پرۆســـەیەکی بێکۆتـــا و بێـــسنوورە، ســـەرجەم بـــەها و دیـــد و بۆچوونەکان خزمەتی دەکەن و دەکرێت هەمیشە چاوی پێدا بخشێندرێتەوە، بـەو ئامانجـەی بـەردەوام لـە گـۆڕان و گەشەسـەندندا بێـت، واتـە بـەپێی بەرژەوەندییەکانی رۆژگار، لەبارەی جیهان و بوون و گـەردوون بڕیـار لەسـەر بەها و دید و تێڕوانینەکانی دەدات[1].

عـــەتتاس تـــەنیا بـــە رووکەشـــی ناڕوانێتـــە دیـــدی مۆدێرنـــە و تێـــزە فەلسەفییەکانی، بـەڵکو زۆر بـەقووڵی و هۆشـیارییەوە شـیکاریان دەکـات و، ئامـــانج و خاڵــە ترســناکەکانیان دەخاتــەڕوو، بەتایبــەت ئــەو بابەتانــەی پەیوەندیدارن بە داشۆرینی سروشت لـە واتاکـانی و بانگەشـەی رزگـارکردنی

---

[1] سيد محمد نقيب العطاس، مفهوم التعليم في الإسلام: إطار تصوري لفلسفة إسلامية للتعليم، ترجمة: حسن عبدالرزاق النقر، كوالالامبور: المعهد العالمي للفكر والحضارة الإسلامية، ١٩٨٩م، ص ٢٦. هەروەها: العطاس، مداخلات فلسفية في الإسلام والعلمانية، ترجمة: محمد الطاهر الميساوي، كوالالامبور: المعهد العالمي للفكر والحضارة الإسلامية، ٢٠٠٠م، ص٤١ وما بعد.

سیاسەت لە ئایین و، داماڵینی پیرۆزی لـە بـەهاکان. نـاوبراو، ترسـناکی ئـەم بانگەشانە و هاوشێوەکانی لە چەند خاڵێك کورتدەکاتەوە، گرنگترینیان:

**یەکەم**: ململانێی ئایینی مەسیحیەت بەرامبەر عەلمەنە و پێنەوێرانی، کـە سـەرەنجام مەسـیحیەتی ناچـارکرد هـەوڵی نێوبـژیوانی و ئاشـتەوایی لەگـەڵ عەلمەنە بدات، ئەم پرۆسەیەش بووە داڕووخانی خودی ئـایین لـە رۆژئـاوادا، سـەرەنجام دەبێتــە داڕووخــانی بیروبــاوەڕی تــاك بەرامبــەر ئایینەکـەی و پیرۆزییە رۆحییەکانی.

**دووەم**: مرۆڤـی رۆژئـاوایی هەمیـشە وا دەڕوانێتـە هـزر و کولتوورەکـەی، وەك ئـەوەی تـەنیا بـریتی بـن لـە بەرهـەم و تاکـە دەرچـەی شارسـتانیەت و کولتــوورە مرۆییــەکان، لــەپاڵ تێـڕوانینی بـۆ ئـەزموونی تایبــەت و ئاســتی هۆشیاری خـۆی، بەشـێوەیەك شـیکاریان دەکـات کـە هـزر و کولتوورەکـەی بـریتی بـن لــە لووتکــەی پێگەیـشتن و تێگەیـشتن، بــەجۆرێك هــیچ تــاك و کۆمەڵگەیەکی تر پێی نەگەیشتبێت.

**سێیەم**: جووڵە و رۆحی توێژینەوە زانستی و تەکنەلۆژییـەکانی رۆژئـاوا و شارستانیەتەکەیان، ئەو کاتە گەشەی سـەندووە کـە دەسـتبەرداری ئـایین و ئایینداری بوون.

هەرکاتێك ئەم سێ بڕوایـە لای خـودی مـرۆڤ چ وەك تـاك یـان کۆمەڵگـە دروست بوون، ئەو کاتە دیـد و تێـڕوانینی بـۆ بـوون و گـەردوون و بوونـەوەر دەگۆڕێت. لەڕێگەی باوەڕهێنان بەم تێزانە، سەرەتا مرۆڤ ئـەو بـاوەڕەی بـۆ دروست دەبێت کە هیچ شتێك پیرۆز نییە، بەڵکو مرۆڤـەکان تـەنها لەڕێگـەی وەهمەوە پیرۆزییـان بەبـەر لایەنـە رۆحـی و رەفتارییەکانـدا کـردووە، دواتـر

باوەڕ بەوە دەهێنێت ئـەوەی ڕۆژئـاوا پێـی گەیـشتووە، جـوانترین بەرهـەمی مرۆڤایەتییە، بۆیە پێویستە کۆمەڵگە بە مەمنوونییەوە بچێتە سەر ڕێـچکەی ئەوان، هاوکات جگە لە جوانییەکانی شارستانیەتی ڕۆژئاوا هـیچ شـتێکی تـر نابینێت و لە ئاست کەموکوڕییەکانی شارستانیەتی ڕۆژئـاوا سـڕ دەبێـت. لـە سێیەم وێستگەدا بیروباوەڕی بەرامبەر ئایین ئـاوەژوو دەبێتـەوە، ئـەوکات وا دەڕوانێتــە ئــایین کــە سەرچــاوەی دواکــەوتن و ڕێگریکردنــە لــە زانــست و تەکنــەلۆژیا و پێـشکەوتن، بۆیــە لەدیــدی ئــەو، ڕیشەکێـشکردنی ئــایین و بەهاکانی دەبێتە کارێکی پێویست و لەپێشینە.

لە بواری پڕاکتیکی هزری و مەعریفیدا، ڕۆژ بە ڕۆژ باوەڕی تاکی موسڵمان بۆ باوەڕکردن بـەم خاڵانـەی سـەرەوە دەگۆڕێـت، دواتـر دەبێتـە یـەکێك لـە بانگەشەکارانی بێبەهاکردنی ئایین و، پێیوادەبێت ئایین هیچ بەهایەکی نییە، هـــەر بەمـــەش ناوەســـتێت، بـــەڵکو لەکۆتاییـــدا ئـــایین بـــە سەرچـــاوەی نەهامەتییەکانی مرۆڤایەتی دەبینێت[1].

هەنـدێ لـە شـوێنکەوتووانی ئـەم بیرۆکـە پووچـانە، ئـەو باوەڕەیـان بـۆ دروست بووە فەرامۆشکردن و دەستبەرداربوونی ئـایین کلیلـی پێـشکەوتن و زانستە، ئەمەش ترۆپکی داڕووخان و بێمتمانەییە بەرامبـەر بـە خـود، دواتـر شوناسی ئـاییني و هـزری و مـەعریفی، چـونکە بەشـێك لـە وڵاتـانی ئاسـیا و ئـــەفریقای ناوەڕاســـت و ئـــەمریکای لاتـــین وەك دەوڵـــەت و دامـــەزراوە دەســـتبەرداری ئـــایین بـــوون، کەچـــی لـــە زۆنگـــاو و زەلکـــاوی نـــەفامی و

---

[1] بڕوانە: سيد محمد نقيب العطاس، مداخلات فلسفية في الإسلام والعلمانية، ص ١١٥ وما بعد.

دواکەوتوویی زانستی نغرۆ بوون و، نەیانتوانیوە هەنگاوێك بەرەو پێشکەوتن بهاوێژن.

بۆیە پرۆژەی ئیسلامیەتی مەعریفە لە دیدی عەتتاس، زۆر بەجددی رێگریکردن لە پرۆسەی عەلمەنە و عەلمانیەت بە ئەرکی سەرەکی دەزانێت، هەروەها رەوت و شوێنکەوتووانی مۆدێرنە لەنێو موسڵمانان بە سەرچاوەی مەترسییەکی ئێجگار گەورە دەناسێنێت و، بەپێویستی دەزانێت لەرووی هزرییەوە بەرپەچیان بدرێتەوە، هاوکات لەرێگەی پرۆژەی ئیسلامیەتی مەعریفە تاك و کۆمەڵگە پەروەردە بکرێت، بەمەبەستی گێڕانەوەی متمانەی تاك بە خودی خۆی، دواتر بە شوناسە ئایینی و هزری و مەعریفییەکەی.

- **برگەی سێیەم: دەستەوەستانی پرۆگرامی تەقلیدی ئیسلامی**

شێوازی مەنهەجیەتی تەقلیدی ئیسلامی و دەستەوەستانی لەهەمبەر پێشکەشکردنی بەدیلێکی مەعریفی ئیسلامی، خاڵێکی ترە کە لەرێیەوە هەست بە پێویستی تەکامولی مەعریفی دەکرێت.

کاتێك شوێنکەوتووانی مۆدێرنە و پەروەردەکراوانی پەروەردەی عەلمانی بێدین، چواردەورەی ئایین و هزر و مەعریفەی ئیسلامیان گرت و هاوشێوەی گەلەکۆمەکێ شالاویان بۆ هێنا، پەیرەوکارە ئایینییەکان بەو مەعریفە و رۆشنبیرییە تەقلیدییە ئایینییە، دابڕاو لە هزر و مەعریفەی رۆژئاوا و پێشکەوتنە تەکنەلۆژی و زانستییەکانی سەردەم، چۆن دەتوانن بەرگەی ئەو شالاو و گەلەکۆمەکێیە بگرن!!!.

ئـەم دۆخـە نـەخوازراوە وادەخوازێـت بـەرەی سـێیەم بێتـە مەیدانـەوە، بـەجۆرێك لـە تـەواوی بـەهاكانی كۆمەڵگـە و دابونەریتـەكانی شـارەزابێت، هاوكات لە مەعریفەتی رۆژئاوایی سەردەمدا بەتوانا و دانا بێت. ئینجا هـەوڵی كاركردن بـە میتـۆدێكی بـەدیل بـدرێت لەڕێگـەی یـەكانگیریكردنی سـەرجەم ژانەرەكان، بەڵام بەبێ بایەخدانێكی زۆر بە نەوەیەكی لەم چەشنەی خـاوەن ئەم مەنهەجە بەدیلە، ناكرێت بەر بەو باهۆز و شاڵاوە بێبەزەییە بگیرێت.

لەكاتی لەدایكبوونی نەوەیەكی لەم چەشنە، زانستە ئەزموونییەكان لەپاڵ دانایی و زانیاری تەواو لەبارەی لایەنە رۆحییەكان هاوتەریب دەبـن، ئەمـەش بـەواتای تێپەڕانـدنی قـەیرانی هـزری و دووفاقییـەی پـەروەردەیی دێـت، قەیرانێكی لـەم چەشـنە كـە هـەڵگری رەهەنـدە كۆمەڵایـەتی و رۆشـنبیری و هزرییەكانە، دەیان ساڵە جیهانی ئیسلامی بەدەستییەوە گیرۆدە بووە[1].

ئەوەی جێگەی سەرنج و تێڕامانە، كۆنگرەی مەككە و كۆنگرەكانی دواتر، كە لەلایەن رابـەرانی پـەیمانگای جیهـانی هـزری ئیـسلامی رێكخـران، دوور و نزیـك رەخنـەیان لـەو مەنهەجـە تەقلیدییـەی عالـەمی ئیـسلامی و دامـەزراوە ئایینییەكان نەگرتووە، هەروەك ئەم مەنهەجـە تەقلیـد و زانـستە ئیـسلامییە تەقلیدییەكانیان بە بەشێك لەو قەیرانە مەعریفییە، یان بەشێكی سەرەكی لە قووڵكردنەوەی كێـشە هـزری و مەعریفییـەكان هـەژمار نـەكردووە، هـەروەها چۆن خۆیان لەقەرەی باسوخواسی تایبەت بە چاكسازیكردن لـەو مەنهـەج و زانستانە نەداوە، چاكسازیكردن لەو زانستانەشیان بە مەرجێكی سەرەكی بۆ

---

[1] بروانە: عبدالحمید أحمد أبو سلیمان، قضیة المنهجیة في الفكر الإسلامي، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، الدار العالمیة، ط١، ١٩٩٥م، ص٥ وما بعد.

**هەستانەوەی ئوممەت و پێشەنگایەتی جیهان و جێبەجێکردنی جێنشینایەتی و ئاوەدانکردنەوەی زەوی لەقەڵەم نەداوە.**

**کۆنگرەی مەککە و کۆنگرەکانی دواتر، تەنها مەترسییەکانی عەلمانیەت و ئەو بەهایانەیان گەنگەشە کردووە، کە هەڵگری شوناسی مەعریفی رۆژئاوایین و کاریگەری راستەوخۆیان لەسەر عەقڵ و ئاوەزی موسڵمانان هەیە.**

**عەبدولحەمید ئەبو سلێمان، لەنێوان رابەرانی پەیمانگای جیهانی هزری ئیسلامی، بە یەکەم توێژەر دادەندرێت هەستی بەو گرفتە مەنهەجی و مەعریفییە کردبێت، ناوبراو لە ساڵی (١٩٧٣)دا بەشێك لە تێزی دکتۆراکەی بە پرسی کەموکورتییە مەنهەجیە تەقلیدییەکەی جیهانی ئیسلامی تایبەت کردووە[1].**

**ئەبو سلێمان هەم لە تێزی دکتۆراکەیدا و هەم لە توێژینەوەکانی دواتریدا بەتایبەت لە توێژینەوەی (أزمە العقل المسلم)[٢]، ، گەشەی بەم تێزە مەعریفییە داوە و هەڵسەنگاندنێکی تۆکمەی بۆ کردووە، زۆرترین رەخنە و تێبینییەکانیشی ئاراستەی بناخەی مەنهەجی تەقلیدی ئیسلامی کردوون، کە خۆی لە زانستی ئوسوڵ فیقھ (أصول الفقه) دەبینێتەوە، جگە لەمە، چەند بابەتێکی پەیوەندیداری بە رەگی ئەدەبیاتی عەڵ و نەقڵ وروژاندوون.**

---

[1] تێزی دکتۆراکەی ئەبوسلێمان بەناونیشانی: النظرية الإسلامية للعلاقات الدولية: اتجاهات جديدة للفكر والمنهجية الإسلامية، ترجمه وراجعه وعلق عليه: د. ناصر البريك، الرياض، الناشر: المعهد العالمي للفكر الإسلامي: هرندون، فيرجينيا، الولايات المتحدة الأمريكية، ١٩٩٣.

[2] عبدالحميد أبو سليمان، أزمة العقل المسلم، ، الرياض: الدار العالمية للكتاب الإسلامي، ط١، ١٩٩٤، ص٧٠ وما بعد.

ڕەهەنـدی کـات لەسـەر فـەرموودەی پـەیامهێن و کردارەکـانی نێـو کەلـەپووری ئیـسلامی، بەشـێکی تـری تێـزە هـزری و مەعریفییـەکانی ئـەبو سلێمانن، کـە بەپێویـستی دەزانێـت بەشـێوەیەکی تەندروسـتانە مامەڵـەیان لەگەڵدا بکرێـت.

ئـەوەی جێگـەی سـەرنجی توێژەرانـە، ئـەبو سـلێمان، مەنهـەجی هـزری ئیسلامی تەنها لە زانستی ئوسولّ فیقـه کـورت دەکاتـەوە. بـەدیوێکی تـردا، کاتێك باسـی چاکسازیکردن لـە زانـستە ئیـسلامییە تەقلیدییـەکان دەکـات، ڕووی ڕەخنە تەنها دەکاتە ئەو زانستە، ئەمەش بەشێکە لە هەقیقەت، بـەڵام پێکهاتەی هەموو هەقیقەت نییە.

ئاشـکرایە هـزری ئیـسلامی تـەنها دەرهاوێـشتە و دەرەنجـامی زانـستی ئوسولّ فیقه نییـە، بـەڵکو هەریـەکێك لـە بوارەکـانی فەلـسەفە، سۆفیگەری (التصوف) و زانستی کەلام، سەرجەم دەرهاویشتە مەعریفی و هزرییەکانیان لەپالّ زانستی ئوسولّ فیقه، پێکهاتـەی هـزری ئیـسلامی پێکـدێنن، نـەك بـە تەنیا ئوسولّ فیقه.

ئەمەش ڕەخنەیەکی بەهێزە ئاراسـتەی باڵەخانـەی هـزری ئـەبو سـلێمان دەکرێت، لە نامەی دکتۆراکەیدا، ئـەبو سـلێمان ئەوەنـدەی زانـستی ئوسـولّ فیقه بەگشتی و بابەتی (القیاس) بەتایبەتی ڕەخنەباران دەکات، دوور و نزیك ڕەخنەی لە زانستەکانی تر نەگرتووە، ئەمەش کەلێنێکی مەعریفی گەورە لە دیاریکردنی (تشخیص) بناغەی پێکهاتـەی قەیرانـە هـزری و مەعریفییەکـەی جیهانی ئیسلامی دروست دەکات.

هۆکـــاری ســـەرەکی دوورەپـــەرێزی ئـــەبو ســـلێمان لـــەو زانـــستانە، جەختکردنەوەیەتی تەنها لەسەر زانستی ئوسولّ فیقه و بابەتی (القیاس)، ئەمەش رەنگە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە، بابەتی (القیاس) پێگەیەکی گرنگی لە بـواری دیبلۆماسـی و پەیوەندییـەکانی دەرەوەدا هەیـە، لەگـەڵ بنـەماکانی کۆمەڵناسی لە دیدی بیرمەندانی ئیسلامی، لەکاتێکدا گرنگی ئیستحسان و مەصلەحەی مورسـەلە بەتایبـەت لـە بـواری دیبلۆماسـی و پەیوەندییـەکانی دەرەوە و بابەتـەکانی وابەسـتەی کۆمەڵناسـی، هیـچی کـەمتر نییـە لـە (القیاس).

لەلایەکی تر، هەرکەسێك بەوردی بڕوانێتە پڕۆژە و تێزە مەنهەجییـەکانی پەیمانگای جیهانی هزری ئیسلامی، لەوە تێدەگات خاڵی جەوهەری پڕۆژەکە بریتی نییە لە جێهێشتن و رەتکردنەوەی بنەما تەقلیدییـەکانی مەنهەجیـەتی هزری ئیسلامی، کە زانستی ئوسولّ فیقه پشکی شێری بەردەکـەوێت، بگـرە پڕۆژەکەی پەیمانگا دوور و نزیك هەوڵی رووخاندن و تێپەڕانـدنی کەلـەپووری ئیسلامی و بنەما مەنهەجییەکانی نادات، بەڵکو چاکسازی و پێداچوونەوە، بە دەروازە و کلیلی چارەسەر دەزانێت لەبری رووخاندن و تێپەڕاندن.

لـــەپاڵ ئـــەم چاکـــسازییە، بانگەشـــەی دروســـتکردنی پەیوەنـــدی و بەیەکبەســـتنەوە دەکـــات لـــەنێوان زانـــستە کۆمەڵایەتییـــەکان و زانـــستە ئەزموونییەکان، لەگەڵ دید و تێڕوانینە گشتییەکەی ئیسلامی، ئەمـەش بـە پەراوێزخـستنی زانـستە تەقلیدییـە ئیـسلامییەکانی وەك ئوسـولّ فیقـه و زانستەکانی تر بەرهەم نایەت.

دوای شـیکردنەوەی هەرسـێ خاڵەکـەی سـەرەوە (دووفـاقیی پڕۆسـەی پـەروەردە، مەترسـییەکانی بـەڕۆژئاواییکردن، دەستەوەسـتانی مەنهـەجی تەقلیدی ئیسلامی) دەکرێت ببێتە دەروازەیـەکی سـەرەکی بـۆ چـوونە سـەر باسـکردنی سیـستەمی مـەعریفی لـە ئیـسلامدا، دواتـر شـیکارکردنی بنـەما گشتییەکانی تەکامولی مەعریفی بەدوای سیستەمی مەعریفیدا.

کە وابێت، ئامانجمان لە بەشی داهاتوودا، بریتی دەبێت لە شـیکردنەوە و روونکردنـەوەی پێکهاتـەی سیـستەمی مـەعریفی لـە هـزری ئیـسلامیدا، لـە روانگەی قوتابخانەی ئیسلامیەتی مەعریفە و پڕۆژەی تەکامولی مەعریفی.

# بەشی هەشتەم

# سیستەمی مەعریفی "النظام المعرفی"

سەرکەوتن و پێشەنگایەتی هەر گەل و هۆز و نەتەوەیەك پەیوەستە بە سێ سیستەم، هەرسێ سیستەمەکەش وابەستەی یەکن و کەموکوڕی و کەلێن لە هەریەکێکیان دروستببێت، هاوسەنگی تێکدەچێت، ئەمانیش بریتین لە: سیستەمی عەقیدەیی، سیستەمی مەعریفی و سیستەمی بەهاکان.

بەواتایەکی تر، (بیروباوەڕ، مەعریفە و بەهاکان) کلیل و دەستەبەری پێشکەوتنن، لە هەر کۆمەڵگەیەك باری ئەم سێ سیستەمە لاربێت، چارەنووس و داهاتوویان دەکەوێتە مەترسی، ئەم دابەشکارییە هەڵقوڵاوی ناخی قورئان بەگشتی و (سورەتی العصر)ـە بەتایبەتی[1].

گەلی موسڵمانان لەڕێگەی ئەم سێ سیستەمەوە توانییان لە پاشکۆیەتی و ونبوونی مێژوویی دەربچن و، پێشەنگایەتی جیهان بۆ ماوەی چەند سەدەیەك بگرنەدەست.

---

[1] محمود عايد الرشدان، حول النظام المعرفي في القرآن الكريم، مجلة إسلامية المعرفة، ع١٠، ص٩.

له چرکەساتی دروستبوونی کێشە لەم سێ سیستەمە، مەترسی کەوتە سەر پێشەنگایەتییەکەیان، سەرەنجام بەشێوەیەکی رێژەییانە هەرسێ سیستەمەکە لە ماوەی حەوت سەدە تووشی دارمان بوون، بەهەمان چەشن پێشەنگایەتی و ژیارستانی ئیسلامیش وەك دەرەنجام تووشی دارووخان هات.

عەلوانی لە یەکێك لە نووسینەکانیدا باسی کێشەی جیهانی ئیسلامی دەکات، کە بریتییە لە قەیرانی هزر، ئەویش یەکسانە بە کێشەی پەروەردە و فێرکردن. ئەو پێیوایە قەیرانی هزر کێشەی هەموو جیهانە نەك بەتەنها جیهانی ئیسلامی، بۆیە چارەسەرکردنیشی تەنها بە جەختکردنەوە لەسەر جیهانی ئیسلامی ناکرێت، بەڵکو پێویستی بە چارەسەرێکی ریشەیی جیهانییە، ئەمیش لەرێگەی مەنهەجی مەعریفی (**ا نهجية ا عرفية**) کە لەسەر بنەما قورئانییەکان بیناکرابێت[1].

لەم برگەیەدا ئاماژە بە پێکهاتەی نیزامی مەعریفی و بەشێك لەو گرفت و پشێویانە دەکەین، کە بەدرێژایی چەندین سەدە تووشیان بووە و پەکیانخستووە، لەپاڵ کۆمەڵێك دەرچە و چارەسەر کە خەمخۆران و توێژەران بۆ راستکردنەوە و سارێژکردنی برینەکان خستوونیانەتەروو.

ترسناکترین لادان کە بەدرێژایی چەند سەدەیەك تووشی سیستەمی مەعریفی موسڵمانان بووە، بریتییە لە پشێوی و لادانە عەقیدەییەکان، دواتر بۆ پەکخستنی ئیجتهاد و نوێگەری سەری کێشا. پاشان قۆناغی سێیەمی

---

[1] طه جابر العلواني، إصلاح الفكر الإسلامي بين القدرات والعقبات، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، الدار العالمية، ط٢، ١٩٩٤م، ص٤٩ وما بعد.

بەدواداهات، کە ئەمیش بریتییە لە بەدیهێنانی دووفاقی و دابەشکردنی مەعریفە و تێزە پەیوەندیدارەکان بە مەعریفەوە بەسەر هەردوو بەرەی مەعریفەی دینی و مەعریفەی عەلمانی بێدین. لە قۆناغی چوارەمدا کار گەیشتە دروستبوونی کێشمەکێشم لەسەر یەکلاییکردنەوەی بابەتەکان لەنێوان وەحی و ئیجتیهاددا، ئاخۆ کامەیان وەحییە، کامەیان ئیجتهادی مرۆییە؟

دەرەنجام سیستەمێکی دامەزراو لە سەر کێشمەکێشم و چەقبەستن و لاساییکردنەوە هاتەئاراوە، ئەویش دابەشبوونی ئەکادیمیست و بیرمەندانی بەسەر هەردوو بەرەی چەقبەستووان و ملنەدەران (الجامدون والجاحدون) لێکەوتەوە، بەتایبەت لە ناوەندەکانی پەروەردە و فێرکردن[1].

دەستەی چەقبەستووان باوەڕیان وایە، نەوەکانی رابردوو سەرجەم شتە باشەکانیان بۆ ئێمە روونکردووەتەوە و هەرچی پێویستمانە لە کەلەپووری ئەواندا هەیە، ئیدی شتێك نەماوەتەوە نەوەی نوێ دایبهێنێ، بۆیە هەر شتێك لەم سەردەمە لەڕووی خوێندنەوەی نوێ بۆ دەقەکانی قورئان، فەرموودە، شێوازی نوێی پەروەردە و فێرکردن و گوزەران دابێنێت، ئەوە لادەرە و بیدعەچییە، ئیدی ئەوەمان بەسە کە لە کەلەپوور بە میرات بۆمان ماوەتەوە.

دەستەی دووەم کە ملنەدەرانن، پێیانوایە بەرهەمی چەند ساڵەی جیهانی ئیسلامی کەڵکی ئێستای نەماوە، چونکە توانای بەرهەمهێنانی داخوازییەکان

---

[1] محمود عايد الرشدان، حول النظام المعرفي في القرآن الكريم، مجلة إسلامية المعرفة، ع١٠، ص١٠.

و نوێبوونەوەی نییە، بۆیە ئیدی كاتی تێهەڵدان و فەرامۆشكردنی كەلەپوور هاتووە، مەنهەج و پرۆگرامی ژیان و گەشانەوە و پێشكەوتن و نەشونما هەر لە رۆژئاوادا هەیە، بۆیە شوێنكەوتنی رۆژئاوا لە هەموو شتێكدا داخوازییەكی سەردەمیانەیە و كارێكی پێویستە.

لە دەرەنجامی دووفاقی و دووجەمسەری لەم چەشنە، زۆرجار هەردوو چەمكی (الأصالة والمعاصرة) یەكەمیان بۆ كەلەپوورییەكان و دووەمیان بۆ شەیدایانی رۆژئاوا بەكاردێت. بەكارهێنانی چەمكانێكی لەمجۆرە بێویژدانییەكی گەورەیە، تەنانەت لەكاتی بەكوردیكردنیشیان بێویژدانییەكی تر ئەنجام دەدرێت، كاتێك بە "كۆنەپەرستی و سەردەمی" گوزارشتیان لێدەكرێت.

لەهەمبەر گوزەرانێكی لەم چەشنە، بیرمەندی گەورەی جەزائیری (مالیك بن نەبی) ناو لەم دوو جۆر بیركردنەوەیە دەنێت، هزری مردوو و هزری مرێنەر (الأفكار المیتة، والأفكار الممیتة)[1].

ئەو پێیوایە هزری مردوو بریتییە لە گواستنەوەی هزر و قسە و كردار و حوكمە فیقهییەكانی نێو كەلەپوور بۆ ئێستا، ئینجا هەوڵدان بۆ بەرجەستەكردنیان لە زەمینەی كرداری، وەك خۆی بێ دەستكاریكردن.

سەبارەت بە هزری مرێنەر و بكوژ، "بن نەبی" پێیوایە خواستن و وەرگرتنی هزر و بەرهەم و كەلەپووری خەڵكانی تر كە نامۆیە بە كولتوور و كۆمەڵگەی تۆ، ئینجا هەوڵی بەرجەستەكردن لە زەمینەی كرداری

---

[1] مالك بن نبي، مشكلة الأفكار في العالم الإسلامي، دمشق: دار الفكر، ط١، ٢٠٠٢م، ص١٥٣.

کۆمەڵگەکەی خۆت بەبێ پاڵفتەکردن و هەڵاوێردکردن، بریتییە لە کردارێکی قاتیلانە، کە هزر و تواناکان دەکوژێت.

ئەم قسەیە هەردوو بەرەی چەقبەستووان و ملنەدەران دەگرێتەوە، چونکە یەکەمیان دەیەوێت کەلەپوور لەڕێگەی پیرۆزکردنەوە بەرجەستە بکات، دووەمیشیان مەبەستی بەرجەستەکردنی بەرهەمی رۆژئاوایە لەڕێگەی گەورەکردن و رازاندنەوە، کە ئەمیش بەشێوەیەك لە شێوەکان دەیەوێت پیرۆزکردن لە زەمینەی کرداری بچەسپێنێت.

ئەم پیرۆزکردنە هەم لەلایەن چەقبەستووان بۆ کەلەپوور و هەم لەلایەن رۆژئاواپەرستان بۆ مەعریفە و ژیارستانی رۆژئاوا، چارەنووسێکی خراپ بەسەر خەیاڵدان و ئاوەزی تاك و کۆمەڵگەی موسڵماناندا دەهێنێت. زۆرجار دەگوترێت یان کەلەپوورییەکان دەڵێن، فقیه تەنها بریتییە لە خوێندنەوە و بەرهەمی عەقڵی زانایان بۆ دەقە پیرۆزەکان، ئەمەش بەهیچ شێوەیەك پیرۆز نییە. هەروەها شەیدایانی مۆدێرنیزمی رۆژئاوا دەڵێن، لاساییکردنەوەی رۆژئاوا تەنها بۆ بەهرەمەندبوونە لە پێشکەوتن و ژیارستانیەتەکەیان، نەك بەپیرۆز سەیرکردن.

ئەگەر بەوردی و بابەتیانە بڕوانینە زەمینەی کرداری ئەم دوو بانگەشەیە، هەردووکیان تا ئاستێکی زۆر دوورن لە راستییەوە، چونکە بەکردەیی بەرهەمی زانایان لەلای کەلەپوورییەکان تا ئاستی دەقەکان پیرۆزکراوە، هەروەك بەرهەمی ژیارستانی رۆژئاوا لای ملنەدەران لە پێشەوەی هەموو شتی ترە بۆ کارپێکردن.

ئـەم راسـتییە ئـەوەمان بـۆ دەسـەلمێنێت، جیـا لـەوەی مامەڵـەکردنمان لەگەڵ بەرهەمی پێشینان، کەلەپوور لای چەقبەستووان و مامەڵەکردن لەگەڵ بەرهــەمی ژیارســتانی رۆژئــاوا لای ملنــەدەران، لــە جێگــەی خــۆی نییــە و ناتەندروســتە. هاوکــات ئاماژەیــەکی زۆر روونــە کــە هــەرەمی سیــستەمی مەعریفیمان تووشی دەردێکی کوشندە بووە و خەریکە گیان دەدات، ئەگـەر بەزوویی چارەسەر نـەکرێت پەتائاسـا دەردەکـە کوشـندەتر و زیانـەکان زۆر زیاتر و مەترسیدارتر دەبن.

دەکرێــت بگوترێــت موســڵمانان بــەزۆری یــان کەلەپوورپەرســتن یــان رۆژئاواپەرست، یەکەمیان پـشت لـە رۆژئـاوا و روو لـە کەلـەپوور بـەرەهایی، دووەمیش روو لە رۆژئـاوا و پـشت لـە کەلـەپوور بـەرەهایی. لـەم نێوەنـدەدا کەسـانێك بەپەشـۆکاوی خـەریکن کەلـەپوور و بەرهــەمی رۆژئــاوا شــەنوکەو دەکەن، بە ئامانجی ریفۆرم و هەڵێنجان و پاڵفتەکردن، بەڵام کاری ئـەوانیش تاوەکو ئێستا بەرهەمێکی دڵخۆشکەری نەبووە.

لێرەدا تەحەدا گەورەکە ئەوەیە، ئایا موسڵمانان دەتوانن کۆمەڵێك زانـای دووربین، چاونەترس، پڕویست، توانادار، خاوەن زانست و حیکمەت و دانایی بەرهەمبێنن، کە بتوانن گۆڕانکاری ریشەیی لـە مەنهـەجی مەعریفـە و هـزر و سیاسەت و کۆمەڵگەدا بکەن، بۆ رزگارکردنی مرۆڤایەتی لە داڕمان و بەرگرتن لە هەڵدێران و رۆیشتن بەرەو ئاقارە مەترسیدارەکان ؟!

نەك تەنها بـە قـسەی موسـڵمانان، تەنانـەت رۆشـنبیرە رۆژئاواییـەکانیش مەترسی داڕمان و لەنێوچوونی ژیارستانیەتی مرۆڤیان خستووەتەڕوو، ئەگەر

دووباره چاو به رێڕەوی ژیارستانی مرۆڤایەتی نەخشێندرێتەوە و کاروانی ژیارستانیەت نەخرێتەوە سەر رێچکەی دروست و کارنامەی تەندروست.

بۆیە پێویستە نەوەی چوارەم لەڕێگەی سیستەمێکی مەعریفی تۆکمە و مەنهەجێکی زانستی تەندروست بێتە پێشەوە، بەجۆرێك لەژێر مەرجەعیەتی وەحی مامەڵە لەگەڵ بەرهەمی کەلەپووری خۆماڵی و ژیارستانیەتی رۆژئاوا بکەن، هەروەها بەدڵسۆزییەوە کار بۆ بیناکردنی ژیارستانیەتێکی نوێی دروستی تەندروست بکەن.

نامانەوێت زیاتر کەلێنەکانی سیستەمی مەعریفی موسڵمانانی ئەم سەردەمە دەستنیشان بکەین، چونکە تەنها لەڕێگەی خستنەڕووی سیستەمی مەعریفی تەندروست لەژێر چەتر و هەژموونگەرایی قورئان، خوێنەر دەتوانێت هەڵسەنگاندن بۆ سیستەمەکانی تر بکات و کەلێنەکانیان دەستنیشان بکات.

بەکورتی و پوختی، دوای دیراسەکردن و لێکۆڵینەوە و تێڕامان، سیستەمی مەعریفی قورئانی و رەهەندەکانی لەم چەند دێڕەی خوارەوە رێنووس دەکەین، بەئومێدی پاڵفتەکردن و هەڵکێشانی هەڵەکان لە سیستەمی بیرکردنەوەمان، هەروەها پڕکردنەوەی کەلێنەکان بە خشت و کەرەستەی پێویست.

سیستەمی مەعریفی قورئانی لە سێ بەش پێکدێت: القضية، الغاية، الأركان[1]، ئەمانیش لە چەند خاڵێك دەخەینەڕوو:

---

[1] بروانە: محمود عايد الرشدان، حول النظام المعرفي في القرآن الكريم، مجلة إسلامية المعرفة، ع١٠، ص٤٢–٤٣.

**یەکەم: قەزیە و ئامانجەکان**، گرنگترین قەزییەکان لە قورئاندا دوانن، ئەمانیش بریتین لە: ڕەتکردنەوەی **هاوبەشپەرستی** و جەختکردنەوە و چەسپاندنی یەکتاپەرستی لەسەر ئاستی گشت بوارەکان، (ڕەتکردنەوەی **هاوبەش** پەیداکردن، چەسپاندنی تاقانەپەرستی).

گرنگترین ئامانجەکانی قورئانیش دوانن، ئەمانیش: ئازادکردنی عەقڵ و **هۆش** و ویستی مرۆڤ، لەپاڵ پاراستنی پێنج مەبەستە گشتگیرەکەی ئیسلام کە بریتین لە (پاراستنی ئایین، عەقڵ، نەفس یان ژیان، ناموس و سەروەت)، واتە (ئازادکردنی عەقڵ و پاراستنی مەبەستە باڵاکان).

**دووەم: چۆنیەتی بیناکردنی سیستەمی مەعریفی**، بیناکردنی سیستەمێکی مەعریفی گشتگیر و کامڵ و فرەلایەن، لەڕێگەی تێکهەڵکێشکردن و ئاوێتەبوون لەنێوان ناسینی بەدیهێنەر، هاوڕێ لەگەڵ ناسینی بەدیهێنراو، **هەروەها** وەڵامی زانستیانە و قورئانیانەی ئەم پرسیارە، کێ دروستکەری بەدیهێنراوە و چۆن دروستی کردووە؟ بەواتایەکی تر، ئەم سیستەمە لە دەورەی سێ تەوەر دەخولێتەوە: خودا، گەردوون و مرۆڤ.

لەڕاستیدا چەسپاندنی یەکتاپەرستی لە بیروباوەڕ، هزر، پەیڕەوکردن، کارنامەی ژیان و کردار بەرهەم نایەت، مەگەر لەسەر سیستەمێکی مەعریفی دامەزراو لەسەر تەوحید لەنێوان **هەموو** جۆرەکانی مەعریفە نەبێت. **هەروەها** کۆتاییهێنان بە دووجەمسەری و دووفاقییەی نێوان زانستەکان، زانستە مرۆڤایەتی و زانستە ئەزموونییەکان، زانستە دەروونی و زانستە کۆمەڵایەتییەکان، زانستە گەردوونی و زانستە سروشتییەکان، زانستە شەرعییەکان و زانستەکانی تر ئامانجەکە دەپێکێت.

لەلایەکی تر سیستەمی مەعریفی قورئانی وادەخوازێت، جیاکاری نێوان باوەڕ و زانست و جیاکردنەوەیان لە کردەوەی چاك لەبەین ببرێت.

لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا ناکرێ زانای بێ هیدایەت، یان هیدایەتدراوی بێ زانست، یان قسەی بێ کردار و کرداری بێ قسە، یاخود زانای هیدایەتدراوی بێ کاری چاك هەبێت.

تەوحید لە قورئاندا بریتییە لە سیستەمی مەعریفی، سیستەمی مەعریفی قورئانیش بریتییە لە سیستەمی تاقانەپەرستی و تەوحیدی، بۆیە تەوحید مەعریفە و زانستە، مەعریفە و زانستی راستەقینەش هیدایەت و تەوحیدن.

**سێیەم: پایەکان**، پایەکانی سیستەمی مەعریفی قورئانی سێ دانەن: باوەڕ، زانست و کردار.

هەر لەسەر ئەم سێ پایەیەش سیستەمی پەروەردە و فێرکردنی ئیسلامی دەوەستێت، کە بریتییە لە بەردی بناخەی دامەزراندنی کۆمەڵگە و دەوڵەتی ئیسلامی، نەك تەنها بۆ موسڵمانان و لەپێناو ئەواندا، بەڵکو لەپێناو رزگارکردنی سەرجەم مرۆڤایەتی، ناکرێت مرۆڤایەتی چاك و چاکەخوازبن، بەبێ چاکبوون و چاکەخوازی موسڵمانان.

**چوارەم: رەهەندەکان**، بەکورتی سیستەمی مەعریفی لە ئیسلامدا هەڵگری چوار رەهەندی سەرەکییە، ئەمانیش رەهەندەکانی: وەحی، گەردوون، عەقڵ و مێژوو. ئەم چوار رەهەندە بە کارلێککردن لەگەڵ هۆش، مادده، تەفسیر، تەئویل و رووداوەکان بە لەبەرچاوگرتنی کات و شوێن کۆی سیستەمەکە کامڵ دەکەن.

**مەعریفە ڕێگەی ناسین و ئاشنابوونە، ناسین و ئاشنابوونیش بریتین لە ڕێگەی ئەنجامدانی کردار، کرداریش دەروازەی سەرەکی هەڵسەنگاندنی هەڵوێست و ڕاستکردنەوەی هەڵەکانە. بەمشێوەیە پەروەرێن دەبێتە چەق و سەرچاوەی گشت کار و چالاکی و ڕووداو و پێشهاتەکان، دەرەنجام هاوکێشەیەکی لەم چەشنە بەرهەمدێت: (خودا، کاری خودا، گەردوون، ناسین و ئاشنابوون بە کاری خودا، ناسینی خود، کاری خود، هەڵسەنگاندنی کارەکانی خود لەڕێگەی فەرمایشتەکانی خودا).**

**ئەم هاوکێشەیە بەرهەمی سێ فەرمایشتی پەروەرێنە، کە ئەمانەن:**
﴿سَيُرِيكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ فَتَعۡرِفُونَهَاۚ﴾ النمل: ٩٣، ﴿وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ﴾ الحجرات: ١٣، ﴿وَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمۡ﴾ التوبة: ٩٤.

**واتە: "پەروەرێن نیشانە و بەڵگەکانتان پێ نیشاندەدات و ئاشنایان دەبن"، "ئێمە، ئێوەمان کردووەتە چەند گەل و هۆز و تیرەیەك بۆئەوەی ئاشنایەتی لەگەڵ یەك پەیدا بکەن"، "پەروەرێن بینەری کار و کردەوەکانتانە".**

**سیستەمی مەعریفی وەك بابەتەکانی تر یەکجار فراوانە، ئەگەر بمانەوێت تێکڕای خاڵەکانی شی بکەینەوە و بەدوورودرێژی باسی بکەین، پێویستمان بە چەند پەرتووکێك دەبێت، لێرەدا ئاشنابوون بە پێکهاتەی سیستەمی مەعریفی ئیسلامی بەسە بۆ ئاشنابوون و چوونە نێو تێز و کۆباسەکانی تەکامولی مەعریفی، بۆیە خاڵێك لە کۆتایی بابەتی سیستەمی مەعریفی دادەنێین و لە بەشی داهاتوودا بنەماکانی تەکامولی مەعریفی شیکار دەکەین.**

# بەشی نۆیەم
# بنەما گشتییەکانی تەکامولی مەعریفی

باسکردنی هەر بابەتێك بەبێ قسەکردن لەبارەی بنەما گشتییەکانی، کۆسە و لەنگ دەردەچێت، بۆیە لەم خاڵەدا هەڵوەستەیەك لەسەر بنەما سەرەکی و گشتییەکانی بابەتی تەکامولی مەعریفی دەکەین.

بەردی بناخەی تەکامولی مەعریفی بریتییە لە یەکتاپەرستی (التوحید). ئەو تەوحیدەی وەك بنەمای سەرەکیی تەکامول دەناسێنرێت، تەنها بریتی نییە لە بابەتێکی عەقیدەیی وشك کە پێویستی بە شیکارێکی ورد و قووڵ هەبێت وەك ئەوەی لە زانستی عەقیدە و زانستی کەلام باس دەکرێت، بەڵکو یەکتاپەرستی (التوحید) لە دیدی قوتابخانەی ئیسلامیەتی مەعریفەوە چەند رەهەندێکی مەعریفی ریشەیی هەن و کاریگەری راستەوخۆی بەسەر کۆی لایەنە هزری و مەعریفییەکانەوە هەیە. تەوحید نەك بەتەنیا لە بابەتی تەکامول، بەڵکو کاریگەرییەکانی لە هزر، مەعریفە، فەلسەفە، ئەخلاق، مێژوو، زانستە کۆمەڵایەتییەکان و بەراوردکردنی ئایینەکاندا دەردەکەوێت.

بۆ مرۆڤـی موسـڵمان، ناکرێـت تەوحیـد لـە هـیچ کایەیـەکی مـەعریفی و زانستی دابېڕێت، بەڵکو پێویستە وەك پێوەرێك بۆ هەڵسەنگاندنی گشت کـار و چالاکییەکان هەژمار بکرێت. فاروقی لە نووسینەکانیدا هەمیشە جەخت لە ڕۆڵ و گرنگـی تەوحیـد دەکاتـەوە، ئەگـەر بگـوترێ خـاڵی گەوهـەری کـۆی نووسینەکانی فاروقی بریتییە لە تەوحید، گریمانەیەکی دروست دەردەچێت.

ئەو پێیوایە جیا لـەوەی تەوحیـد بابـەتێکی ئایینییـە و تێیـدا خـودا وەك چەقی گەردوون دەناسـێنرێت، هـەروەها دیـدێکی گشتیـشە بـۆ حەقیقـەت و جیهان، نەك تەنیا بۆ گەردوونی ماددیی بەرچاوکەوتووی مرۆڤ، بەڵکو بریتییە لە بنچینەی بیرکردنەوی مرۆڤ بەرامبەر بوونەوەر، ژیان و مێـژوو بـە هەرسـێ بەشی رابردوو، ئێستا و داهاتوو.

چـەند بنەمایـەك هـەن دەرەنجـام و ڕەنگدانـەوەی تەوحیـد پێکـدێنن و پێویستە لە کۆی کایە هزری و مەعریفییەکاندا گرنگیان پێ بدرێت، بەتایبەت لـە تێـزی تـەکامولی مـەعریفی. لـەخوارەوە بـەکورتی باسـی ڕەهەنـدەکانی تەوحید دەکەین وەك بنەما گشتییەکانی تەکامولی مەعریفی لەدیدی ڕابەرانی قوتابخانەی ئیسلامیەتی مەعریفە[1].

---

[1] بروانە: فاروقي، إسلامية المعرفة، ص٨٩ وما بعد. هەروەها: فاروقي، جوهر الحضارة الإسلامية، مجلة المسلم المعاصر، ١٩٨١/٩/٢١م، العدد ٢٧. بەستەری ڕاستەوخۆ:
http://almuslimalmuaser.org/index.php?option=com_k2&view=item&id=178:%D8%AC%D9%88%D9%87%D8%B1-%D8%A7%D9%84%D8%AD%D8%B6%D8%A7%D8%B1%D8%A9-%D8%A7%D9%84%D8%A5%D8%B3%D9%84%D8%A7%D9%85%D9%8A%D8%A9&Itemid=125.

یەکەم: دووانەیی (الثنائیة)، تاکە رەنگدانەوەی تەوحید لە هزری پەیمانگادا بریتییە لەم بڕگەیە. دوانەیی یەکێکە لە بنەماکانی تەوحید، بەمانای جیاکاری لەنێوان حەقیقەتی بەدیهێنەر و بەدیهێنراو (الخالق والمخلوق) دێت. ئاشکرایە زاتی الله بەدیهێنەرە، بەڵام جیهانی دروستکراو، خۆی لە کات و شوێن و کۆی ئەو بوونەوەر و رووداوانە دەبینێتەوە، کە هەردوو رەهەندی کات و شوێن لەخۆیان دەگرن.

بەم مانایە دوانەیی حەقیقەت، هەم کۆتا و هەم رەهایە، واتە ناگونجێت بەدیهێنەر (زاتی الله) لەگەڵ دروستکراو یەکانگیر بێت، هەروەك ناکرێت بەیەکگەیشتنی بوونەوەرئاسا لەنێوانیاندا رووبدات و لەیەك جەستەدا ئاوێزان بن و بتوێنەوە. هەروەك چۆن دروستکراویش ناتوانێت لەگەڵ دروستکەر یەکانگیر بێت و ئاوێزانبوون و توانەوە لە جەستەیەکدا لەنێوانیان رووبدات، یاخود پلەی هیچ بوونەوەر و دروستکراوێك ناگاتە پلەی خودایەتی لەڕووی بەرزی و رەهایی و باڵادەستی و پیرۆزیدا...هتد، چونکە خودا بەدیهێنەرە و بنەچەی بوونە، هەروەك چۆن رەها و باڵا و بەتوانایە بەسەر هەموو شتێکدا، بەپێچەوانەوە، مرۆڤ دروستکراوە، دەسەڵات و تواناکەشی سنووردارە و هیچ تایبەتمەندی خوداییانەی تێدا نییە و نابێت.

بەم بڕگەیە رابەرانی هزری ئیسلامیەتی مەعریفە و تەکامولی مەعریفی بیروباوەڕەکانی بەشێك لە دەستەکانی نێو کەلەپووری ئیسلامی رەتدەکەنەوە و دەیانخەنە خانەی ناڕاست و ناتەواوەوە، وەك بیروباوەڕی (وحدة الوجود، الحلول، الإتحاد، ...).

دووەم: پەیپێبردن (الإدراكية)، ئەم بنەمایە بابەتی دیاریکردنی پەیوەندی نێوان بەدیهێنەر و بەدیهێنراو دەخاتەڕوو، کە بریتییە لە هەبوونی پەیوەندی پەیپێبردن لەنێوان هەردوو جیهانی حەقیقەت. ئامرازی پەیپێبردن و ئاشنایی لـەنێوان ئـەم دوو حەقیقەتـەدا (الخـالق والمخلـوق) بەدیهێنـەر و بـەدیهێنراو بریتییە لە ئاوەز و ژیری (العقل).

هیچ پەیوەندییەك لەنێوان پەروەرێن و مرۆڤدا نییە جگە لە هێزی عـەقڵ. عەقڵ بریتییە لە هێزێکی خۆڕسك کە وادەکات مـرۆڤ بەهۆییـەوە لـە ویـستی پەروەرێنی باڵا بگات، جیاوازی نییە ئـەم تێگەیـشتنە لـە ویـستی پـەروەرێن لەڕێگەی تێفکرین لە وەحی بێت یان لەڕێگەی تێڕوانین و کاراکردنی عـەقڵ و تێڕامـان لــە بوونــەوەر بەمەبەســتی هەســتکردن و ئاشــنابوون بــە یاســا و ڕێساکانی گەردوون. ئەمەش بەمانای ڕەتکردنەوەی هەبوونی گشت هێڵەکانی هەستپێکردن لەنێوان بەدیهێنەر و بـەدیهێنراو بـۆ ئـەم چـاخ و سـەردەمەیە، چونکە چاخی پەیامهێنیەتی کۆتاییهاتووە.

لەم سەردەمەدا، جگە لە ڕێگەی بەکارهێنانی عەقڵ، هـیچ ڕێگەیـەکی تـر لەبەردەم مرۆڤدا نییە بۆ هەستکردن بە ویست و خواستی پـەروەرێن، ئینجـا ڕێگەی گەیشتن بە حەقیقـەت لـە ڕێگـەی تێڕامـان و بیرکردنـەوە لـە سـروش (الـوحی)، یـان زانـستە ئـەزموونی و پراکتیکییـەکان، ئەمـەش دواجـار هـەر دەچێتەوە ژێر چەتری عەقڵ.

دیدی ڕابەرانی هزری ئیسلامیەتی مەعریفە سەبارەت بە بابەتی پەیوەندی نێوان عەقڵ و نەقڵ بریتییە لە پەیوەندییەکی تەواوکاری، بەشێوەیەك عەقڵ بـە وەحـی نـاوەکی و نـەقڵ بـە عـەقڵی دەرەکـی لەقەڵـەم دەدەن. وەك لـە

زانایانی پێشین گێردراوەتەوە، سەبارەت بەم پرسە گوتوویانە: "الوحي عقل من الخارج، والعقل شرع من الداخل"، سرووش عـەقڵی دەرەکییـە، عـەقڵیش شەرعی ناوەکییـە بـۆ مـرۆڤ، بەمـەش تـەکامول و هەماهـەنگی و یـەکانگیری تەواو لەنێوان عەقڵ و نەقڵ دێتەکایەوە.

سێیەم: مەبەسـتداری (الغائیـة)، واتـە دروسـتکردنی جیهـان و بوونـەوەر ئامانجـدارە و، بـە بێهـودە دروسـت نـەکراوە، ئـەم ئامانجـەش خـۆی لـە جێبەجێکردنی ویستی خوداوەند دەبینێتـەوە. بوونـەوەر بەگشتی جگـە لـە مرۆڤ، لەڕێگەی ڕێسا گشتییەکان کە بە (سنن الخلق) ناسراون، ویستی خودا جێبەجێ دەکەن. مرۆڤیش لـەم بەشـەدا وەك تـەواوی بوونـەوەران ناتوانێـت ئەم ڕێسایانە بشکێنێت، یان پشتگوێیان بخات.

بەشەکەی تر کە بریتییە لە بابەتی تەکلیف و خواپەرسـتی و پابەنـدبوون بە بنەماکانی شەرع و ئـایین، ئـەوە مـرۆڤ لـە دنیـا سەرپـشککراوە، لـەنێوان کردن و نەکردن، لەڕێگـەی دانـانی پاداشـت و سـزا. پاداشـت بـۆ ملکەچـان، سـزاش بـۆ ملـهوڕ و سەرپێـچیکاران، ﴿وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡ...﴾ الكهف: ٢٩، ئەی پەیامبەر، بە مرۆڤایەتی بڵێ، حـەق و راسـتی لای پەروەرێنتانەوەیـە، ئینجـا هـەر کەسێك دەیـەوێ بـا بـاوەڕ بێنێـت و هـەر کەسێکیش نایەوێت با ڕێگەی بێباوەڕان هەڵبژێرێت.

چوارەم: تەوانایی مرۆڤ (القدرة الإنسانیة)، وەك ئەوەی لـە خـاڵی سـێیەم جەخت لەسەر ئامانجداری بوونەوەر کراوەتەوە، کە لە نـاخی مـرۆڤ توانـای جێبەجێکردنی ئـەو ئامانجـە بـەدیهێنراوە. نـاخی مـرۆڤ ئـەو هێـزەی تێدایـە خودی خۆی و کۆمەڵگە بگۆڕێت، تەنانەت سروشت و ژینگە و دەوروبەریشی.

لەبەرامبەردا ناخی مرۆڤ، کۆمەڵگە، ژینگە و سروشت ئامادەیی قبوولکردنی کردارەکانی مرۆڤیان تێدا بەرجەستەکراوە، ئینجا ئەم کردارە باش بێت یان خراپ، جوان بێت یان ناشرین. کۆی گوێڕایەڵی و بێ فەرمانییەکانی مرۆڤ سەرەتا دەرچەی ناخیەتی، دواتر لە زەمینەی کرداری نێو کۆمەڵگە رەنگدەداتەوە. ئەمەش سەلمێنەری ئەو راستییەی سەرەوەیە، کە خودا بوونەوەری بەشێوەیەکی وا دروستکردووە، لە بەرامبەر کار و چالاکییەکانی مرۆڤ رامکراو و ملکەچ بێت، ئەمەش بەشێکی سەرەکی مانای رێزداری و گەورەیی مرۆڤ بەسەر گیانەوەرانی تردا دەسەلمێنێت، کە لە قورئاندا جەختی لەسەر کراوەتەوە.

پێنجەم: بەرپرسیاریەتی و بەرپرسیاریەتی و پاداشت (المسؤولية والجزاء)، کاتێك ئەرکی مرۆڤ بریتیبێت لە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی پەروەرێن، تواناداریش بێت لە جیێبەجێکردنی ئەم ئەرکە، دیارە ئەم مرۆڤە هەڵگری بەرپرسیارێتییە، چونکە بەبێ بەرپرسیاریەتی و پاداشت و سزا گرنگی ئەرکداری نامێنێت. لێپرسینەوە لەسەر بنەمای ئەم کار و چالاکییانە ئەنجام دەدرێت کە مرۆڤ ئەنجامیان دەدات، بۆیە ملکەچ و گوێڕایەڵەکان پاداشت دەکرێن بە کامەرانی و خۆشبەختی و بەختەوەری لە بەهەشتدا، بەمەش مافی خۆیان وەردەگرن. لەبەرامبەردا ملهوڕ و لە فەرمان دەرچووەکان، بەهۆی کردارە خراپەکانیان تووشی سزا و ئازار و ناڕەحەتی دۆزەخ دەبنەوە[1].

---

[1] بۆ روونکردنەوەی زیاتر بروانەبەشی یەکەم "یەکتاپرستی وەك جیهانبینی" لە پەڕتووکی "**Al-Tawhid: Its Implications For Thought and Life**" کەلەلایەن (المعهد العالمي للفكر

بەگوێرەی ئەو خاڵانەی باسمان کرد، یەکتاپەرستی (تەوحید) لە دیدی فاروقی سێ مانای سەرەکی دەبەخشێت:

١: رەتکردنەوەی کۆی ئەو بۆچوون و کار و چالاکییەکانەی کە لەگەڵ حەقیقەت تێکدەگیرێن.

٢: رەتکردنەوەی دژەوانە و تێکگیران و بەردەوامبوون لەسەریان.

٣: کرانەوە و رێزگرتن لە بۆچوونی بەرامبەر.

لەپاڵ ئەم بنەما گشتییانە، رۆڵی تەوحید لە دارشتنی بنەماکانی مەعریفە، لە گۆشەنیگای رابەرانی ئیسلامیەتی مەعریفە خۆی لە پێنج خاڵی سەرەکی دەبینێتەوە، وەك لە پەرتووکی (قوتابخانەی ئیسلامیەتی مەعریفە لە دیدی رابەرەکانیەوە) روونمان کردووەتەوە، ئەمانیش بریتین لە (وحدة الخلق، وحدة المخلوق، وحدة الحقيقة، وحدة الحياة، وحدة الإنسانية)، بۆ درێژەی ئەم پێنج خاڵە خوێنەر دەتوانێت بۆ پەرتووکی ناوبراو بگەڕێتەوە[1].

ئەم پێنج خاڵە ئاماژەی مەعریفی و ئەخلاقی گرنگییان تێدایە کە وەك بناخە و ئاراستەکەری هزری ئیسلامی لە دیدی ئیسلامیەتی مەعریفە ناسێندراون. هەروەك ئەم خاڵانە بریتین لە کۆمەڵێك مەشخەڵ و بنەمای سەرەکی دید و تێڕوانینی مەعریفەی ئیسلامی.

ئەم بنەمایانەی لەسەرەوە ئاماژەمان پێدان، بنەمای سەرەکی مەعریفەن، بەتایبەت بابەتی تەوحید، بۆیە بەهیچ شێوەیەك ناکرێت بابەتی

---

الإسلامي) چاپکراوە، ط٢، ١٩٩٢م، ص٩-١٦. هەمان پەرتووك بەعەرەبی: فاروقي، التوحيد: مضامينه على الفكر والحياة، ترجمة: السيد عمر، ٢٠١٠م، ص٤٥-٥٠.

[1] کۆسرەت سالح، قوتابخانەی إسلاميه المعرفه، لا١٨ و لاپەرەکانی دواتر.

تەكامولی مـەعریفی بێتـەئاراوە، بـەدەر لـە تەوحیـد، بـەو مانـا و میتـۆدەی لەسەرەوە باسمان كرد، نەك تەنها گرنگیپێدان بە تەوحید، بەڵكو باسكردنی تەكامول، بریتییە لە  دارشتنی مەعریفەی ئیسلامی و تێزەكانی لەژێر چەتری تەوحید بەو مانا و پێكهاتەیەی باسكرا.

كەواتە تەوحید بریتییە لە بنەمای سەرەكیی تەكامولی مەعریفی، چونكە بریتییە لە بنەمای دروستكردنی بوونەوەر، هێنانەكایەی تـەواوكاری لـەنێوان جیهانی بینراو و نـەبینراو، هـەروەها بنـەمای تـەواوكاری سـرووش، جیهـان، عەقڵ و هەستە، بۆیە بەردی بناخە و بنەمای یەكەم دادەرێژێت.

بنــەمای دووەم، بریتییــە لــە پاڵفتــەكردنی نــاخ و دەروون (التزكيــة)، تەواوكاری و ئاوێتەكردنی رۆح و دەروون و جەستە بـە یـەكتر لەرێگـەی ئـەم بنەمایـەوە ئـەنجام دەدرێـت،  گرنگیـدان بـە تـاك و كۆمەڵگـە و هاوسـەنگی دروستكردن لەنێوانیان، یەكانگیركردنی زانست و كار، بە كارایی و كارامـەیی گرنگترین بەرهەمی ئەم پاڵفتە دەروونییە دەبن.

سـێیەم، ئاوەدانكردنـەوە (العُمـران): بریتییـە لـە بنـەمای سـێیەم، كـە لەرێگەیەوە تەواوكاری لەنێوان كۆی پێویستییەكانی ژیان فەراهەم دەكرێت. بــەجۆرێك كــشتوكاڵ، پیــشەسازی، بازرگــانی، پەیوەنــدی و گەیانــدن، ئاوێتەكردنی زانستە ئاسمانی، ئەزموونی، سروشـتی، تەكنـەلۆژیی، سـوود و چێژوەرگرتن، هەموویان بەیەكەوە لەرێگەی ئەم بنەمایەوە بەرهەمدێن[1].

---

[1] بروانە: فتحي ملكاوي، التكامل المعرفي، ص٢٤٣.

ئاوەدانکردنەوە تەنها لە باڵەخانەی بەرز و ڤێلای قەشەنگ و شەقامی پان و پۆڕدا کورتنابێتەوە، بەڵکو ئاوەدانکردنەوەی دڵەکان، حەسانەوەی خەیاڵ و خەیاڵدانە ماندووەکان، تێرکردنی پاشخانی هزر بە مەعریفە و زانستێکی دروست و تەندروست، پێگەیاندنی مرۆڤێکی چاك و چاکەخواز، هەماهەنگی نێوان تاك و خێزانەکان، دروستکردنی پەیوەندی نێوان تیرە و هۆز و وڵاتان، بنبڕکردنی خوێنڕێژی و پێشگرتن لە پێشێلکردنی مافەکان....هتد، هەموو ئەمانە بریتیین لە ئاوەدانکردنەوەی حەقیقی، کە بنەمای سێیەمی تەکامولی مەعریفی پێکدێنێت.

# بەشی دەیەم
# پەیوەندی نێوان تەکامولی مەعریفی و ئیسلامییەتی مەعریفە

لە لاپەڕەکانی رابردوو تیشکمان خستە سەر پرۆژەی ئیسلامیەتی مەعریفە و ئامانجەکانی، لەم برگەیەشدا وەڵامی سێ پرسیاری گرنگ دەدەینەوە، ئەمانیش بریتین لە: پەیوەندی نێوان ئیسلامیەتی مەعریفە و تەکامولی مەعریفی چییە؟ لەکوێ بەیەك دەگەن؟ لەکوێ جیادەبنەوە؟

پەیامی پەیمانگای جیهانی هزری ئیسلامی سەبارەت بە پرۆژە هزرییەکەی ئیسلامیەتی مەعریفە روونە و لە دووتوێی کتێبێدا بە هەردوو زمانی ئینگلیزی و عەرەبی لەژێر ناونیشانی (إسلامية المعرفة، المبادئ العامة– خطة العمل– الإنجازات) چاپکراوە، بیرمەندی شەهید (ئیسماعیل راجی فاروقی) بە زمانی ئینگلیزی نووسیویەتی، عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبو سلێمانیش بۆ زمانی عەرەبی وەریگێڕاوە، توێژەریش لە پەرتووکی (قوتابخانەی إسلامية المعرفة لە دیدی رابەرەکانیەوە) گرنگترین تێزە هزرییەکانی بە زمانی کوردی بڵاوکردوونەتەوە.

لەم پەیامەدا کە یەکەمین پەیامی فەرمی پەیمانگایە، بەڕوونی دیارە کاری لەپێشینە بریتییە لە چارەسەرکردنی قەیرانی هزری لەڕێگەی چارەسەرکردنی قەیرانەکانی پەروەردە، بەتایبەت نەهێشتنی دووفاقییە و دووجەمسەری لە پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن.

بیرمەندانی پەیمانگا لەسەر ئەو باوەڕەن لەڕێگەی بووژاندنەوەی کەرتی پەروەردەوە، دەکرێت سەرجەم کەرتەکانی تریش ببووژێندرێنەوە، بەپێچەوانەوە بە فەرامۆشکردنی کەرتی پەروەردە، زیاتر دواکەوتنی زانستی و مەعریفی و هزری و تەکنەلۆژیی دەبێتە بەشی موسڵمانان لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا، ئەمەش بەواتای خستنەگەڕی پەروەردە و فێرکردن بۆ گرنگیدان بە پرسەکانی ئوممەتی ئیسلام دێت. هەر بۆ هەمان مەبەست و بەرجەستەکردنی پرۆژەکە زانکۆی (الجامعة الإسلامية العالمية– ماليزيا) دروستکراوە وەك لەرابردوودا رونمانکردەوە.

خودی بیرۆکەی دامەزراندنی زانکۆکە بۆ بەرجەستەکردنی پرۆژەی ئیسلامیەتی مەعریفە بوو، دواتر کردنەوەی کۆلێژێکی گەورە بە ناونیشانی (معارف الوحي والعلوم الإنسانية) زانستەکانی سروش و زانستە مرۆڤایەتییەکان، بریتی بوو لە هەنگاوی کردەیی بەرجەستەکردنی پرۆژەی تەکامولی مەعریفی.

کەواتە زانکۆی ئیسلامی لە زەمینەی کرداری، لەیەك کاتدا هەوڵی بەرجەستەکردنی پرۆژەی ئیسلامیەتی مەعریفە و تەکامولی مەعریفی دەدات، ئەمەش ئاماژەیەکی روونە بۆ هەبوونی پەیوەندییەکی تۆکمە لەنێوان ئەم دوو پرۆژە هزری و مەعریفییە.

لـه بەرجەسـتەکردنی هـەردوو پرۆژکـە پـشکی شـێر بـەر ئـەبو سـلێمان دەکەوێت، چونکە ئەو بـە نوێنەرایـەتی پـەیمانگا بـۆ مـاوەی ١٠ سـاڵ بـووە سەرۆکی زانکۆ. دوایی ئەوەی وەزارەتی پەروەردەی مالیزیا لە ساڵی ١٩٨٨ بە فەرمی داوای لە پەیمانگای جیهانی هزری ئیسلامی کرد، کـە بیرمەنـدێکی پەیمانگا وەك نوێنەر بنێرێت بۆ بەرجەستەکردنی هزری ئیسلامیەتی مەعریفە لە زانکۆیی ئیسلامی جیهانی-مالیزیا[1].

لەم ماوەیەدا هـەم زانکـۆ لـەڕووی سـتراتیژ و هـزرەوە، هـەمیش لـەڕووی ئیـداری و کارگێڕییـەوە، لـەپاڵ دابینکردنـی ئامرازەکـانی وەك باڵەخانــە و پێداویستییەکانی زانکۆوە، گەشانەوەیەکی پێشبینی نەکراوی بەخۆوە بینی.

خـوودی دامەزرانـدنی کۆلێـژی مـەعاریف، هـەنگاوێکی جـددی بـوو بـۆ تاقیکردنەوەی ئەزموونێکی نوێ، لەسـەر هـەردوو ئاسـتی جیهـانی و ئاسـتی وڵاتە ئیسلامییەکان، چونکە لە رۆژئاوا بەشێوەیەکی گردەبڕانە دەستی ئایین لە ناوەندە ئەکادیمی و مەعریفییـەکان بـڕدراوە، لـە وڵاتـە ئیـسلامییەکانیش دابەشکاری لەنێوان خوێندنی ئیسلامی و خوێندنی گشتیی عەلمانی کراوە.

بۆیــە کۆکردنــەوەی زانــستە ئایینییــەکان لەگــەڵ زانــستە ئــەزموونی و مرۆییــەکان بــەر لــە زانکــۆی ئیــسلامی، بــەم پەیکــەر و پرۆگرامــەوە تــاقی نەکراوەتەوە، بۆیە بەئەزموونکردنی ئەم بیرۆکەیـە، جیـا لـەوەی نـوێ بـوو، دەستپێشخەری بۆ کارێکی لەم چەشنە زۆریش قورس بوو.

---

[1] عبدالحميد أبو سليمان، إسلامية الجامعة وتفعيل التعليم العالي بين النظرية والتطبيق، مجلة إسلامية المعرفة، العدد٢٧، ٢٠٠١م، ص١٢٨.

خالّی هەرە قورس لەبەردەم سەرکەوتنی ئەم بیرۆکەیە، بریتی بوو لە جیاوازی زەمینەی هزری و مەعریفی ئەم دوو زانستە، چۆن دەکرێت کۆبکرێنەوە و بەهەماهەنگییەوە لە دووتوێی پەرتووکێك چاپ بکرێن؟ دواتر لە هۆلّێکی خوێندن ئەزموون بکرێت!! ئەم خالّە وەك تەحەددایەکی مەترسیداری بەردەم پرۆژەکە دەهاتە بەرچاو.

کاری هەرە قورس لە تێکهەلّکێشکردنی ئەم دوو کایە مەعریفییە، لەوە خۆی دەبینێتەوە، سەرجەم سەرچاوە بەردەستەکانی هەردوو بوارەکە بەشێوەیەك نووسراون، تەنها جەخت لەسەر بوارێك دەکەنەوە، واتە بەئەستەم دەتوانرا سەرچاوەیەك بدۆزرێتەوە کۆکەرەوەی هەردوو بوارە مەعریفییەکە بێت.

بۆیە رابەرانی پەیمانگا و مامۆستایان کەوتنە ژێر فشارێکی توند، چونکە پێویست بوو لەسەر شێوازی توێژینەوە، کۆمەلّێك بابەت وەك مەنهەجی بەشەکان رێنووس بکەن. پێویست بوو پرۆگرامەکە بەشێوەیەك نووسرابێت، زانستە پراکتیکییەکان لە چوارچێوەی دیدێکی گشتگیری فرەلایەنەی ئیسلامی خرابنەڕوو، بۆنموونە (دەروونناسی، کۆمەلّناسی، پەروەردە، ژیارستانی، زمان و کولتوور ...هتد) سەرجەم بەشەکانی تری کۆلێژی مەعارف کە زۆربەیان لەسەر بنچینەیەکی دوور لە ئایین داڕێژراون، دەبووایە لەسەر بنچینە و بناخەیەکی تۆکمەی ئیسلامی بخرێنە بەردەستی خوێندکاران.

ئەمە کارێکی ئاسان نییە، وەك نموونەی موتربەکردنی دارەکانی (خـۆخ و شۆڕەبی) دێتە بەرچـاو، تـا دانەیـەك دەردەچـێت، ١٠ دانـە و زیـاتریش زڕ و بێبەرهەم دەبن.

بەواتایـــەکی تـــر، دارِشـــتنەوەی زانـــستە ئەزموونییـــەکان لەڕێگـــەی ئاوێزانکردنیان بە دیدگایەکی ئیسلامی، بەئامانجی کەمکردنەوە و بنبڕکردنی هەژموونی فەلسەفەی ڕۆژئاوایە کە بنچینە و سەرچاوەکەی بۆ خوودی مـرۆڤ دەگەڕێتەوە و لە زۆربەی کاتدا مـرۆڤ بـە چـەقی گـەردوون پێناسـە دەکـات، بەپێچەوانەی دیـدە ئیـسلامییەکە کـە خـودا چـەقی گـەردوون و سەرچـاوەی داهێنان و بەدیهێنەری بوونەوەر و زانستەکانە، خودی پرۆسەکەش بابەتێکی پڕکێشەیە، کارێکی زۆر و هیممەتێکی ئێجگار زۆری دەوێت.

جیا لە بەربەستە ماددییەکان، چـەند بەربەسـتێکی هـزری و مەنهـەجیش لەبەردەم ئەم پرۆسەیە قوت بوونەوە، گرنگترینیان دژایەتیکردنی بەشێك لـە بیرمەنـدان بـوو، کۆمـەڵێك نـاوداری جیهـانی ئیـسلامی کـە لـە نزیکـەوە لـە پرۆژەکە ئاگادار بوون، بەرامبەر بەم ئەزموونە نوێیە وەستانەوە، هەریەکە و بە بیانوویێکی جیاواز.

بەشـێك لـە چـاودێر و پـسپۆڕ و توێـژەران بۆچـوونیان وابـوو، بـەهیچ شێوەیەك خاڵی هاوبـەش لـەنێوان ئـەم دوو بـوارە مەعریفییـە، زانـستەکانی وەحـی و مرۆڤایـەتی (معـارف الـوحي والعلـوم الإنـسانية) نییـە. دەرەنجـام، ئاوێتەکردن و ئاوێزانکردنی دوو شت لە شتێکدا کە هیچ خـاڵێکی هاوبەشـیان لەنێواندا نەبێت، کارێکی ئەستەمە، چونکە دژەوانە هەرگیز کۆناکرێنەوە.

ئیدی له دیدی ئەمان هەر هەوڵێکی لەم چەشنە نەزۆك دەردەچێت، تا ئەم ساتەش بەشێك لەم توێژە لەنێو زانکۆی ئیسلامی هەن، ئەگەرچی بە پەنجە دەژمێردرێن، بەڵام له بنچینەوە باوەڕیان وایە، تەنانەت ئەگەر لە بواری تیۆریش کارێکی لەم چەشنە ئەنجام بدرێت، لە بواری کردارییەوە ئەستەمە.

بەشێکی تریان وای بۆ دەچن، ئەم پرۆسەیە بریتییە لە بەیەکگرتنی زانست بە فیقه، هەروەك بیرمەندی توونسی ئەبو یەعرەب ئەلمەرزوقی لە توێژینەوەیەکدا ئاماژەی بۆ دەکات. ئەو پێیوایە ئەم یەکگرتن و تێکهەڵکێشییە لە بەرژەوەندی زانست دەبێت، سەرەنجام زانست و فەلسەفەی رۆژئاوا هەژموونی خۆیان بەسەر فیقه و ئایین دەسەپێنن، بەمەش ئایین بە دۆڕاوی له پرۆسەکە وەدەر دەنرێت[1].

لەڕاستیدا فیقه بوارێکی سەربەخۆیە و کۆباس و تێزە فیقهییەکان لە تێزە زانستییەکان جیان، بەڵام بەومانایە نا ئەگەر زانستە ئەزموونییەکان وەك (دەروناسی و کۆمەڵناسی...هتد) لەسەر هێڵی پانی ئایین دابمەزرێن، زیان بە ئایین یان بە زانست دەگات. بەپێچەوانەوە کرداری ئاوێتەکردن و تێکهەڵکێشکردن لەنێوان ئەم دوو بوارەدا کارێکی زۆر پێویستە، هەم بۆ زانست و هەمیش بۆ ئایین، سەرەڕای پێگەیاندنی تاقمە زانایەکی زانا و دیندار، وەك مەهاتیر محەممەد، سەرۆك وەزیرانی پێشووتری مالیزیا لەبارەی

[1] أبو يعرب المرزوقي، إسلامية المعرفة رؤية مغايرة، مجلة إسلامية المعرفة، العدد ١٤، ص١٤٨.

ئامانجی بیناکردنی زانکۆی ئیسلامی لە سەردەمی دەسەڵاتی ئەودا ئامـاژەی بۆ دەکات.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بە جیاوازییەکی ورد لەنێوان تەئسیس و تەئـسیل (التأسیس والتأصیل) بکەین، پڕۆژەی تەکامولی مەعریفی لە خانـەی یەکـەم خـۆیی نمـایش دەکـات، نـەك دووەم. بەواتایـەکی تـر، پێویـستە هـەر لـە سەرەتاوە خودی زانستە ئەزموونییەکان لەسەر بنچینەیەکی ئایینی ڕێنووس بکـرێن، نـەك سـەرەتا بنووسـرێنەوە، ئینجـا لـە تێکستە ئایینییـەکان بـۆ شەرعیەتدان بە کۆباسـەکانیان بـە ئاراسـتەی تەئـسیلکردن هـەنگاو بنرێـت، وەك ئەو شێوازە تەقلیدییەی لە وڵاتە ئیسلامییەکان بەدی دەکرێت.

سەرەڕای دەیان و سەدان تێبینی و سەرنج و ڕەخنە و پێشنیاز، تەنانەت زۆرجار کار گەیشتووەتە بێئومێدکردن و تانەلێدان، بـەڵام سـووربوونی ئـەبو سـلێمان لەسـەر تێـزە مەعریفییـەکانی ئیـسلامیەت و تـەکامولی مـەعریفی، ئەنجامی کرداری دڵخۆشکەر و چاوەڕوان نەکراوی هێنایە بەرهەم، بەتایبـەت دوای ئەوەی توانی کۆلێژی مـەعاریف بـۆ زیـاتر لـە ١٠ بـەش فـراوان بکـات، هەروەها گۆڤارێکی هزری و مەعریفی شەش مـانگ جارێـك تایبـەت بـە تێـزە هزرییەکانی ئەم پڕۆژەیە بەناوی (التجدید) دەربکات، کە یەکەم ژمـارەی لـە سـاڵی ١٩٩٧ دەرچـووە و تـاوەکو ئێـستاش بەردەوامـە، گۆڤارەکـە بووەتـە جێگەی سەرنج و ئومێدی ژمارەیەکی زۆر لـە بیرمەنـد و خـەمخۆرانی جیهـان بەگشتی و جیهانی ئیسلامی بەتایبەتی.

بەشێك لە توێـژەرانی ئاگـادار لـە پرۆژەكـە وەك –ئەبوبـەكر محەممـەد– بەنموونە [1]، ، پێیانوایە دیدگای كۆلێژی مەعاریف بۆ زانستەكان، بریتییە لـە تێپەڕاندنی دیدی فیقهی رووت بۆ چارەسەركردنی كێشە پەیوەندیدارەكان بە زانستە كۆمەڵایەتییەكان و زانستەكانی كۆمەڵگە. لەبری ئەم دیدە فیقهییـە، كار بۆ هێنانەپێشەوەی كۆمەڵێك ئامرازی مەعریفی وەرگیراو لـە تێگەیـشتنە گشتییە قورئانییەكان دەكات، ئەم تێگەیشتنە قورئانییـە گـشتییانەی رووی دەمیان لە مرۆڤایەتییە، نەك بەتەنها موسڵمان و ئیمانداران، بەواتایەكی تـر، ئـەو مەفهومانـەی هەمیـشە خـودا لەڕێگەیانـەوە لـە قورئـان عـەقڵی مرۆڤـی دواندووە.

سەبارەت بە مەفهومـەكانی تایبـەت بـە شـەریعەتی ئیـسلام، ناكرێـت لـە مەفاهیمە گشتییەكان دووربخرێنەوە، بەڵكو ئەوانیش لـەژێر هەژموونگـەرایی دیدگا قورئانییە گشتییەكە ناتوانن ملكەچ نەبن، چونكە ئەمانیش دواجار لـە ئامانجەكەیانـەوە بەیـەك دەگـەن، كـە بریتییـە لـە رێكخـستنی كۆمەڵگـەی مرۆڤایەتی، كاراكردنی بەهاكان لە ئاراستەكردنی ئاكاری مرۆڤ بۆ دادگـەری و چاكە، هـەروەها دووركەوتنـەوە لـە سـتەم و شـەڕانگێزی، ئـەم كۆباسـانەش تەنها تایبەت نین بە تاك یان كۆمەڵگەی موسڵمانان، بەڵكو پەیوەندیدارن بـە سەرجەم مرۆڤایەتی.

بۆیـە لـە ئەگـەری سـەركەوتنی زانكـۆ لـەم پرۆژەیـە، واتـە دامەزرانـدنی نموونەیەك كە شیاوی چاولێكردن و ئەزموونكردن بێـت، لـەڕووی رێكخـستنی

---

[1] أبوبكر محمد إبراهيم، مفهوم التكامل المعرفي وعلاقته بحركة إسلامية المعرفة، مجلة إسلامية المعرفة، العدد ٤٣، ص٣٣ و ، دواتر.

کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی لەسەر ئەم چەمك و تێگەیشتن و یاسا و ڕێسایانە، کە بە زمانی سەردەم کۆمەڵگە سەردەمییەکان بدوێنێت، ئەوە دەتەوانێت خزمەتێکی ئێجگار گەورە پێشکەشی مرۆڤایەتی بکات.

هەر خوودی پرۆژەکەش لە یەك کاتدا، رەخنە لە زانستە ئیسلامییە تەقلیدییەکان و زانستە ئەزموونییە دوور لە دینییەکان دەگرێت، لەبری هەردووکیان، پەیمانگای جیهانی هزری ئیسلامی کار بۆ هێنانەپێشەوەی زانستێکی تۆکمە دەکات، لەسەر بنچینەی دیدە گشتییەکەی قورئان بیناکرابێت، زانستە ئەزموونی و پراکتیکییەکانیشی لەخۆگرتبێت.

# بەشی یانزەیەم

# تەکامولی مەعریفی لە قورئاندا[1]

سەرچاوەی دیدگای بیرمەندانی پەیمانگا بۆ بابەتی تەکامولی مەعریفی بریتییە لە قورئانی پیرۆز، ئەگەر بەوردی سەیری قورئان بکەین، بۆمان دەردەکەوێت ئایەتەکانی قورئان بەچڕی جەخت لەسەر چەند خاڵێك دەکەنەوە، گرنگترین ئەو خاڵانەی بوونەتە سەرچاوەی تەکامولی مەعریفی لە قورئاندا، ئەمانەن: تاقانەیی پەروەرێنی بەدیهێنەر، بوونەوەری بەدیهێنراو، مرۆڤی جێنشین، فێرکردنی مرۆڤ بە سەرجەم ناوەکان وەك لە سوورەتی (البقرة)دا هاتووە، دواتر دابەزینی سرووشی خودا لە ئاسمانەوە، وەك رێنماییکار و رێنیشاندەر بۆ مرۆڤی سەر زەوی بەدرێژایی کاتی نێوان ئادەم و محەممەد (درودی خودا لەسەر هەموو پەیامهێنان).

---

[1] ئەم بەشە بەرهەمی توێژەرە، وەك تەتبیقات چاوخشاندن و گەشتێکی خێرا بەناو سورەتەکانی قورئان، بەمەبەستی ئاشنابوون بەکرداری تەکاملی مەعریفی لەقورئاندا، لەسەر هەر سێ ئاستی (سوورەت، ئایەت، ناوی سورەتەکان).

کەواتە ئـەم پێـنج خاڵـەی سـەرەوە (خـودا، بونـەوەر، مـرۆڤ، فێرکـردن، سرووش)، لەسەر شێوازی یەکەی جیاجیا باسکراون، کۆکردنەوەی هەموویان بەیەکەوە لەسەر شێوەی یەکەیەکی تۆکمە، ئاماژەیەکی روونە بۆ تـەکامولی مەعریفی.ئەگەر سەیری زۆربەی سوورەتەکانی قورئان بکەین، بەتایبەت ئـەو ئایەتانـەی لـە قۆنـاخی مەککـە دابـەزیون، دەبیـنین چـۆن خـوای پـەروەرێن پرسـەکانی گـەردوون و دیاردەکـانی، لەگـەڵ کـار و چـالاکییەکانی مـرۆڤ و رەهەنـدی دەروونیـی مرۆڤایـەتی یـەکانگیر کـردووە، سـوورەتی (القیامـة) بەنموونە. وەك دەبینین هەر لە سەرەتای سوورەتەکەوە باسـی رۆژی دوایـی دەکات، پاشان باسی دەروونـی لۆمـەکاری مـرۆڤ و زیندووبوونـەوە دەکـات و جەخت لەسەر تواناکانی پـەروەرێن دەکاتـەوە لـە کۆکردنـەوەی پارچـەکانی جەستەی شیبووەوەی مرۆڤ.

ئەم سورەتە باسی دیاردە گەردوونییـەکانی وەك چـۆنیەتی مـانگگیران و ونبوونی رووناکیی خۆر و مـانگ و کۆکردنـەوەیان لـە رۆژی دواییـدا دەکـات، پاشـان دێتـە سـەر باسـکردنی گرێـدانی هــەردوو ژیـانی ئێـستا و دوارۆژ بەیەکـەوە، کـە بریتییـە لـە تێکهەڵکێـشکردنی جیهـانی بینـراو و جیهـانی نـــەبینراو، ئینجـا دووبـارە باســی پێکهاتـــەی نـاخی مـــرۆڤ دەکـــات. ﴿بَلِ ٱلۡإِنسَٰنُ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦ بَصِيرَةٞ ١٤ وَلَوۡ أَلۡقَىٰ مَعَاذِيرَهُۥ﴾ القيامة: ١٤ – ١٥.

ئـەم تێزانـەی سـەرەوە بەشـێکی سـورەتەکە پێکـدەهێنن و دەکـرێ لـە زانستە ئەزموونییەکانیشدا رێنماییکـەر و رێنیـشاندەری کۆمـەڵێك گریمانـە و بابەتی زانستی بن، هەر لە دەرووناسییەوە بگرە تا دەگاتـە گەردووناسـی و زانستی پزیشکی.

قورئان لەدوای باسکردنی ئەم بابەتانە، باسی پرۆسەی دابەزینی سرووش بۆ پەیامهێن (دروودی خوای لەسەر) دەکات و پەیامهێن لەوە دڵنیادەکاتەوە کە خودا لە لەبیرچوونەوە و لەدەستچوونی ئایەت و سوورەتەکانی قورئان دەیپارێزێت. بەم کارەش راستەوخۆ مرۆڤ بەوە ئاشنا دەکات کە رایەڵە و پەیوەندییەکی تۆکمە لەنێوان ئەم دوو بوارە مەعریفی و زانستییە لەگەڵ زانستە ئاسمانی و مرۆییەکاندا هەیە.

لە هەمان سوورەتدا باسی قیامەت و بینینی پەروەرێن و رووسپیبوونی هەندێ لە مرۆڤەکان و رووڕەشی مرۆڤەکانی تر دەکات، هەر بەمەش ناوەستێت، بەڵکو ساتەوەختی گیانەڵڵا و دەرچوون لە دنیامان وەك گرتەیەکی ڤیدیۆیی بۆ تۆمار دەکات، بەتایبەتکاتێك باسی نائومێدی مرۆڤ لە ژیان دەکات لە ساتەوەختیسەرەمەرگدا، کە قاچەکانی لێکدەئاڵێن و پەشیمانبوونەوە دادی نادات، لەم ساتەوەختە یەکلاییکەرەوەدا، خزم و دۆست و خانەوادەکان پەنا بۆ نووشتە و گشتەك و نزا و پاڕانەوە دەبەن، بەو مەبەستەی فریای بکەون و لە مردن رزگاری بکەن، بەلاّم پەروەرێن جارێکی تر ئەوەمان بیردەخاتەوە کە ئەنجامدانی رەفتار و کرداری چاك و خۆبەخشانە، چەند بۆ مرۆڤپێویستن، بەشێوەیەك هەم لە سەرەمەرگ و، هەمیش لە ژیانی دوارۆژ بەفریای چاکەکاران دەکەون. بەپێچەوانەوە،ئەنجام نەدانی ئەرك و پێویستییە ئایینییەکان، خۆبەدوورگرتن لە کار و کردەوەی خۆبەخشانە دەبێتە مایەی رەنجەڕۆیی و بەدبەختی دنیاکەی تریان.

لە کۆتا ئایەتەکانی ئەم سوورەتە پیرۆزەدا، دیسان بابەتی ئەرکداری مرۆڤ و چۆنیەتی دروستبوونی مرۆڤمان بیردەخاتەوە، ئەویش لەڕێگەی

خــستنەڕووی  چـــەند پرســـیارێکەوە، رووی دوانـــدن دەکاتـــە مـــرۆڤ و دەفەرمووێت:

ئاخۆ مرۆڤ بە بێهودە دروستکراوە؟ ئاخۆ لە دڵۆپە ئاوێکی تکاو دروست نـەکراوە؟ ئـاخۆهـەر ئـەم دڵۆپــە ئـاوە تکـاوە نەبووەتـە پارچـە گۆشـتێکی هەڵواسـراو لــە رەحمـی ئافرەتـدا؟ دواتــر هــەردوو رەگــەزی نێـر و مێـی لـێ دروستکراوە، ئایا ئەو بەدیهێنەرەی خاوەنی ئەم هەموو توانا بێسنوورانەیە، لە هەمبەر زیندووکردنەوەی مردوواندا تواناداار نییە؟

دوای وردبوونەوە لەم سوورەتە پـیرۆزەدا کـە کۆمـەڵێك کۆبـاس و تێـزی جیـاوازی تێـدا باسـکراون، وا دەردەکـەوێت هەریـەك لـەم تێزانـە یەکەیـەکی سـەربەخۆن، دواتــر قورئــان لــە یەکەیــەکی تۆکمــەدا بەشـێوەی پاکێجێـك کۆیکردوونەتەوە، ئەم یەکە تۆکمەیەشی ناو ناوە سووڕەتی (القیامة).

بــا تــەماشــای باســی (دواڕۆژ، دەروونــی مــرۆڤ، مــەرگ و شــیبوونەوەی جەستە، مانگگیران و خۆرگیران و دیاردە گەردوونییـەکان، هاتنـەخوارەوەی سرووش و پاراستنی لەلایەن پـەروەرێن، حەشـر و حیسابی دواڕۆژ، بایـەخی کردەوەی چـاکە و چـالاکی خۆبەخـشانە، خانـە و هـەنگاوە سـەرەتاییەکانی دروستبوونی مرۆڤ، تواناداری بەدیهێنەر لە زیندووکردنەوەی مرۆڤـی مـردوو) بکەین، هەموو ئەم یەکانە، ئەگەر بە جیاواز و یەك بە یەك تەماشایان بکەین، دەبینین تێزی سەربەخۆن، بەڵام ئەوکاتەی بەتێکڕایی و بەشێوەیەکی گشتی لە سوورەتی (القیامة) لێیان ورد دەبینەوە، دەردەکەوێت  وەك جەستەیەکی تەندروسـت و هاوسـەنگ وان، بۆیـە ئەگـەر هەریـەکێك لـەم تێزانـە پـەراوێز بخرێــت، ئـــەوا جەســـتە تەندروســـتەکە هاوســـەنگی و تەندروســـتبوونی

لەدەستدەدات، بۆیە دەبێ دان بەوەدا بنێین ئەم سوورەتە پیرۆزە و تەواوی سـوورەتەکانی تـر، کلیـل و دەرگـای ئاشـنابوونمانن بـە یـەکانگیرکردنی بابەتەکان لەگەڵ یەکتر.

ئەگەر بـەوردی سـەرەنج لـە هـەر سـوورەتێکی قورئـان بـدەین، دەبیـنین پەیوەندییـەکی تۆکمـە لـەنێوان سـەرەتا و کۆتاییەکەیـدا هەیـە، ڕەنگـە هەندێکجار مرۆڤ نەتوانێت بەوردی پەیوەندییەکە دەستنیـشان بکـات، بـەڵام هەرگیز ئەمە بەو واتایە نییـە کـە پەیوەندییـەکی لـەم شـێوەیە نییـە، بۆیـە خوێنەر دەتوانێت بەمجۆرە لە تـەواوی سـوورەتەکانی قورئـان وردببێتـەوە، بەڵام وەك ڕێنماییکردن و ئاسانکاری، خوێنەر لێرەدا دەتوانێت خۆی سەرنج بداتە سوورەتی (الشمس) کە لێکچوونێکی زۆری لەگەڵ سوورەتی (القيامة)دا هەیە.

ئەگەر لەم بابەتەداوردتر لە قورئان بڕوانین، دەبینین بابەتی تـەکامول لـە هەموویان زیـاتر دەدرەوشـێتەوە، ڕوانگـەی یـەکانگیر و گـشتگیریی قورئـان لەڕووی ئایەتەکان و وابەسـتەکردنیان بـە یـەك، وەك تەسـبیح، بـە تـەکامول ئاشناترمان دەکەن، بۆیە لەم خاڵەدا ڕۆڵی ئایەتەکان زیاتر بەدیار دەکەوێت.

دابەشکردنی قورئان بۆ ١١٤ سـوورەت، دواتـر هـەر سـوورەتەو بـۆ چـەند ئایەتێکی کورت و درێژ، جێگەی تێڕامان و وردبوونەوەیە، لە هەنـدێ شـوێن دوو ئایەتی بەدوای یەکدا هاتوو، دوو پێکهاتە و ناوەڕۆکی زۆر لەیەك دووریان هەیە، بەڵام بەشێوەیەکی وا داڕێژراون، وەك ئەوەی بە یەك بابەت تایبەت بن و هیچ جیاوازییەك لەنێوانیاندا بەدی ناکرێت.

لەڕووی زمانەوانییەوە وشەی (آیة) بە واتای نیشانە و بەڵگەی زیاتر بەکاردەهێندرێت، لەڕووی زاراوەی قورئانیشەوە بەو رستانە دەگوترێت کە کەوتوونەتە نێوان دوو ئەستێرەی قورئان، وەك چەمكێكی بەكارهاتوو، وشەی ئایەت لەنێو قورئاندا، زیاتر ئاماژەیە بۆ فەرمایشتە رێنووسکراوەکانی پەروەرێن لەگەڵ دیاردە گەردوونییەکان کە بەچاو دەبیندرێن، ئەویش لە بواره ماددییەکانی وەك ئاسمان و ئەستێرە و کەژ و کێو و زەریا و دەریاکان. هەروەها لە بواری کۆمەڵایەتی وەك ئەو دەیان پەیوەندی و پلەبەندییە کۆمەڵایەتییەی لەنێو کۆمەڵگە جیاوازەکانی مرۆڤایەتی بەدیدەکرێن، لە بواری دەروونیش وەك ئەو دەیان جۆرە کەسایەتی و بابەتە دەروونییانەی لە روانگەی دەروونناسییەوە گەنگەشە کراون.

بۆ ئەم بابەتانە قورئان لەڕێگەی دوو دێڕی کورت و پوخت قسەی خۆی کردووە، ﴿وَفِي ٱلۡأَرۡضِ ءَايَٰتٞ لِّلۡمُوقِنِينَ ۝٢٠ وَفِيٓ أَنفُسِكُمۡۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ۝٢١﴾ الذاريات: ٢٠ -٢١، لە زەویدا چەندین نیشانە و بەڵگە، تەنانەت لە دەروونی خۆشتاندا، بۆچی تێڕانامێنن؟ لە چەند شوێنێكی تردا، قورئان مرۆڤ بۆ وردبوونەوە لە سەرەتای دروستبوونی بوونەوەر و گەردوون بانگهێشت دەكات، ئەم بانگێشتەش وەك ئەوە وایە پەروەرێن لەڕێگەی ئەم دەرگایەوە، بە مرۆڤ بڵێت ئەی مرۆڤ، خۆت بەراوردێك لەنێوان روانگەی قورئان لەبارەی خاڵی دەستپێك و سەرەتای دروستبوونی مرۆڤ و بوونەوەر بكە، دواتر لەگەڵ زانستەكانی تری وەك زیندەوەرزانی و جیۆلۆجی و زانستە هاوشێوەكانیان بەراوردی بكە، بۆئەوەی شوێنەواری ژیان و گەوهەرە شاراوەكان و تابلۆ كێشراو و رازاوەكانی گەردوون ببینیت.

کاتێك قورئان مرۆڤایەتی بۆ گەڕان و پشکنین لە کون و کەلەبەرەکانی زەوی، تێڕامان لە چارەنووسی گەلانی رابردوو و ئاشنابوون بە ژیارە کۆنەکان بانگ دەکات، ئامانجەکەی بریتییە لە پەند و وانەوەرگرتن لەم رووداوانە، بۆئەوەی لەم رێگەیەوە مرۆڤ ئەزموونی تاڵی گەلانی رابردوو دووبارە نەکاتەوە و سوودیش لە باشی و جوانییەکانیان وەربگرێت.

لەڕێگەی بەدەمەوەهاتنی ئەم بانگەوازە قورئانییە، کە بریتییە لە تێڕوانین و گەڕان بەدوای ناو و مێژووی گەلانی رابردوو، مرۆڤ دەتوانێت کۆمەڵێك داتا و زانیاری بەنرخ بەدەستبێنێت، بەتایبەت لە بوارەکانی (مێژوو، شوێنەوارناسی، مرۆڤناسی – ئەنترۆپۆلۆجیا، بەراوردکردنی ئایینەکان و کۆمەڵناسی...هتد). هەروەها لەڕێگەی بەدەمەوەهاتنی بانگەوازی قورئان سەبارەت بە تێفکرین و تێڕامان لە ئایەت و نیشانە و نهێنییەکانی پەروەرێنی بەتوانا، لە ئاسۆکانی گەردوون و دەروون (في الآفاق وفي الأنفس) مرۆڤ دەتوانێت زانستەکانی گەردوونناسی و دەروونناسی دەوڵەمەندتر بکات.

ئەم تێگەیشتن و وردبوونەوەیە لە قورئان، ئەو راستییە دەسەلمێنێت کە لە دیدی ئیسلامدا، هەموو زانست و بوارێکی مەعریفی، بەشێوەیەك لە شێوەکان سوود بە مرۆڤایەتی و گەردوون دەگەیێنێت، ئەوەش کارێکی پەسەندکراوە و پێویستە مرۆڤی موسڵمان هەوڵی بەدەستخستنی بدات، ئەو وەهمەش دەڕەوێنێتەوە کە زانست بە مانا قورئانییەکەی تەنیا لە زانستە شەرعییەکان، یان لە زانستە ئیسلامییەکاندا کورت بکرێتەوە، وەك هەندێ لە موسڵمانان وا تێیگەیشتوون، بەڵکو ئەو زانستەی قورئان و فەرموودە، هانی

موســـوڵمانان دەدەن تێکرایـــی هەوڵـــەکانیان لـــەپێناو بەدەستخـــستن و بەگەڕخـــستنیان بـــدەن تێکرایـــی جۆرەکـــانی زانـــستە سوودبەخـــشەکانن. ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگرە، تەنیا لەڕێگەی زانستە ئیسلامییەکان ناتوانرێت جێنـــشینایەتی و ئاوەدانکردنـــەوەی زەوی بەرجەســـتە بکرێـــت، کـــە بەشێوەیەکی گشتی ئەرکی سەرشانی مرۆڤ و بەتایبەت موسڵمانانە.

قورئان و فـەرموودە کـە بـریتیین لـە دوو سەرچـاوەی ڕەسـەنی ئیـسلام، هــەرگیز بانگەشــەی ئــەوەیان نــەکردووە مرۆڤــی موســڵمان تــەنها هــەوڵی بەدەستخستنی زانستە ئیسلامییەکان بدات، بەڵکو بەدەر لە بەدەستخستنی زانــستە ئەزموونییــەکان، وەڵامــی پــەیامی قورئــان نادرێتــەوە. تەنانــەت هەڵبژاردنی ناوی سوورەتەکانی قورئانیش ئاماژەیەکی ڕوونە بـۆ تـەکامول و پێکهاتــەی یــەکانگیری نێـوان زانـستە ئیـسلامی و زانـستە ئەزموونییــەکان. ئەگەر بەشێوەیەکی ڕووکەشیش سەیری ناوی سوورەتەکان بکرێت، هەسـت بەو ڕاسـتییە دەکرێـت، بۆنموونـە: کاتێك دەگوترێـت تـەکامول بریتییـە لـە گرێـدان و وابەسـتەکردنی گـەردوون و کۆمەڵگـە و نـاخی مـرۆڤ بەیـەکتر و، وابەســتەکردنی هــەردوو جیهــانی بینــراو و نــەبینراو، بــەڕوونی لــە نــاوی سوورەتەکان هەماهەنگی و یەکانگیرییەکی لەم چەشنە دەبیندرێت.

لە ڕەهەندە گەردوونییەکەش، لە قورئاندا سوورەتەکانی (الرعد، الكهـف، النـور، فـاطر، الـدخان، الـنجم، القمـر، الملـك، التكـوير، الانفطـار، الانـشقاق، الـبروج، الطـارق، الفجـر، الـشمس، الليـل، الـضحي، الزلزلـة، العـصر، الفلـق) بەدیدەکرێن.

دیـارده گەردوونییـەكانی وەك (هەورەتریـشقە، ئەشـكەوت، روونـاكی، دووكـەڵ، ئەسـتێرە، مـانگ، خـۆر، شـەو، چێـشتەنگاو، بەرەبـەیان و كـەلو ...هتـد) هــەر لــەخۆڕا وەك نـاوی سـوورەتەكانی قورئـان هەڵنەبـژێردراون. پەروەرێنی كاربەجێ دەبێت رەچاوی كۆمەڵێك حیكمـەت و نهـێنی كردبێـت، كە لەڕێگەی ناوی ئەم سوورەتانەوە دەیەوێت پەیامێكی گرنگ بە مرۆڤایەتی رابگەیێنێت.

سـەرنج بـدە، لـە رەهەنـدە كۆمەڵایەتییەكـە، بەهەمانـشێوەی رەهەنـدی گەردوونی، سوورەتەكانی (آل عمـران، النـساء، المائـدة، الـشعراء، الـشوری، المجادلـة، الممتحنــة، الـصف، الطلَـاق، الإنـسان، النبـأ، النازعـات، عـبس، المطففین، البینة، التكاثر، الهمزة، النصر، الناس) بەدیدەكرێن. مانـای نـاوی ئەم سوورەتانەش روونـە، كـە بـریتیین لـە چـەند دیاردەیـەكی كۆمەڵایـەتی، سـەیر كـە وشـەی (ئـال، ئـافرەت، خـوان، شـیعر، راوێـژ، گەنگەشـە، تاقیكردنەوە، جیابوونەوە، هەواڵ، كێشمەكێش، تووڕەبـوون، تـەرازووبازی، شاهێدی، خڕكردنەوەی سامان، تانە و تەشـەر، سـەركەوتن) هـەموو ئەمانـە لەیەك كاتدا ناوی سوورەتن، بەڵام دیاردەی كۆمەڵایەتی روون و ئاشكران كە هـیچ كەسـێك ناتوانێـت رەتیـان بكاتـەوە. ئـەم دیـاردە كۆمەڵایەتییانـە بـە سەردەم و شوێن و كۆمەڵگەیەكی دیـاریكراوەوە پـەیوەسـت نـین، بـەڵكو لـە هەموو سەردەم و شوێن و كۆمەڵگەیـەك، مـرۆڤ ناتوانێـت بـەبێ ئـەم دیـاردە كۆمەڵایەتییانە درێژە بە ژیان بدات.

سەبارەت بـە رەهەنـدی دەروونـیش، سـوورەتەكانی (التوبـة، المؤمنـون، الفرقـان، غـافر، المنـافقون، عـبس، الـشرح، الإخـلاص) هـەن. ئـەم ناوانـە،

هاوشانی ناوی سوورەتەکانی تر، خاوەنی رەهەندی تایبەت بە خۆیانن. سەرنج بدە چەمکەکانی (پەشیمانی و گەڕانەوە، باوەڕ و باوەڕداران، جیاکاریکردن لەنێوان راست و ناڕاست، داوای بەخشین و لێبووردن، دووڕوویی، توڕەبوون، سینەفراوانی و دڵسۆزی) بریتیین لە چەند کردارێکی ناوەکیی مرۆڤ و، راستەوخۆ لەژێر کاریگەری بنەماکانی دەروونناسییەوە سەرچاوە دەگرن.

سەبارەت بە بەیەکبەستنەوەی دنیا و دواڕۆژ، سوورەتەکانی (الجاثیة، الحشر، التغابن، الحاقة، القیامة، الغاشیة والقارعة) روونترین بەڵگەی ئەو راستییەن، کە قورئان تەنیا لەڕێگەی ناوی سوورەتەکانەوە ئەنجامی داوە. ئاشکرایە هەر یەکێك لە ناوی ئەم سوورەتانە بریتییە لە ناو و ئاوەڵناوەکانی رۆژی دوایی و رووداني قیامەت. قورئان بەیەکبەستنەوەی جیهانی بینراو نەبینراو (عالم الغیب والشهادة)ی فەرامۆش نەکردووە. ناوی سوورەتەکانی (الجن، المرسلَات والإخلاص) واتە (جنۆکە، فریشتەی پەیامبەر و دڵسۆزی) ئاماژەن بە هەبوونی جیهانێکی نەبینراو، کە مرۆڤ لەڕێگەی سرووشی خوداییەوە نەبێت، بەتەنیا لەڕێگەی زانستە ئەزموونییەکان ناتوانێت پەییان پێببات.

پێکهاتەی قورئان، دەستەواژە و ژمارەی ئایەت و سوورەت و ریزبەندی نێوانیان، لەژێر فەرمان و چاودێریی پەروەرێنی باڵا ئەنجامدراوە، ئیدی هەر ئەویش خۆی دەزانێت چەند نهێنی زل و زەبەلاح لەپشت ئەم وردەکارییانەدا هەن و، مرۆڤ ناتوانێت بەئاسانی پەیان پێببات.

بەم چەشنە قورئان رایەڵە و پەیوەندی نێوان زانستە قورئانی و زانستە ئەزموونییەکان دروست دەکات. نە هەر ئەوەندە، بەڵکو پەیوەندی نێوان جیهانی بینراو و نەبینراویش ڕووندەکاتەوە. ئەم بانگەوازەش تەنیا بۆ ئاشناکردنی مرۆڤە بە حەقیقەت و، چییەتی خۆی و دەوروبەر و گەردوون و بوونەوەر، لەڕێگەی ئاشنابوون بەو حەقیقەتە، مرۆڤ زیاتر بە پەروەرێن و بەدیهێنەرەکەی ئاشنا دەبێت.

پێویستی هێنانەپێشەوەی تەکامول لەنێو زانستەکاندا، بەواتای ئەوە نایەت تەواوی بوارە زانستی و مەعریفییەکان لەڕووی گرنگییەوە یەکسانن بەیەك، بەپێچەوانەوە،پلەبەندی نێوان ئەم کایە زانستی و مەعریفییانە لە دیدی بیرمەندانی پەیمانگا و بانگەشەکارانی تەکامولی مەعریفی کارێکی پێویستە. ناکرێت ئاماژە بە ریزبەندییەکی دیاریکراو بکرێت، ئەویش وەك کلێشەی قووچەکی لەسەرەوە بۆ ژێرەوە، لە گرنگترەوە بۆ گرنگ دیاری بکرێت، بەڵکو ئەم ریزبەندییە بۆ کات و شوێن جێهێڵڕاوە.

بەواتایەکی تر، لەم شوێنانەی زانستە ئەزموونییەکان لە ترۆپکن و هیچ گرنگییەك بە زانستە ئاسمانییەکان و بەها باڵا گەردوونییەکان نادات، لەم کات و شوێنەدا، وا پێویستە بانگەشەی کاراکردنی زانستە ئیسلامییەکان و بەها باڵاکان بخرێتە بەرنامەی کارەوە. بەهەمانشێوە، لەم کات و شوێنانەی زانستە ئیسلامییەکان تا دواترۆپك و لووتکە گرنگییان پێدەدرێت، لەهەمان کاتدا زانستە ئەزموونییەکان لە گیانەڵڵادان، لەوکاتەدا واپێویستە بانگەشەکردن بۆ گرنگیدان بە زانستە ئەزموونییەکان ببێتە کاری لەپێشینە.

بەشێوەیەکی گشتی، لە تەواوی بوارە مەعریفی و هزرییەکاندا، پلەبەندی کارێکی لەپێشینەیە، خوودی دیاریکردنی گرنگ و گرنگتر، پێویست و پێویستتر، بۆ لیژنەیەکی تایبەتمەند و پسپۆڕ لەم بوارانە دەگەڕێتەوە، پێویستە دوای تێڕامان و توێژینەوەی ورد و قووڵ، بەرنامەی کار دیاری بکرێت، بەشێوەیەك لە گرنگترەوە بۆ گرنگ، بەپێی خواست و پێداویستییەکانی کۆمەڵگە، بە رەچاوکردنی هەردوو رەهەندی کات و شوێن هەنگاوی بۆ بنرێت. دیاریکردنی گرنگ و گرنگتر، پێویست و پێویستتریش، بۆ رایەڵە و پەیوەندی نێوان جۆری زانستەکە و گەیشتن بە حەقیقەت دەگەڕێتەوە، واتە کامە بواری زانستی و مەعریفی زووتر و روونتر مرۆڤ دەگەیێنێتە حەقیقەت، کەواتە ئەو بوارە لە تەواوی بوارەکانی تر لەپێشترە. بەهەمانشێوە، کامە زانست دەتوانێت زیاتر باری لاری کۆمەڵگە راست و هاوسەنگ بکاتەوەو خزمەتی زیاتر بە چینەکانی کۆمەڵگە بکات، ئەوا کاراکردنی ئەو بەراورد بە بوارەکانی تر لەپێشتر دەبێت.

هەر لەم روانگەیەوە، ئەگەر سەیری جەستەی مرۆڤ بکەین، بەڕوونی دیارە، گرنگی مێشك و دڵ لەپێش ئەندامەکانی ترەوەیە، بۆیە وا پێویستترە زیاتر گرنگی بەم دوو ئەندامە بدرێت، بەڵام ئەمە هەرگیز بەواتای فەرامۆشکردن و پەراوێزخستنی ئەندامەکانی تری جەستە نایەت، ئەگەرچی لە کاتی سەرپشککردن لەنێوان لەدەستدانی دڵ یان مێشك لەگەڵ ئەندامێکی تر، بەدڵنیایەوە دەبێت پارێزگاری لە مانەوەی دڵ و مێشك بکرێت، بەپێچەوانەوەش، ژیان لەدەست دەچێت و جەستەش خامۆش بێت.

**بەمشێوەیە قورئان ڕێنماییمان دەکات زانستەکانی سرووش لەگەڵ زانستە ئەزموونییەکان یەکانگیر بکەین، هەروەها بەوردی لە بابەتەکانی قورئان و گەردوون و دەروون و دیاردە کۆمەڵایەتییەکان وردبینەوە. سەرەتای وروژاندنی بابەتێکی وەك تێکهەڵکێشکردنی هەردوو پەرتووکی خوێنراو و بینراو (قورئان و گەردوون) مشتومڕ و کێشمەکێشمێکی زۆری بەدوای خۆیدا هێنا، لەکاتێکدا هەر لە قورئاندا، لە چەندین شوێن دیاردە دەروونی و گەردوونییەکان بە ئایەتی خوای باڵادەست و توانا هەژمار دەکات. بۆیە تێزێکی لەم چەشنە، بەتەواوی ماناکانی وشە، هەڵقوڵاوی ناخی قورئانە، نەك بابەتێکی دروستکراو بێت، بگرە لە کۆتایی سوورەتی (ال عمران) بەڕوونی تێڕامان و وردبوونەوە لە دیاردەگەردوونییەکان بە خواپەرستی هەژمارکراوە، جیاوازی نییە ئەم وردبوونەوە و تێڕامانە تەنیا کردارێکی هزری بێت یان لە چەشنی توێکار و توێژینەوەی زانستی بێت، بەڵکو ئەوەی دووەمیان چاکتر و بەرهەمهێنتریشە لە کرداری هزری رووتدا،**

﴿وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا﴾ آل عمران: ١٩١.

**تەکامول جیا لەوەی هەڵقوڵاوی پەیامی قورئانە، پێویستییەکی حەتمیشە بۆ جێبەجێکردنی ئەرکی جێنشینایەتی و ئاوەدانکردنەوەی زەوی. لەبەرامبەر هەستان بە کارێکی مەزنی ئاوا، پێویستە ئاوێتەکردن و یەکانگیرییەکی تەواو لەنێوان سرووش و گەردوون و پەیوەندیی کۆمەڵایەتی و بواری دەروونی بێتەئاراوە، چونکە بە پەراوێزخستنی لایەنێك لەم بوارانە، ئەداکردنی ئەرکەکە بەدروستی ئەنجام نادرێت. بەرهەمهاتن و کاراکردنی هزر و مەعریفەیەکی لەم چەشنە، هەنگاوێکی گرنگە بەرەو میانڕەوی لە کایەکانی**

ژیاندا. لەم ڕێگەیەوە مرۆڤ دەتوانێت بەشێوەیەکی میانگیرانە بەراوردکاری لەنێوان جەمسەر و ژانەر و دووانەکان بکات، وەك (تاك و کۆمەڵ، مادده و ڕۆح، دنیا و دواڕۆژ، خود و ئەوانیتر، ئەرك و ماف، بەرپرسیاریەتی و پاداشت).

یەکێك لە کێشە سەرەکییە هزری و مەعریفییەکان بریتییە لە ناهاوسەنگی لەنێوان ئەم ژانەرانەی سەرەوە، زۆرکات گرنگی بە تاك دەدرێت لەسەر حیسابی کۆمەڵگە یان بەپێچەوانەوە، هەروەها خۆپەرستی و دونیاداری و داواکردنی ماف و پاداشت بووەتە ویستێکی گشتی بێ ڕەچاوکردنی دۆخی ئەویتر و دینداری و ئەنجامدانی ئەرك و بەرپرسیاریەتییەکانی مرۆڤ، ئەمەش پێویستبوونی کاراکردنی کۆی ئەم دەروازانە دێنێتە پێشەوە کە دەبنە شادەماری گێڕانەوەی هاوسەنگی بۆ تاك و کۆمەڵگە.

# بەشی دوانزەیەم
# بەربەست و مەترسیەکانی بەردەم تەکامول

یەکێك لە رێسا بنەڕەتییەکانی ژیانی خۆڕسکانە و سروشتییانەی مرۆڤ، بریتییە لە رێکخستن و ریزبەندکردنی کار و چالاکی و خواست و پێداویستییەکان. دابەشکردنی ئەم کار و خواستانەش بەگوێرەی چەند یەکەیەکی جیاجیا و دواتر کۆکردنەوەیان لەژێر یەکەیەکی گشتگیری وەك چەتر،کارێکی پێویستە. لەوانەیە پێویستییەکی لەم چەشنە، هۆکارێکی سەرەکی بووبێت لە دامەزراندنی چەندین بوار و کێڵگەی مەعریفی جۆراوجۆر، کە هەریەکێك لەم بوار و کێڵگانە چەند لقێکی لێ بووەتەوە، سەرەنجام دەیان بوار و سەدان و هەزاران لق و بەشی مەعریفی سەریانهەڵداوە.

پاڵنەری سەرەکی بۆ دروستبوونی ئەم هەموو بوار و لقە مەعریفییە هەمەچەشنانە، بریتییە لە پڕکردنەوەی ئەو پێویستییەی مرۆڤ، کە خۆی لە رێکخستنی لایەنی هزری و مەعریفی و رێکخستنی کار و چالاکییەکان

دەبینێتـــەوە. ئاشـــکرایە زۆربـــەی دۆزینـــەوە زانـــستی و پیـــشەسازییەکان، بەتایبەت لە مێـژووی زانـست و تەکنـەلۆژیادا، لەسـەر دەسـتی ئـەو زانایانـە سەریانهەڵداوە، کە پسپۆڕییەکی وردیان لە بوارێکی دیاریکراودا هەیە. وێڕای ئەوەش، هەندێ زانا خاوەنی پاشخان و عەقڵییەتێکی داهێنەرانەن، بەڵام لـە زۆربـەی کاتـدا، تـەنیا هـەوڵی بەدەسـتهێنانی زانیـاری ورد و پـسپۆڕی لـە بـــوارێکی دیـــاریکراودا دەدەن، بۆیـــە زۆر بەکـــەمی لـــە چوارچـــێوەی پسپۆڕییەکەیان دەچنەدەر، بگرە تەنیا لە بازنە و خولگەی پسپۆڕیەتەکەیان توێژینەوە و لێکۆڵینەوە ئەنجام دەدەن.

هەرچـەندە هـەوڵی بەرهـەمهێنانی یەکەیـەکی هەماهـەنگ و یـەکانگیری مەعریفی کە زۆربەی بوارە مەعریفییەکان لەخۆبگرێت، بەپێویست دەزانرێت، بەڵام ئەمە بەو واتایە نایەت کەسانی خاوەن پسپۆڕی ورد و دیاریکراو توانای داهێنانیـــان نییـــە، بـــەڵکو ئـــەوان بەشـــێوەیەکی رێـــژەیی لـــە داهێنـــان و گەشـــەپێدانی توانـــا زانـــستی و تەکنـــەلۆژی و پیـــشەسازییەکانیان هـــەر بەردەوامن، بەڵام دەکرێت لەڕێگەی تەکامولی مەعریفییەوە رێژەکە بەرزتر و بەرهەمەکە خزمەتکارتر بخرێتە بەردەستی مرۆڤایەتی.

راستییەکی حاشاهەڵنەگر سەبارەت بەم بابەتـە لەئارادایـە، کـە بەشـێکی زۆری پـسپۆڕان، بەتایبـەت گـەنجان، گرنگـی تـەواو بـە سـەلماندنی خۆیـان لەڕێگەی ئەنجامدانی توێژینەوە لە پسپۆڕی ورد دەدەن، تەنانەت هەندێکیان پێیانوایە، کارکردن لەسەر شێوازی تەکامول و ئاوێزانبوونی زانستەکان هەلی پێشبڕکێ و پێشکەوتنیان لـە بوارەکـەی خۆیـان لەدەسـتدەدات. ترسـی لـە دەستدانی هەلێکی لەم چەشنە، رەنگە ببێتـە هەڕەشـەیەکی جـددی لەسـەر

داهاتووی خۆیان بەگشتی و ژیانی ئەکادیمی بەتایبەتی. هەرچەندە ئەم بۆچوونە لە وەهمێك زیاتر نییە، بەڵام مەترسییەکی لەمجۆرە، هەندێ کات زیاتر لەسەر شێوەی دێوەزمەیەك،خەیاڵدانی توێژەر و پسپۆڕان دادەپۆشێت، بەتایبەت ئەو کاتەی کۆمەڵێك کەس باسی تەکامول دەکەن، جگە لە ناوەکەی شتێکی تری لێنازانن، یان رووکەشانە لە لێوارەکانیدا مەلەوانی دەکەن. هەندێ کەسی تر، لەژێر ناوی تەکامول جگە لە رۆچوون لە وردکردنەوە و پارچەپارچەکردنی بوارە مەعریفییەکان، هەنگاوێکیان بەرەو هەماهەنگی و وابەستەکردنی بوارە مەعریفییەکان نەناوە. هەندێکی تریان لەبەرئەوەی قسە لەسەر هەموو بابەتێك دەکەن، بەبۆچوونی خۆیان بەباشی لە بابەتەکەدا رۆچوونە، کەچی لە هەقیقەتدا نەیانتوانیوە رووکەشەکەشی بڕوشێنن. کەواتە، خۆهەڵقورتاندنی بەشێك لە توێژەران لە کۆباس و تێزەکانی تایبەت بە تەکامولی مەعریفی، نەك هەر بە سوودی پڕۆژەی تەکامول نەشکاوەتەوە، بگرە زۆرجار بووەتە خاڵی ساردکەرەوەی کۆمەڵێك توێژەری جددی.بەهۆکاری خەمساردی و میتۆدی پەڕپووت و نالەبار، کە هیچ دەرەنجام و بەرهەمێکی دڵخۆشکەری ئەوتۆی لێ سەوز نەبووە، پڕۆژەیەکی وەك تەکامولی مەعریفی نەیتوانیوە ببێتە جێی سەرەنجی پسپۆڕانی تر. ئەم خاڵەش بە یەکێك لە مەترسیدارترین بەربەستەکانی تەکامولی مەعریفی هەژماردەکرێت.

بەرهەمهێنانی یەکەیەکی مەعریفی گشتگیر و فرەڕەهەند کارێکی ئاسان نییە، لەهەمان کاتیشدا، ئەستەم و مەحاڵیش نییە. ئەگەرچی بەتەنیا

لەڕێگەی بەستنی چەند کۆڕ و سمینارێك، یان نووسینی پەرتووك و نامیلکە و گوتار ئەنجام نادرێت.

بەشـێك لـە بانگەشـەکارانی تـەکامولی مـەعریفی، بەرهـەمهێنان و بەرجەستەکردنی پڕۆژەیـەکی لەمـچەشنە، لەڕێگـەی خـستنەڕووی لەسـەر شـێوازی سیـستەمی خوێنـدنی زانکـۆ بـە تاکـە کلیـل و هـەنگاوی سـەرەکی لـەدایکبوونی پڕۆژەکـە دەزانـن. ئەگەرچـی تێگەیـشتن و ئامادەکـاری و بەرجەستەکردنی پڕۆژەیـەکی هـزری و مـەعریفی وەك تـەکامولی مـەعریفی، لـەڕووی تیـۆری و تەنانـەت کردەییـشەوە، پێویـستە لـە ناوەنـدە زانـستی و ئەکادیمییـەکانی وەك زانکۆکـان بخرێتـە بەرنامـەی کـارەوە، بـەڵام بەتـەنیا زیادکردنی هەندێ وانەی ئایینی، یان پەرتووك و بابەتی تایبـەت بـە ئـایین و فەلسەفەی ئایینی، بۆ بەرنامـە و مەنهـەجی قوتابخانـە و زانکۆکـان هـیچ لـە بابەتەکە ناگۆڕێت.

دانـانی سیـستەمێکی خوێنـدنی تێکـەڵ لـە زانـستە ئـەزموونی و زانـستە ئیسلامییەکان لە قوتابخانە سەرەتایی و ناوەنـدی و دواناوەنـدی و تەنانـەت زانکۆ و پەیمانگاکانیش، نابێتە هۆی بەرهـەمهێنانی تـەکامول، بـەڵکو تـەنیا بریتییـە لـە کۆکردنەوەیـەکی زۆرداری و سـەپێنەرانە لـەنێوان دوو بـواری جیاواز. ئـەم دوو بـوارە تـەنیا نـاو و ناوەڕۆکییـان لەیـەك جیـا نییـە، بـەڵکو لەڕووی پێکهاتە و پاشـخانی هزرییـەوە لەیـەك دوورن، مەبەسـتمان لـەم دوو بوارەش، بریتییە لە زانستە ئیسلامی و زانستە ئەزموونییـەکان، بـەم مانـا و پێکهاتەیـەی ئێـستا لـە زانکـۆ لاهـووتی و ئەزموونییـەکان دەبینـدرێن، لـە ڕۆژهەڵات یان ڕۆژئاواشدا جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە.

خاڵی گەوهەری داتەپینی لێکدان و تێکەڵکێشکردنی رووکەشییانەی ئـەم دوو بوارە لەوەدا دەردەکەوێت، کە ئەنجامدەرانی چالاکییەکەی لەمچەشنە، وا گومان بکەن تـەنیا لەڕێگـەی ئـەم کۆکردنـەوە سـەپێنەرانەیە، خوێنـدکار دەتوانێـت پاشـخانێکی مـەعریفی تـەواو و یـەکانگیر و تۆکمـە بێنێتـەدی، بـەجۆرێك بەرگـەی داخـوازیی رۆژگـار و پێکـۆڵ و ئاڵنگارییـەکانی سـەردەم بگرێت. خەیاڵێکی لەم چەشنە، جگـە لـە وەهمێـك زیـاتر شـتێکی تـر نییـە، چونکە عەقڵی مرۆڤ رێگە بـەوە نـادات دژەوانـە کۆبکاتـەوە، چـونکە نـاکرێ زانستێك لەسەر بنەما و رێسایەکی دوور لە ئایین بیناکرابێت، لەگەڵ کۆمەڵێك بابەت و تیۆری ئایینی یەکبگرێتەوە، کە لە مەیدانێکی جیاواز، بە رووحێکـی جیـاواز بینـاکراوە. وێـڕای ئـەوەش، تێکەڵکێـشکردنی سـەپێنەرانەی لـەم چەشنە، کارێکی قورس نییە، چونکە لەپاڵ پەرتووك و وانە زانـستییەکانەوە چەند پەرتووکێکی ئایینییش زیاد دەکرێن.

پرسـیارە گرنگەکـە ئەوەیـە، ئایـا کردارێکـی لـەم چەشـنە بەرهـەم و دەرەنجامی خوازراو و دڵخۆشکەری دەبێت؟ بـۆ دەسـتکەوتنی وەڵامـی ئـەم پرسیارە، دەکرێ خوێنەر ئاوڕێك لە خوێنـدنی کوردسـتان بداتـەوە. لـەکۆی شـەش سـاڵ قۆنـاغی سـەرەتایی و سـێ سـاڵ قۆنـاغی ناوەنـدی، کـە لـە سیستەمی سوێدی پێیدەڵێن بنەڕەتی، لەپاڵ سێ ساڵی قۆناخی ئامـادەیی، وانـەی ئـایین دەخوێنـدرێت. وانـەی ئـایین لـە هـەر ١٢ قۆناغەکـە، بابـەت و کۆباسـەکانی لەلایـەن لیژنـەی پـسپۆڕ نووسـراونەتەوە و هەڵـسەنگێندراون، لەپاڵ وانەکانی بیرکاری، زانست، زیندەوەرزانی، مێـژوو، جوگرافیـا، کیمیـا، فیزیـا، پـەروەردەی مـەدەنی، زمـانی ئینگلیـزی و عـەرەبی دەخوێنـدرێت.

پرسیاره گەوهەرییەکە لێرەدا ئەمەیە، ئایا وانەیەکی وەك پەروەردەی ئـایین یان پەروەردەی ئیسلامی، تا چەند توانیویـەتی خزمـەت بـە هـزر و ئـاوەز و مەعریفەی قوتـابی بکـات؟ تـا چـەند توانیویـەتی هێـزی هـزری و مـەعریفیی قوتابی بدرەوشێنێتەوە، بۆ ئەوەی بەرگەی شالاوی هزری رۆژئـاوا و گومـانی بێباوەڕ و پڕۆژەی ئیلحادی بگرێـت و هەڵنەخلیسکێت؟.

رەنگە پاساوی بێبەرهەمی وانەی پەروەردەی ئـایینی یـان ئیـسلامی، بـۆ ئەوە بگەڕێندرێتەوە کە بەراورد بە بابەتەکانی تر گرنگی تەواوی پێنەدراوە. ئەگەرچــی ئۆبــاڵی بێبەرهــەمی ئــەم وانەیــە، بەشــێکی بــۆ ئــەم هۆکــارە دەگەڕێتەوە، بەڵام خوودی وانەکە بـە زمـانی شـیرینی کـوردی و بەسـاکاری نووسراوەتەوە، تا ئاستێکی باشیش دوورە لە گرێ و رێنووسـی مەتەڵئاسـا، بەشێوەیەك هـەموو کەسـێك گـەر خوێنـدەواری بگاتـە ئاسـتی خوێندنـەوەی رۆژنامەیـەك، دەتوانێـت بیخوێنێــتەوە و لێـی تێبگـات. لەکاتێکـدا بەتــەنیا خوێندنەوە و لێتێگەیشتن بەس نییە، هەروەك چۆن بەشـێك لـەو مامۆسـتا و کادیرە ئەکادیمییانەی ئەم وانەیە دەڵێنەوە، خۆیان پێویستیان بە خوێندنی هەیە تا گوتنەوەی. هەموو ئەم راستییانە بەشێکن لە شکست و بێبەرهـەمی مەنهەجێکی لەمچەشنە، بەڵام هۆکارە سەرەکییەکە ئەم هۆکارانە نین، بەڵکو هۆکارە راستەقینەکەی شکستی پڕۆگرامەکـە شـتێکی تـرە، هـەوڵ دەدەیـن وردتر دەستنیشانی بکەین.

خاڵی سەرەکی داتەپین و شکستی بابەتەکە بـۆ بناخـەی فەلـسەفی نێـوان ئــەم دوو بــوارە مەعریفییــە جیــاوازە دەگەڕێتــەوە. زۆربــەی بابەتــەکانی پەیوەندیـدار بـە زانـستە کۆمەڵایـەتی و ئەزموونییـەکان لەسـەر بناخەیـەك

دامـەزراون، کـە لەگـەڵ بیرکردنـەوەی ئـایینی تێکناکەنـەوە، بگـرە لـە زۆر کاتیشدا تێکدەگیرێن، لێرەدا گەڕان بەدوای چارەسەرکردنی پرسەکە کارێکی گرنگـە، کۆمـەڵێك پـڕۆژەش بـۆ چارەسـەر خراونەتـەڕوو، گرنگترینیـان ئـەم پڕۆژەیە کە لەبەردەستتدایە.

تـەکاملی مـەعریفی تـەنیا بـەم لێکـدان و تێکهـەڵکێـشانە زۆرداریـیـە نایەتەئاراوە، بەڵکو بەشێوەیەکی وا لـەدایك دەبێـت، کـە بنـچینەی هـەردوو جۆری زانستەکان دووبارە دابڕێژرێتەوە، بۆئەوەی هەردووکیان لەسەر بنـەما و بنچینەیەکی فەلسەفی هاوبەش بینا بکـرێن، بەمـەش لـە تێکهەڵکێـشکردنی رووکەشی دەرباز دەبین. هەرکات هـەوڵی پێویـست بـدرێت، هاوشـان لەگـەڵ ویـستی پێویـست، بـە ئاراسـتەی مامەڵـەکردن لەگـەڵ زانـستە ئـەزموونی و مرۆیی و کۆمەڵایەتییەکان، لەسەر بنەمای لەبەرچاوگرتنی بناخە و بنـچینەی یەکەی تەکامول لەنێوان ئەم زانستە جیاوازانە، دەتوانرێ لەڕێگەی بەرنامە و میتۆدێکی تۆکمەی پـەروەردەیی خـەونی بـەدیهاتن و لـەدایکبوونی پـڕۆژەی تـەکامول نزیـك بینـەوە. هاوکـات هـەموو قوتابخانـە و زانکـۆ و دامـەزراوە مـەعریفی و ئـەکادیمی و زانـستییەکان، ئەگـەر بیانـەوێت بـەرەو تـەکامول و یـەکانگیری زانـستی هـەنگاو بنـێن، پێویـستە کـۆی بەرنامـە و میتـۆدی پەروەردەییەکـەی، سـەرلەنوێ لەسـەر بنـەمای یـەکانگیری و تـەکامول دابڕێژنـەوە، بەمـەش هـەنگاوی زۆر گـەورە بـەرەو پێـشکەوتن و خزمـەتی مرۆڤایەتی دەهاوێژن، بەتایبەت ئەو زانستانەی لـەم رۆژگـارە لـە مەڵبەنـد و ناوەندە زانستی و تەکنەلۆژییـەکان کـەمتر رۆڵیـان پێـدەدرێت. بەشـێك لـەم بوارانەش بریتیین لە هزری مرۆیی و سروشتی خۆڕسکی بیرکردنەوەی مـرۆڤ،

مێـژووی زانـستەکان، بیرڕوونــی و رۆشــنبیری، سروشــتی بــەهاکان، بنــەما ڕەوشتییەکان، زانـستی جوانیناسـی، شـێوازەکانی گەشـەپێدانی ژینگـەیی و مرۆیـی و چـەند بابـەتێکی تـر، کـە چـەند پرسـیارێکی گـرنگ و گەوهــەری سەبارەت بە بنچینە و رەچەڵەکی مرۆڤ و پەیام و چارەنووس و، سـەرەنجام و داهاتووی مرۆڤ و مرۆڤایەتی و گەردوون دەوروژێنن.

لەبەرچـاوگرتنی ئـەم زانـستانە، یـان ئاوێتـەکردنی بناخـەی فەلـسەفیی زانستە ئەزموونییەکان لەگەڵ ئەم زانستانەی لەسەرەوە باسـکران، یارمـەتی پسپۆڕان دەدەن تاوەکو بەهێز بن لە بڕیاردان لەبارەی بابەتـە زانـستییەکان و خستنەگەڕی زانست و پسپۆڕیەتییەکان بۆ خزمەتی مرۆڤایـەتی، هـەروەها لــەڕووی بەدەمــەوەهاتن و یارمەتیـدانی ژینگــە و دەوروبــەر چـالاکتر بــن و هۆشمەندانەتر بەشداری لە هەڵوێست و هەڵبژاردنی باشترین بژاردە لە بـوارە کۆمەڵایەتی و زانستی و تەکنەلۆژییەکانـدا بکـەن. لەیـەك کاتـدا، لەبەرامبـەر مرۆڤ و ژینگە و بوونەوەر و گەردوون، رەچاوی ژیـن و ئـایین، دنیـا و دواڕۆژ، بژێوی و خزمەت، تاك و کۆمەڵگە، زانست و بەها، جوانی و پاکی، تەڕدەستی و دەسـتپاکی، خۆنەویـستی و خۆشەویـستی بکـەن. هەمیـشە بـە رووحێکـی هاوسەنگییانە لە بوارە جۆراوجۆرەکـانی کۆمەڵگـەدا جێـی پەنجـەی خۆیـان بنەخشێنن، ئەویش بە کار و چالاکییە ناوازە و سوودبەخشەکانیان، زەوی و شارستانیەت ئاوەدان بکەنەوە.

هاتنەپێـشەوەی کۆمــەڵێ کـادیری بــەهێز، مــژدەی پێــشەنگایەتییەکی تەندروسـت بـە جیهـان دەدات. ئـاوازی خـستنەگەڕی زانـست، لـە خزمـەتی مرۆڤایەتی و ژینگە و بوونەوەر و گەردوون، لەبری وێرانکاری و پەیامی خوێن

و ملشکاندنی مرۆڤ و ژینگە و گەردوون و دژایەتیکردنی بەها و رەوشت و بنەما جوانەکان، دەچرێت.

یەکێك لە پێکۆڵ و تەحەدییەکانی بەردەم بەرنامە و خوێندکارانی زانکۆ بەگشتی و خوێندنی باڵا بەتایبەتی، لە سەدەی بیست و یەکدا، چیتر بریتی نییە لە بەدەستخستنی زانیاری. لە سەردەمی جیهانگیری، خوێندنی باڵا تەنها دەستخستنی زانست و زانیاری نییە، بەڵکو بەم شۆڕشە تەکنەلۆژی و زانستییەی لە هەزارەی نوێ و سەدەی بیست و یەکدا سەریهەڵداوە، کۆی بەربەستەکانی بەدەستخستنی زانست و زانیاری تێکشکێندراون. هەرچەندە ئەم جیهانگیرییە زۆرتر و زیاتر فراون بێت، دەستخستنی زانیاری ئاسان و ساکارتر دەبێت. خوێندکارانی خوێندنی باڵا، لەپاڵ ئەو زانست و زانیارییەی لەسەردەمی شۆڕشی تەکنەلۆژی و چاخی جیهانگیری بە سانایی بەدەستیان دەگات، پێویستییان بە کۆمەڵێك جۆری دیکەی کارامەییش دەبێت، لە چەشنی لێهاتوویی و توانست و دانایی.

تێکهەڵکێشکردن لەنێوان پێکهاتەی زانیارییە پێویستەکان، لەکاتی پێویست، هاوڕێ لەگەڵ بیرکردنەوەیەکی رەخنەگرانە بەرامبەر هەمان زانیاری لەهەمان کاتدا، هەڵسەنگاندنی بژاردە جۆراوجۆرەکان، دەستنیشانکردن و هەڵبژاردنی بژاردەی دروست لە کاتی تەندروست، پێکۆڵ و تەحەداییەکی مەترسیدارە لەبەردەم خوێندکاران. بەرامبەر تەحەدایەکی لەم چەشنە، جوان گوتراوە، "أننا نغرق في المعلومات، ونموت جوعًا إلى

الحكمة"[١]. "ئێمە لە زانیاریدا نوقم دەبین، کەچی بۆ دانایی لە برسان دەمرین".

بەدەستهێنانی ئەم دانابییە، لە دیدی بیرمەندانی ئیسلامی بۆ مەعریفە، لەڕێگەی پرۆژەی تەکامولی مەعریفییەوە ئەنجام دەدرێت. راستە هەستان بە کارێکی ئەوها مەزن، سانا و ساکار نییە، بەڵام بیریشمان نەچێت، چەندین کاری زۆر قورس و مەحاڵ بەئەنجام گەیشتوون. ئەنجامدانی نەشتەرگەری کردنەوەی دڵ و سینگ، رەوانەکردنی دەیەها کەشتی ئاسمانی جۆراوجۆر بۆ بۆشایی ئاسمان و هەسارەکان، دیاریکردنی هێڵکاری بۆماوەییە مرۆییەکان، شیکارکردنی ترشی دی ئێن ئەی و، دەیان کاری قورس و زەحمەتتر، بوونەتە دیاردەیەکی رۆژانە، چۆن دەکرێت بەرامبەر یەکانگیریی زانستە مرۆیی و کۆمەڵایەتی و دەروونی و سروشتی و ئەزموونی و ئیسلامییەکان دەستەوەستان بووەستین.

ئەنجامدانی کاری وەك نەشتەرگەری دڵ و گەشتی ئاسمانی و هاوشێوەکانیان، ئاسان نین، چونکە پێویستیان بە وردەکاری ئێجگار زۆر و لێهاتوویی و کارامەیی جۆراوجۆر هەیە، سەرەڕای تێچوو و سەرمایە و خەرجی بێشومار[2]، سەرەنجام هەر بەئەنجام گەیشتوون، تەنیا لەڕێگەی دەستەیەکی کارگێڕی ماندوونەناس و کۆمەڵە زانایەکی کارامە و لێهاتوو، کە بە وزە و باوەڕ و زانستێکی تۆکمە لەپێناو هێنانەدی ئامانجەکانیان تێدەکۆشن و، شەو و رۆژ بەیەك دەبەستنەوە. کەواتە، هێنانەکایەی

---

[1] ملکاوی، التکامل المعرفی، ص٥٣.

[2] ملكاوي، منهجية التكامل المعرفي، المصدر السابق، ص٥١-٥٤.

یەکانگیریی زانستی لەنێوان بوارە جۆراوجۆرەکان، وەك ئەو کارە قورسانەی باسمان کردن، پێویستی بە هەوڵی شەو و ڕۆژ و دڵسۆزی و کۆکردنەوەی وزە و تواناکان هەیە، لێنەبڕاوانە و ماندوونەناسان کار بکەن تاوەکو لە زەمینـەی کـرداری بەرجەسـتەی دەکـەن. بەمـشێوەیە، لـە بەشـەکانی رابـردوودا، کۆباسـەکانی تایبـەت بـە چـەمکی تـەکامولی مـەعریفی و بنـەماکانی و، پێویـستیی بەرهـەمهێنانی پڕۆژەیـەکی لەمـچەشنە، لـەپاڵ بەربەسـت و مەترسـییەکانی بـەردەم تـەکامول خرانـەڕوو، لـە بەشـەکانی داهـاتوودا، سەرچاوە و ئامرازەکانی مەعریفە بە ئامانجی ئەنجامدانی تەکامول ڕێنـووس دەکەین.

بەواتایەکی تر، لە بەشەکانی داهاتوودا کڕۆکـی بەرهـەمهێنانی تـەکامولی مەعریفی لەڕێگەی شیکردنەوەی سەرچـاوە و ئامرازەکـانی تـەکامول، دواتـر ئاوێتەکردنیان دەخەینەڕوو.

# بەشی سێزدە
# سەرچاوەکانی مەعریفە

لە رابردوودا بەپووختی ماناکانی مەعریفەمان شیکردنەوە، هەم لەڕووی زمانەوانی و هەم لەڕووی زاراوەییەوە. لەم بەشەدا پێویستە هەڵوێستەیەك لەسەر سەرچاوەکانی بەدەستخستنی مەعریفە بکەین، بۆئەوەی زیاتر لە خاڵی گەوهەری نزیکتر ببینەوە. ئاشکرایە بەدەر لە شیکردنەوەی سەرچاوەکانی بەدەستخستنی مەعریفە و زانست و زانیاری، ناتوانین باسی هێنانەکایەی تەکامول یان یەکانگیریی زانست و مەعریفە بکەین، چونکە روونکردنەوەی سەرچاوەکانی مەعریفە، پلەیەك لە پەیژەی کاروانی ناساندنی پڕۆژەی تەکامولی مەعریفی دەبڕێت و هەنگاوێکی تر لە کڕۆکی بابەتەکە نزیك دەبینەوە. شیکاری بابەتی سەرچاوەکانی مەعریفە، یان روونتر سەرچاوەکانی دەستخستنی مەعریفە، پێویستە لە دوو روانگەوە لێکدانەوەی بۆ بکرێت، ئەمانیش بریتین لە سەرچاوە و ئامراز.

بنەما لەسەر ئـەم دابەشـكارييە، پێويـستە سـەرەتا باسـی سەرچـاوەكان بكەين، دواتر لە سەر شيكاركردنی ئەو ئامرازانە بووەستين كە وەك كليل بـۆ كردنەوەی دەرگا پێويستن.

بەواتايەكی تر، كاتێك باسـی سەرچـاوەكانی مەعريفـە دەكرێـت، دەبێـت لەهــەمان كاتيـشدا باســی ئــەو ئامرازانــە بكرێـت كـە لەڕێگـەی كـارلێكردنی نێوانيان، مەعريفە بەدەست دێت. كاتێك دەرگا سەرچاوەی سەرەكی چوونە نێو خانووە، بەبێ كردنەوەی دەرگاكە هـيچ دەرچـە و دەروازەيـەكی تـر بـۆ چوونەژوورەوە نابێت، دەرگای داخراويش بە كليلی خۆی نەبێت، بەدروسـتی و تەندروستی بە هيچ رێگەيەكی ديكە ناكرێتەوە، ئيدی ئەگـەر سەرچـاوەی مەعريفــە بــە دەرگــا بــچوێنين، ئــەوا ئامرازەكــانيش بــريتين لــەو كليلــەی لەڕێگەيەوە دەرگاكە دەكرێتەوە، سەرەنجام لەڕێگەی كردنەوەی دەرگاكەش ئامانجەكە دەپێكرێت، كە بريتييە لە دەستكەوتنی زانـست و زانيـاری (العلـم والمعرفة). كەواتە لەم بەشەدا چەند تيشكێك دەخەينە سـەر سەرچـاوەكانی دەستخستنی مەعريفە.

ســەرەتا پێكهاتــە و مانــای سەرچــاوە ڕووندەكەينــەوە، دواتــر بــەرەو شيكردنەوەيان هەنگاودەنێين.

مەبەستمان لە سەرچاوە لەم توێژينەوەيە، بريتييە لە (المصدر) لە زمانی عەرەبيدا، هەروەها "*source*" لە زمانی ئينگليزيـدا، كـە هـەردووكيان بـۆ (سەرچـاوە) لــە زمــانی كورديـدا وەردەگێـڕدرێن، بــەو واتايــەی كــە ئێمــە مەبەستمانە. هەڵبەتە لە كـوردی وشـەی (چـاوگ) لـە بـوارە زمانەوانييـەكان لەبەرامبەر چەمكی (المصدر) بـەكاردێت. كاتێـك لـەڕووی زمانەوانييـەوە لـە

زمانی عەرەبی دەگوترێت: (صدر الشيء) پێشەوەی شت، واتە سەرەتاکەی دەگەیێنێت[1]. هەروەها (الصدور) پێچەوانەی (الورود)ە، چونکە وارد هاتووە، لە کاتێکدا صادر دەرچووە. بۆیە لە فەرمانگە میرییەکان، ژووری صادرە و واردە بە (هاتوو و دەرچوو) دەکرێنە کوردی. لە قورئانیشدا، بەمشێوەیە فۆرمە جیاجیاکانی (صدر) بەکارهاتوون﴿قَالَتَا لَا نَسْقِي حَتَّىٰ يُصْدِرَ الرِّعَاءُ﴾ القصص: ٢٣ دوو کچەکەی شوعەیب لە وەڵامی مووسا گوتیان: ئێمە ئاژەڵەکانمان ئاو نادەین، تاوەکو شوانەکان ئاوەکە جێدێڵن. لە شوێنێکی تردا، پەروەرێنی تاقانە لە باسی رۆژی دواییدا دەفەرموێت: ﴿يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ النَّاسُ أَشْتَاتًا لِّيُرَوْا أَعْمَالَهُمْ﴾ الزلزلة: ٦، لەم رۆژەدا، خەڵك پۆل پۆل و دەستە دەستە، بە پەرشوبڵاوی بەرەو گۆڕەپانی لێپرسینەوە دەردەچن، بۆ بینینەوەی کار و کردەوەکانیان، کە لە دنیا ئەنجامیان داون.

سەرنج بدە، لە هەردوو ئایەتە پیرۆزەکەدا وشەی (یصدر) بە هەردوو شێوازی سێ پیتی و چوار پیتییەکەی، کە لە بنەڕەتدا دەگەڕێنەوە سەر رەگی (صدر) بە واتای رۆیشتن و دەرچوون بەکارهاتوون. لە جەستەی مرۆڤ (صدر) بە واتای سینە دێت، ئاشکرایە گرنگترین ئەندامی شاراوەی ناو سینە بریتییە لە دڵ، ئەویش بەپێی لێکدانەوەکانی قورئان بریتییە لە کانگای (البصيرة) دیدگابینی و ناوەڕۆکبینی یاخود قووڵبینی.

لە باسی هۆکاری پەندوەرنەگرتنی بێباوەڕان لە چارەنووسی گەلانی رابردوو، لەکاتێکدا ئەوان بە چاوی سەر شوێنەوارەکانیان دەبینین، هاتووە:

---

[1] الجرجاني، التعريفات، تحقيق: إبراهيم الأبياري، بيروت: دار الكتاب العربي، ص١٧٤.

﴿ فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى ٱلْأَبْصَٰرُ وَلَٰكِن تَعْمَى ٱلْقُلُوبُ ٱلَّتِي فِي ٱلصُّدُورِ ﴾ الحج: ٤٦، ئەوان، واتە سەرپێچیکاران، چاویان کوێر نەبووە، بەڵکو ئەو دڵەیان کوێر بووە کە لە سینەدایە. بۆیە پەند و ئامۆژگاری لە شوێنەوار و چارەنووسی گەلانی لەنێوچوو بەهۆی سەرپێچیەکانیانەوە وەرناگرن، ئەوانیش هاوشێوەی گەلانی ستەمکاری لەنێوچوو، سەرقاڵی بێفەرمانی و وەڵامنەدانەوەی پەیامی پەروەرێنن. هەروەها لە شوێنێکی تر، سەبارەت بە دڵ و سینە، دەفەرموێت: ﴿ يَعْلَمُ خَآئِنَةَ ٱلْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِي ٱلصُّدُورُ ﴾ غافر: ١٩، خودا زانایە بە ناپاکی چاوەکان و نیازە گڵاوە شاراوەکانی نێو سینە و دڵان. لەسەر زاری مووسای پەیامهێن (دروودی خوای لەسەر) دەفەرموێت: ﴿ قَالَ رَبِّ ٱشْرَحْ لِي صَدْرِي ﴾ طه: ٢٥، ئەو فەرمووی، ئەی پەروەرێن، سینە و دڵم ئاسوودە و فراوان بکە.

ئیبن عاشور لە شیکردنەوەی وشەی (الصدر) لە زمانی عەرەبیدا، دەڵێت: (الصدر) لە زمانی عەرەبیدا، بۆ (الاحساس الباطني) هەستی ناوەکیی مرۆڤ، بەکاردێت[1]. ئایەتەکانی رابردووش سەلمێنەری ئەم قسەیەن.

سەبارەت بە واتای (المصدر) لە رێزمانی عەرەبیدا، بەو ناوە دەگوترێت کە لە کارەوە وەردەگیرێت و لە رێزمانی کوردی بە (چاوگ) ناونراوە[2].

---

[1] ابن عاشور، التحرير والتنوير، تونس: الدار التونسية للنشر، ١٩٨٤م، ج٣، ص١٣٩.

[2] چاوگ لە لە دیدی قوتابخانەی بەصریەکان، لە رێزمانی عەرەبیدا، لە رووی "إعراب" شیکردنەوەوە، هەمان ئەرك و فرمانەکانی کار ئەنجام دەدات. چونکە چاوگ، رەگ و بنچینەیە "أصل"، کار لە چاوگ وەردەگیرێت. بە پێچەوانەوە کووفیەکان پێیان وایە، کار رەگە، هەروەها چاوگ لەکار وەرگیراوە. بروانە: ابن هشام الأنصاري، أوضح المسالك إلى ألفية ابن مالك، بيروت: المكتبة العصرية، طبعة جديدة، ١٩٩٦م، ص١٧٩.

چاوگ لە زمانی عەرەبیدا چەند جۆرێکی هەیە، وەك: (المصدر الصريح، المصدر المؤول، المصدر الصناعي، المصدر الميمي، المصدر المشتق، المصدر القياسي...الخ)[١].

لە زانستە سروشتییەکانی وەك جوگرافیا و ژینگەناسی، (المصدر) بریتییە لەو شوێنەی کە سامپڵ و نموونەی لێوەردەگیرێت، یان توێژینەوەی لەبارەوە ئەنجامدەدرێت. لە بواری ئاودێریدا دەگوترێت (للمياه مصادر سطحية وجوفية). لە بواری ئابووریدا چەمکی خەرجی و داهات (صادرات وواردات) بەدیدەکرێت. لە بواری بازرگانیدا، هەر کاڵایەك لە بازاڕدا مامەڵەی پێوەدەکرێت، سەرچاوەی بەرهەمهێنان و هەناردەکردنی هەیە.

لە بواری توێژینەوەدا، زنجیرەی سەرچاوە بەکارهاتووەکان، لە لاپەڕەکانی کۆتایی توێژینەوە یان پەرتووك بەدیدەکرێن. کە لە ناونیشانی پەرتووك و توێژینەوە و نامیلکە و پێگەی ئەلیکترۆنی خۆی دەبینێتەوە، کە توێژەر یان نووسەر لە نووسینەکەیدا پشتی پێبەستوون، لە عەرەبیدا بە (قائمة المصادر والمراجع)، هەروەها لە ئینگلیزیدا بە "*bibliography*" دەناسێنرێن. لە زانستە ئیسلامییەکانیش لە هەردوو بواری (الفقه، أصول الفقه) باسی سەرچاوە دەکرێت، کە بە (مصادر التشريع الإسلامي) ناوەزەد دەکرێن. ئەم سەرچاوانەی تەشریعی ئیسلامی بەسەر دوو بەرە دابەش دەبن، سەرچاوەی رەسەن (أصلی) هەروەها سەرچاوەی (فرعي) لاوەکی. هەندێ زانا بەشی دووەم بە سەرچاوەی (عقلي) پێناسە دەکەن[2].

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[2] مصطفى إبراهيم الزلمي، أصول الفقه في نسيجه الجديد، نشر إحسان، ط٢٣، ٢٠١٤، ص٤٢.

بەشـی یەکـەمیان بـریتیین لـەو سەرچـاوانەی کـۆدەنگی مەزهەبـەکانیان لەسـەرە، ئـەمانیش چـوار سەرچـاوەن: (قورئـان، فـەرموودە، کـۆدەنگی — إجمـاع، القیـاس). بەشـی دووەمـی سەرچـاوەکان، جیـاوازی لەسـەر پشتپێبەستنیان هەیە، هەندێ لـە مەزهەبـەکان پـشتیان پێدەبەسـتن و وەك سەرچاوەی هەڵێنجانی حوکمە فیقهییەکان سەیریان دەکەن، ئـەوانی تـریش خۆیان لەهەمبەر پرسێکی لەمچەشنە دەبوێرن. ئەم سەرچـاوە لاوەکیانـەش بریتیین لە: (الاستحسان، المصلحة، العرف، سد الذريعة، الاستـصحاب، قـول الصحابي، شرع من قبلنا..) ئەم سەرچاوانە، بە هەردوو بەشـەکەوە بـریتیین لە مەڵبەند و ناوەنـدی پـشتپێبەستن لـەکاتی بڕیـاردان لەسـەر بابـەتێك، بـە شەرعیبوون یان ناشەرعیبوون.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بە جیاوازییەکی ورد بکەین، لەنێوان شـەریعەت و فیقهدا، کە بەشێك لە خوێنەران تێکەڵیان دەکەن، یەکەمیان تەنیا دەقەکانی قورئان و فەرموودەی صەحیح دەگرێتەوە، دووەمیان بریتییە لـە تەفـسیر و راڤە و شیکاری زانایان بۆ ئـەم دەقانـە، بەمـشێوەیە یەکـەمیان پابەنـدبوون پێوەی ناچارییە، بەپێچەوانەی دووەم.

کەواتە لەکاتی بڕیاردان لەسەر دروستی و نادروسـتی کـارێکی دیـاریکراو، پێویستە زانا (فەقیـە) بـۆ ئـەم سەرچـاوانە بگەڕێتـەوە، هـەتا حوکمەکـە لـە قورئان و فەرموودە و کۆڕا روونکرابێتەوە، ناکرێت پـشت بـە سەرچـاوەکانی تر ببەسترێت، لە کاتی نەبوونی دەقێکی روون و ئاشکرا لە سەر پرسەکە، لە

قورئـان و فـەرمووده و كـۆڕا، ئینجـا لـە سەرچـاوەكانی تـر بـۆ دۆزینـەوەی حوكمە فقیهییەكە هەنگاو دەنرێت[1].

كەواتە لەڕووی كردارییەوە كاتێك پرسێك دێتەپێشەوە، خـاوەن پرسـەكە بـۆ زانـینی حوكمـە فقهییەكـە پرسـیار لـە زانایـەك دەكـات، زاناكـەش بـۆ دەستكەوتنی حوكمەكە لە سەرچاوە رەسەنەكان دەگەڕێت، ئەگـەر دەسـتی نەكەوت، پێویستە لەژێر چەتری سەرچاوە عەقڵییەكان ئیجتهاد بكات، بنەما لەسەر رێسا كارپێكراوەكانی بوارەكە، حوكمی فیقهی دەست بخات. كەواتە، "پرسەگەر (پرسیاركار)، زانا، سەرچـاوەی گـەڕان بـۆ حوكمـە فیقهییەكـە و حوكمی فیقهی" لەم پرۆسەیەدا كاران.

ئەگەر لە دیـوێكی فراوانـی تـەكاملی سـەیری بابەتەكـە بكـەین، خـاوەن پرسیار بـۆ دەسـتكەوتنی پرسـیارەكە، هانـای بـۆ خـاوەن زانـست بـردووە، خاوەن زانستیش لەڕێگەی پشتبەستن بە ئامرازەكانی هەڵێنجانی حوكمەكان لە سەرچاوەكان، حوكمەكەی بۆ خاوەن پرسیار روونكردووەتەوە، ئەگەرچی لـە رووكەشـدا زانـا وەك سەرچـاوە لـەم پرۆسـەیەدا دەردەكـەوێت، بـەڵام لەڕاسـتیدا ئـەو تـەنیا ئـامرازە، بـەڵكو سەرچـاوە بریتییـە لـەو شـوێنەی حوكمەكـەی لـێ وەردەگیرێـت. لـەنێو ئـەم سەرچـاوانەش تـەنیا سرووشـی خودایی (الوحي الالهي) بریتییە لە سەرچاوەی رەسەن.

---

[1] بروانە: ملكاوى، منهجية التكامل المعرفي، ص٢٠٧.

دەکرێت کۆی پرۆسەی تەکامولی مەعریفی و سەرچاوە و ئامرازەکان لەسەر شێوازی ئەم نموونەیەی سەرەوە روون بکەینەوە. بەمشێوەیە: ((پرسەکە مەعریفەیە، خاوەن پرس مرۆڤە، زاناش خودایە))، ئیدی پێویستە لەم نێوەندەدا ئامراز و سەرچاوەکانی بەدەستگەیشتنی ئەو مەعریفەیە لە خوداوە بۆ مرۆڤ بدۆزینەوە.

بەر لە دەستپێکی شیکردنەوەی سەرچاوە و ئامرازەکان، پێویستە ئاماژە بۆ خاڵێکی زۆر گرنگ بکەین، ناکرێت هیچ زانست و زانیارییەك دەستبخەین، مەگەر لەڕێگەی رێگا و رێوشوێنە گونجاوەکانی پەیوەندیدار بە باتەکەوە نەبێت. ئەم رێوشوێنانەش بەدەر نیین لە کاریگەری سروشتی ئایینی کۆمەڵگە و پاشخانی هزری و لایەنی رۆشنبیری ودیدگای گشتی بۆ گەردوون.

لەپاڵ هەموو ئەمانەشدا، توێژەر دەتوانێت سوود لە ئەزموونی نەوەکانی رابردوو وەربگرێت، جیاوازی نییە، ئەو ئەزموونە بەشێك بێت لە ئەزموونی کۆمەڵگەی خۆی، یان کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکانی تری جیهان، کەواتە ئەم رێوشوێنانە بریتین لە میتۆد (منهج)، هیچ میتۆدێکیش بێ سەرچاوە شکۆفە ناگرێت، چونکە هەموو میتۆد و پرۆگرامێك لە رێڕەو و پەیڕەوەکەی خۆیدا پشت بە چەند کۆڵەگەیەك دەبەستێت، بۆ گەیشتن بەو ئەنجامەی لەڕێگەیەوە هەنگاوی بۆ دەنرێت. بەمشێوەیە لە برگەکانی خوارەوە، بەکورتی ئەو سەرچاوە میتۆدییانە دەخەینەڕوو، کە پێویستە لە پرۆسەی تەکامولی مەعریفی بگیرێنەبەر.

- **سەرچاوەی یەکەم: سرووش**

سرووش بریتییە لە گرنگترین سەرچاوەی ڕەسەنی مەعریفە، هەروەها قورئان بریتییە لە تاکە سەرچاوەی سرووشی ڕەها، کە وەك سەرچاوەی ڕەسەنی مەعریفە هەژمار دەکرێت[1].

کۆی بیرمەندانی پەیمانگای جیهانی هزریی ئیسلامی، کۆکن لەسەر ئەوەی سرووش سەرچاوەی سەرەکی دەستخستنی مەعریفەیە. سرووش تەنیا قورئان ناگرێتەوە، بەڵکو کاتێك دەگوترێت سرووش، ئەوە کۆی پەرتووك و پەڕاوە ئاسمانییەکان بێ جیاوازی دەگرێتەوە. لەڕووی هزری و مەعریفییەوە، چۆن قورئان وەك سەرچاوەی مەعریفە هەژمار دەکرێت، بەهەمانشێوە تەورات، ئینجیل، زەبوور، پەڕاوی ئیبراهیم، مووسا و پەیامهێنانی تریش سەرچاوەی مەعریفە و زانستن. لەڕووی کردارییەوەش، تەنیا قورئان لەنێوان پەرتووك و پەڕاوە ئاسمانییەکان لەم سەردەمەدا بە سەرچاوەی مەعریفە هەژمار دەکرێت، چونکە پەرتووك و پەڕاوە ئاسمانییەکانی تر، پاڵپشت بە بەڵگەی قورئانی و بەڵگەی مێژوویی دەستکاریکراون، بۆیە ناکرێت ئەو پەرتووکە ئاسمانییانەی ئێستا

---

[1] کاتێك دەڵێین سرووشی خودایی ڕەها بریتیە لە سەرچاوەی سەرەکی مەعریفە، تەنها قورئان دەگرێتەوە. ڕەنگە بوترێت ئەی فەرموودە؟ لە وەڵامدا دەوترێت، فەرموودە سرووشی خودایی ڕەها نیە، بەڵکو بەشێوەیەکی ڕێژەیی بەشێکە لە سرووشی خودا، لە بەر دوو هۆکار. یەکەمیان: چونکە بەشێکی زۆری فەرمووده لاوازەکان، پشتیان پێ نابەسترێت. جیاکردنەوەی فەرموودەی ڕاست و ناراست، کردارێکی قورسە، ئەگەرچی زۆربەی یەکلاکراوەتەوە، بەڵام هێشتا وەك قورئان کۆدەنگیان لەسەر نیە. دووەم: قورئان بە وشە و واتا "اللفظ والمعنى" لەلایەن خوداوە هاتۆتە خوارێ بە پێچەوانەی فەرموودە، کە تەنها واتاکەی لەلای پەروەرێنەوەیە.

لەبەردەستی مرۆڤایەتین، جگە لە قورئان، بە سرووشی رەهای خودا هـەژمار بکرێن[1].

کەواتـە قورئـان تاکـە سەرچـاوەی ئاسمـانیی زانـست و مەعریفەیـە، کـە لەلایەن پـەروەرێنەوە لەڕێگەی فریشتەوە بـۆ پـەیامهێن محەممـەد (دروودی خـوای لەسـەر) دابـەزیوە، دەسـتکاری نـەکراوە، هـەروەها خـودا پاراسـتنی لەئەسـتۆگرتووە، بـەهیچ شـێوەیەك مـرۆڤ ناتوانێـت دەسـتکاری بكـات، هەرچەندە هەوڵی دەستکاریکردنیشی بدات. پێکهاتەی قورئانیش بریتییە لە زانستی تایبەت بە پـەروەرێن، فریـشتە، فروسـتادە و پـەیامهێنان، مێـژووی مرۆڤایـــەتی، دروســـتکردنی تەنـــە ماددییـــەکان، دیـــاردە و رووداوە گەردوونییەکان، زانستی پەیوەست بە جیهانی بینـدراو نەبینـدراو. هـەروەها قورئـان بریتییـە لـە سەرچـاوە و کانگـای حوکمـە شـەرعییەکان. تێزەکـانی حـەڵاڵ و حـەرام، کـڕین و فرۆشـتن، خواپەرسـتییەکان، رەوشـت و بـەها گەردوونی و کۆمەڵایەتییەکان، بنەماکانی یاسا و دەستووری وڵات، پایەکانی داد و دادگـەری، هاوسـەرگیری و جیابوونـەوە، مـیرات و وەسـیەت...هتـد، بەشـێکی زۆری قورئـان پێکـدەهێنن. ئـەم بابەتانـەش بـریتین لـە کرۆکـی توێژینەوەکانی بوارە گەردوونی و کۆمەڵایەتی و دەروونی و ئاینییەکان. بۆیە کاتێــك باســی سەرچــاوەکانی مەعریفــە و زانــست بکرێــت، بــەم واتــا و پێکهاتەیەوە، پێویستە قورئان بە سەرچاوەی سەرەکی هەژمار بکرێت.

---

[1] زياد الدغامين، التكامل المعرفي في القرآن الكريم، المجلة الأردنية في الدراسات الإسلامية، المجلد التاسع، العدد (١/أ)، ٢٠١٣م، ص١٧٥.

**سەبارەت بە چەمکی وەحی و پێکهاتەکەی لای موسڵمانان، لە دوو روانگەوە سەیر دەکرێت، لە روانگەی قورئان و کەلەپوور، لە قورئاندا وەحی بریتییە لە سرووشی خودایی بەشێوەیەکیرەها، واتە گرنگ نییە، دواندراو لەرێگەی وەحی خوداییەوە مرۆڤ بێت، یان زیندەوەرێکی تر، بەڵکو کۆی ئەو پەیامانەی خودا بە دروستکراوەکانی داون، بێ چەندیەتی و چۆنیەتی، لە قورئاندا بە وەحی هەژمارکراون، ئینجا لەسەر شێوازی زانراو بێت وەك ئەوەی بۆ پەیامهێنان هاتووە، یان شێوازی نەزانراو، هەروەها لەرێگەی فریشتەوە بێت، یان ئیلهام و نیگا و خەون و خەیاڵ. کاتێك لە قورئان بۆ ماناکانی چەمکی وەحی دەگەرێیت، ئەم ئایەتانە بەدیدەکەیت** ﴿ إِنَّآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ كَمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ نُوحٖ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَٰرُونَ وَسُلَيۡمَٰنَۚ وَءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ زَبُورٗا ١٦٣ وَرُسُلٗا قَدۡ قَصَصۡنَٰهُمۡ عَلَيۡكَ مِن قَبۡلُ وَرُسُلٗا لَّمۡ نَقۡصُصۡهُمۡ عَلَيۡكَۚ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمٗا ﴾ النساء: ١٦٣ – ١٦٤، **لەم ئایەتەدا پەروەرێنی باڵا، باس لەو سرووشە دەکات کە بۆ پەیامهێنان هاتووەتەخوارێ. چەندین ئایەتی تری هاوشێوەی ئەم ئایەتە لە قورئان بەدیدەکرێن. هەروەها، لە فەرمایشتێکی تردا، هاتووە:** ﴿وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنۡ أَرۡضِعِيهِۖ ﴾ القصص: ٧ **لەم ئایەتەدا پەروەرێن ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، سرووش بۆ دایکی مووسا نێردراوە، بۆئەوەی مووسا بە مەلۆتکەیی بۆ نێو ئاوی نیل توورێ بدات. ئاشکرایە دایکی مووسا، پەیامهێن نەبووە، چونکە رووینەداوە ئافرەتێك ببێتە پەیامهێن (پەراوێزێك لەسەر ئەوە بنووسە کە هەندێك لە زانایانی وەك ابو الحسن الاشعري و ابن حزم و قورتوبی) رایان وابووە کە پێغەمبەر بە مانای (النبي) لە ناو**

ئافرەتاندا هەبووە)، لەبەر کۆمەڵێك هۆکار، کە ئێرە جێگەی باسکردنیان نییە، هاوکات سرووشی بۆ دابەزیوە، بەڵام ئایا لەسەر چ شێوازێك بووە، هەر خودا خۆی دەزانێت، چونکە خودا بۆ مرۆڤایەتی روون نەکردووەتەوە، ئەم سرووشە لەڕێگەی فریشتەوە بووە، یان ئیلهام و خەیاڵ و پەیامی دەروونی. سەبارەت بە سرووش بۆ زیندەوەرانی تر، پەروەرێن فەرموویەتی: ﴿وَأَوۡحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحۡلِ أَنِ ٱتَّخِذِي مِنَ ٱلۡجِبَالِ بُيُوتٗا وَمِنَ ٱلشَّجَرِ وَمِمَّا يَعۡرِشُونَ﴾ النحل: ٦٨، ئەم ئایەتە ئاماژەیەکی روونە کە دەشێت سروش بۆ زیندەوەرانی تریش دابەزێت، بەڵام پێکهاتە و چۆنیەتەکەی نەزانراوە[1]. راستە لە قورئاندا بەڕوونی تەنها ئاماژە بۆ دابەزینی وەحی بۆ هەنگ کراوە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە جگە لە هەنگ بۆ گیانلەبەرانی تریش دانەبەزیوە، دەکرێت بۆ غەیری هەنگیش دابەزیبێت، یان دابەزێت. بەمشێوەیە، بۆمان رووندەبێتەوە قورئان بریتییە لە سەرچاوەی سرووشی خودایی رەها، کە داڕێژەری دید و بۆچوونی مرۆڤی موسڵمانە، بەرامبەر بە بەدیهێنەر و، بە دیهێندراوەکان و، ژیانی دنیا و ژیانی دوارۆژ.

هاوکات قورئان بریتییە لە داڕێژەری دیدگای موسڵمان لەهەمبەر سروشت و ناخی مرۆڤ، ئامانجەکانی دروستکردنی مرۆڤ و تێڕوانین بەرامبە جیهانی نەبیندراو و بیندراو (عالم الغيب والشهادة)، بەهەمان چەشن، قورئان بریتییە لە سەرچاوە و داڕێژەری حوکمە شەرعییەکانی وەك: (خواپەرستی، مامەڵە و

---

[1] ملكاوي، منهجية التكامل المعرفي، ص٢١٠.

کڕین و فرۆشتن، ڕەوشت و ئاکار و یاساکانی بیرکردنەوە) کە بریتیین لە ڕێکخەری ڕێگاکانی تێگەیشتنی مرۆڤ، سەبارەت بە تەنە ماددییەکان و، کۆی بیرۆکە و ڕووداو و ئاکار و کردارەکان[1].

لەنێو کەلەپووری ئیسلامیشدا، وەحی دەکرێت بە دوو بەشەوە. بەشی یەکەم، سرووشی ئاشکرا (الوحي الجلي) کە بریتییە لە قورئانی پیرۆز، دووەم سرووشی شاراوە (الوحي الخفي) کە بریتییە لە فەرموودەی پەیامهێن (دروودی خوای لەسەر). لە دیدی مرۆڤی موسڵمان، قورئان و فەرموودە دوو لقی درەختێکن، لە بنەڕەتدا هەردووکیان لەلای زاتی پەروەرێنی تاقانەوە سەرچاوە دەگرن. کاتێک دەگوترێت فەرموودەی پەیامهێنیش (دروودی خوای لەسەر)، دەچێتە ژێر خانەی سرووشەوە، ئەو فەرموودانە دەگرێتەوە کە تایبەتن بە شیکردنەوە و ڕوونکردنەوەی ئەحکامەکانی قورئان، جیاوازی نییە ئەم فەرموودانە کرداری، گوفتاری، یان دانپێدانان بن. سرووش، واتە قورئان و فەرموودە، ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ دەبنە سەرچاوەی زانست. لە بابەتەکانی بیروباوەڕ، حوکمە کردارییەکان، ڕێساکانی ئاکاری تاک، هەواڵی گەلانی ڕابردوو، ئامراز و شێوازەکانی پەروەردە و فێرکردن، ڕاستەوخۆ سرووش ڕۆڵی سەرچاوەی زانستی دەبینێت. ئەم بەشە هەموو ئەو دەقانە دەگرێتەوە کە ڕاستەوخۆ باسی ئەم بابەتانەی سەرەوە دەکەن، هەروەها ڕاستەوخۆ زانست و زانیاری دەخەنە بەردەستی خوێنەر،

---

[1] زياد الدغامين، التكامل المعرفي في القرآن الكريم، ص١٧٩.

هەندێجاریش سرووش راستەوخۆ نابێتە سەرچاوەی زانست، بەڵکو بە ناڕاستەوخۆ مرۆڤ بە زانست و زانیاری دەگەیێنێت.

کۆی ئەو دەقانەی باسی رێنمایی مرۆڤایەتی دەکەن، هەروەها خستنەرووی بنەما گشتییەکان، دید و بۆچوون سەبارەت بە گەردوون و سەرچاوە باڵاکان، کاریگەری راستەوخۆیان لەسەر شێوازی بیرکردنەوە و هەنگاونانی مرۆڤەکان هەیە. لەلایەکی تر، ئەم دەقانە هاندەرن بۆ تێکۆشان لەپێناو دونیاداری و کۆکردنەوەی سامان و سەروەت و گرتنەبەری یاساکانی هۆ و ئەنجام، بۆ ئاشنابوون بە رێسا گەردوونییەکان و، بەگەڕخستنیان لەپێناو باشتر هەڵگرتن و جێبەجێکردنی ئەم سپاردە خودایەیی خراوەتە ئەستۆی مرۆڤ، کە دیارترینی بریتییە لە جێنشینایەتی و ئاوەدانکردنەوەی زەوی، ئەمیش لەڕێگەی ئاراستەکردنی مرۆڤ، لەڕێگەی ئەم دەقانە، بۆ ئاشنابوون بە چەندین رێگەی سەرەکی لێکۆڵینەوە و توێکاری، لەمانە: (لێکۆڵینەوەی مێژوویی، سروشتی و پەروەردەییە). یەکەمیان بۆ ئاشنابوون بە رێسا مێژووییەکان و پەندوەرگرتن لێیان، دووەمیان بۆ ئاشنابوون بە یاسا فیزیایی و کیمیایی و زانستەکانی تر، سێیەمیان بۆ ئاشنابوون بە ناخی مرۆڤ و رێگاکانی ئاراستەکردنی بەشێوەیەکی دروست. بەمشێوەیە جۆری دووەمی دەقەکان، راستەوخۆ زانستبەخش نین، بەڵکو رێنیشاندەر و رێنماییکارن، لە دەرەنجامی کارپێکردن و هەوڵ و تێکۆشان، زانست و مەعریفە بەرهەمدێت.

- **سەرچاوەی دووەم: جیهان "العالم"**

دووەم سەرچـاوەی مەعریفـە و زانـست بـۆ مـرۆڤ بریتییـە لـە جیهـان، گەردوون و بونەوەر. بیرمەندی ئەردەنی (فەتحی حەسن مەلکاوی) پێکهاتەی سەرچاوەی دووەم بەسەر سێ ئاست دابەش دەکات:

**ئاستی یەکـەم: بریتییـە لـە جیهـانی ماددییانـەی سروشـت**، کـە کـۆی بوونـــەوەر و زینـــدەوەر و تەنـــە ماددییـــەکان دەگرێتـــەوە. تـــەواوی تەنـــە بـــچووکەکان، کـــە تـــەنیا لەڕێگـــەی مایکرۆسـکۆب و ئـــامێرە تەکنەلۆژییـــە وردبینەکانەوە دەبیندرێن، تاوەکو دەگاتە کاکێشان و کۆمەڵـە خۆرییـەکان، بەشـێوەیەکی گـشتی هاوشـان لەگـەڵ دیـاردە و رووداوە گەردوونییـەکان سەرجەمیان لەخۆدەگرێت.

**ئاستی دووەم: بریتییە لە جیهانی کۆمەڵایەتیی مرۆڤ.** کۆی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییـەکان لـەخۆدەگرێت، وەك: تـاك، خێـزان، تـیرە، هـۆز، گـەل، کۆمەڵگە، پەیوەندییە کۆمەڵایـەتی و سیاسـی و نێودەڵەتییـەکان. هـەروەها کـۆی سیـستەم و یاسـا کارپێکراوەکـانی کۆمەڵگـەی مرۆڤایـەتی، کـە لەڕێگەیانەوە ئەرك و ماف دیاری دەکرێن.

**ئاستی سێیەم: بریتییە لە جیهانی دەروونی** کە وابەستە و پەیوەستە بە تاکە تاکەی مرۆڤەکان، لەڕووی لایەنی عەقڵ و ژیری، رۆح و جەستە، مـەرگ و ژیان، تەندروسـتی و نەخۆشـی، زانـست و نـەفامی، هـزر و نـاخ، هەسـت و پاڵنەرەکان. **هەروەها** چۆنیەتی بیرکردنەوە و گەشـەکردنی تواناکـان، دواتـر پووکانـەوەی هێـز و توانـا و بەساڵاچـوون، تـا دەگاتـە هەسـتی خۆشـی و

رقلێبوونـەوە و چـۆنیەتی دەربڕینیـان. ئەگەرچـی مـرۆڤ بـەراورد بـە تەنـە گەردوونییەکانی تر بوونەوەرێکی بچووکە لە گەردوون، بەڵام تـا دوا ترۆپکـی ئاڵۆزبوون ئاڵۆزە، لەڕووی پێکهاتە و ناوەڕۆك و فراوانی سیستەم و خڕۆکە و ئەندامـەکانی جەسـتەی. کـۆی ئـەم زانـست و زانیارییانـەی مـرۆڤ لـە ژیانـدا دەستیان دەخات، لەڕێگەی کارلێکردن و تێڕامان و ئەزموون پەیداکردنـە لـە یەکێك لەم سێ ئاستانەی گەردوون و جیهان. ئەم زانست و زانیارییانەش بـە هەڕەمەکی دەستناکەون، بـەڵکو هـەر بـوارە و لـە رێگەیـەکی دیـاریکراوەوە مرۆڤ دەتوانێت پەییان پێ ببات.

هەندێ شت بە ئاسانی دەستدەکەون، ئاسان لـە تێگەیـشتن و سـاکار لـە پێکهاتە. هەندێکی تر، بەپێچەوانەوە قورس لە تێگەیشتن، دژوار لە پێکهاتە. هەندێکی تر، مامناوەند لە هەردوو رووی تێگەیـشتن و پێکهاتـە. هەنـدێکجار لەڕێگـەی بـەکارهێنانی چـەند یاسـا و هاوکێـشەیەك مـرۆڤ دەتوانێـت بـە ئەنجامێکی خوازراو بگات. هەندێکجار لەڕێگەی راڤەی دیاردە و رووداوەکان، هەندێکجاریش رەنگە لەڕێگەی پێشهات و پێشبینی هـەڵقوڵاو لـە ئـەزموون و تاقیکردنەوە مرۆڤ بگاتە ئەو ویست و خواستەی لە پێناویدا تێکۆشیوە[1].

دەرەنجام کۆی جیهانی ماددیی سروشت و جیهانی کۆمەڵایەتی و جیهانی دەروونی، دەچنە ژێر چەتری سەرچـاوەی دووەمـی دەستخـستنی زانـست و مەعریفە. بـە زۆر جـۆر و شـێواز و پەیکـەر، باسـی سەرچـاوەکانی زانـست و مەعریفە کراوە، هەر قوتابخانەیەك ستایل و شێوازێکی دیاریکراوی بۆ تێـز و

---

[1] فتحی ملکاوی، منهجیة التکامل المعرفي، ص٢١٢.

کۆباسەکانی هەیە، بەڵام پەیمانگای جیهانی هـزری ئیـسلامی، لەچوارچـێوە گـشتییەکەدا تـەنها (وەحـی و جیهـان) وەك سەرچـاوەی مەعریفـە و زانـست دەناسێنێت. وەك پێشتریش باسمان کرد، پێکهاتەی وەحی بەسەر دوو بەش دابەش دەبێـت، کـە بـریتیین لـە قورئـان و فـەرموودە. هـەروەها پێکهاتـەی سەرچاوەی دووەمیش بەسەر سێ لق دابەش دەبێت، کـە ئـەمانیش جیهـانی سروشــتی و کۆمەڵایــەتی و دەروونــین. کەواتــە لەچوارچــێوەی شــیکاری و هێڵکاریـدا، هەریەکـە لـە (قورئـان، فـەرموودە، جیهـانی سروشـت، جیهـانی کۆمەڵایــەتی و جیهــانی دەروونــی) بــریتیین لــە سەرچــاوەکانی زانــست و مەعریفــە. بــەم پێیــەش گەیــشتینە دوا وێــستگەی تێزەکـانی تایبــەت بــە سەرچاوەکانی زانست و مەعریفە. لە وێستگەی داهاتوودا خاڵ لەسـەر چـەند وشــەیەکی تایبــەت بــە ئامرازەکــانی دەستخــستنی زانــست و مەعریفــە دەنەخشێنین.

# بەشی چواردە
# ئامرازەکانی مەعریفە

کاتێــك باســی ئامرازەکــان دەکرێــت، بەتایبــەت لــە بــوارە زانــستی و مەعریفییەکان، خەیاڵی خوێنەر بۆ ئامرازە ماددییەکان دەڕوات، وەك ڕێکارە هونەری و ئامێرە تەکنەلۆژی و پێویستییەکانی وەك پەرتووك و توێژینەوە و کۆمپیوتــەر و تاقیگــە...هتــد، کــە لــە پرۆســەی کۆکردنــەوە و شــیکارکردنی داتاکــان، بەتایبــەت لــە بــوارە زانــستییەکان پێویــستن. لــە بــواری زانــستە مرۆییــەکانی وەك کۆمەڵناســی و دەروونناســی، کاتێــك باســی ئامرازەکــان دەکرێت، زیاتر چۆنیەتی ئەنجامدانی چاوپێکەوتنی مەیدانی، ئەنجامدانی ڕاپرسی، شیکارکردنی ئــەنجامی ڕاپرسییەکان، شــیکاری چاوپێکەوتنەکان، لەپاڵ کاروبارە کارگێڕی و هونەرییەکان و هەماهەنگی لەگــەڵ سەرپەرشــتیار دێنەبەرچاو.

گومــان لــەوەدا نییــە ئــەم جــۆرە ئامرازانــە لــە پرۆســەی لێکۆڵینــەوە و توێژینەوەدا گرنگن، چونکە یەکێك لەو بەربەستە قورسانەی لــە کــۆی کایــە زانستی و مەعریفیەکاندا لە وڵاتانی ئیسلامی دێتە ڕێگــەی توێــژەر، بریتییــە لــە کــەمی ئــەم ئامرازانــە، بەتایبــەت لــە بــوارە زانــستییەکاندا. ئاشــکرایە

خراپبەکارهێنان، یان بەردەست نەبوونی یەکێك لەم ئامراز و ئامێرانە ئاستەنگ بۆ توێژەر دروست دەکات. لەم پەڕەگرافەدا، نامانەوێت باسی وردەکارییەکانی تایبەت بەو ئامرازانە بکەین، بەڵکو مەبەستمان لە ئامراز شتێکی ترە، ئەو ئامرازانەی دەمانەوێت بیانخەینەڕوو، زۆر فراوانن، بەشێوەیەك چەندین مانای گەورە و دەرچەی گشتی و مەزهەب و ئایدیۆلۆژی هزری و تیۆرییە گشتییەکان، کە توێژەر دەتوانێت وەك ئامێرەکان بەگەڕیان بخات، لەخۆدەگرێت. تەنیا بەکارهێنانی ئامێر لە پرۆسەی توێژینەوەدا بەس نییە، بۆیە بەشێك لە بیرمەندان بەشێوەیەکی ئێجگار فراوان، باسی ئامرازەکان دەکەن، تەنانەت زانست و مەعریفەش بە ئامراز دەناسێنن[1].

سەبارەت بە پرسی ڕێکخستنی ئامرازە میتۆدییەکان، (سەیفەدین عەبدولفتاح) چوار دەروازە دەخاتەڕوو، کە بەیەکەوە کۆی ئامرازە میتۆدییەکان پێکدێنن.

**دەروازەی یەکەم: بریتییە لە دەروازەی ئامانجبازی (المدخل المقاصدي).**

ئەم خاڵە پشت بە کاراکردنی تیۆری مەقاسیدی شەریعە دەبەستێت وەك پێشەوا شاتبی تیۆریزەی کردووە. بەوپێیەی بابەتی مەقاسد هەڵگری کۆمەڵێك ژانەرە، لە ڕێگەییانەوە دەکرێ لێکۆڵینەوە لە واقیع و ڕووداوە کۆمەڵایەتی و سیاسی و نێودەوڵەتییەکان بکرێت، بە چاوێکی مەقاسیدیانە و دوور لە رووکەشبازی، لێکدانەوە و ڕاڤە و هەڵسەنگاندنیان بۆ ئەنجام بدرێت.

---

[1] محمد أمزيان، منهج البحث الإجتماعي بين الوضعية والمعيارية، فيرجينيا: المعهد العالمي للفكر الإسلامي، ط١، ١٠٠١م، ص١٢٩.

**دەروازەی دووەم: بریتییە لە دەروازەی کەشتینشین (المدخل السفني).**

ئەم خاڵە کار بۆ کاراکردنی فەرموودەکانی پەیامهێن دەکات، ئەویش لەڕووی جەختکردنەوە لەسەر بەرپرسیاریەتی و پابەندبوون بە رەوشتە ئایینی و کۆمەڵایەتییەکان، وەك چۆن سەرنشینانی کەشتی پێویستە بە پاراستنی ئاسایش و دۆخی کەشتییەکە پابەند بن، بەپێچەوانەوە ئەگەر یەکێك لە سەرنشینان کارێکی نابەجێ ئەنجام بدات، کە دەرەنجامەکەی نوقمبوونی کەشتییەکە بێت، کۆی سەرنشینان زەرەرمەند دەبن، نەك تەنیا سەرپێچیکار.

**دەروازەی سێیەم: بریتییە لە دەروازەی چەمکەکان (المدخل المفاهیمي).**

لەم خاڵەدا کار بۆ کاراکردنی چەمك و تێگەیشتنەکانیان دەکرێت، وەك ئەوەی چەمکەکان بریتین لە کۆمەڵێك مەنزوومە، کە لەڕێگەیانەوە دەتواندرێت شیکاری دیاردە کۆمەڵایەتییە هاوبەشەکان بکرێت.

**دەروازەی چوارەم: بریتییە لە بیرۆکەی نموونەی مەعریفی** (النموذج المعرفي) کە (تۆماس کۆهن) تیۆریزەی کردووە. بەوپێیەی ئەم بیرۆکەیە بریتییە لە ئامرازێکی بیناکار و شیکاری لەبارەی نموونە هزرییەکان، کە باڵ بەسەر کۆمەڵگەی زانستیدا دەکێشن، لەڕێگەی ئەنجامدانی توێژینەوە و رێگاکانی بیرکردنەوە[1].

کەواتە، هەر چوار دەروازەی بیرکردنەوەی مەقاسیدیانە، هەستکردن بە بەرپرسیاریەتی وەك کەشتینشین، تێگەیشتن لە چەمکەکان، کاراکردنی

---

[1] سیف الدین عبدالفتاح، المنهجیة وأدواتها من منظور إسلامي، القاهرة، المعهد العالمي للفکر الإسلامي، ٢٠١٠م، ج٢، ص٦٦٠.

بیرۆکـەی نموونـەی مـەعریفی تۆمـاس کـۆهن، بـریتین لـە کـۆی ئـامرازە میتۆدییەکان لە دیدی سەیفەدین عەبدولفتاح.

سەبارەت بەو ئامرازانەی لە پرۆژەی تەکامولی مەعریفی بە پایەی دووەم هەژمار دەکرێن، بریتیین لە ئاوەز و هەست (العقل و الحس). بەواتایەکی تر، هەر کاتێك لە تێزەکانی پرسی تـەکامول بـاس لـە ئامرازەکـان کـراوە، ئـەوە باسـکردنە لـە ژانـەرەکانی عـەقڵ و هەسـت. وەك ئـەوەی پێـشتر ئاماژەمـان پێکرد، سەرچـاوەکانی دەستخستنی مەعریفـە بەشـێوەیەکی مەنهەجییانـە، تـەنیا دووانـن، ئـەمانیش (سـرووش و جیهـان)، بەهەمانـشێوە، ئـامرازە مەنهەجییـەکان تـەنیا بـریتین لـە عـەقڵ و هەسـت. بەواتایـەکی تـر، کـۆی سەرچاوە لاوەکییەکان دەچنەوە ژێر چەتری سـرووش و جیهـان و سـەرجەم ئامرازەکانی تریش، دواجار هەر دەچنەوە ژێر چەتری عەقڵ و هەست. بۆیە ئەم چوار ژانـەرە (سـروش، جیهـان، عـەقڵ و هەسـت) پێکهاتـەی پەیکـەری سەرچاوە و ئامراز لە تەکامولی مەعریفی کامڵ دەکەن.

ئـامراز تـەنیا بریتییـە لـە هۆکـاری گەیـشتن بـە مەبەسـت، کاتێـك بـیر سەرچاوەی ئاوە، دۆلکە و سـوراحی بـریتین لـە ئـامرازی هـەڵێنجانی ئـاو لـە بیرەکەدا. بەهەمان چەشن، چاو ئامرازی بینینە، گوێ ئـامرازی بیـستنە، دڵ ئـامرازی بیرکردنـەوە و تێگەیـشتن و کـاراکردنی عـەقڵی ناوەکییـە، وەك لـە قورئانـدا هـاتووە. لـە دوو پـەڕەگرافی داهـاتوودا، چـەند سـەرەنجێك لەسـەر ئامرازەکانی عەقڵ و هەست دەخەینەڕوو.

- **ئامرازی یەکەم: عەقڵ**

عـەقڵ چـاوگێکی زمانەوانییـە بـۆ کـرداری ژیرکـاری (التعقـل)، بۆیـە لـە قورئاندا باسی کـرداری ژیرکـاری و عـەقڵ و ئـاوەز کـراوە. هـەروەها ئـەرکی عەقڵ بریتییە لە تێڕامان، وردبوونەوە، لێکۆڵینەوە و فێربوون. ئەنجامـدانی ئـەرکێکی لـەم چەشـنە، تـەنیا لەڕێگـەی کـاراکردنی بـەردەوامی عـەقڵ بەرهەمـدێت، بۆیـە یـەکجاریش وشـەی (عـەقڵ) وەك چـاوگ لـە قورئانـدا بەکارنەهاتووە. لەکاتێکدا ٤٩ جار بەشێوەی کار بەکارهاتووە، بەمـشێوەیە، ٢٤ جار بە داڕشتەی (تعقلـون)، هـەروەها ٢٢ جـار بـە داڕشـتەی (یعقلـون)، جارێکیش (یعقلها)، جـارێکیش (نعقـل)، جـارێکیش (عقلـوه) بـەکارهاتووە. هەروەها لەسەر شێوەی چـەند فـۆڕمێکی تـر، کـاراکردنی عـەقڵ لـە قورئـان جەختی لەسەر کراوەتەوە، بۆنموونە وشەی (الألباب) کە بۆ عاقڵمەندانە، لـە ١٦ شوێن بـەکارهاتووە. بەهەمانـشێوە بـۆ ژیرمەنـدان (النُهـی) دوو جـار لـە قورئانـدا هـاتووە. جـارێکیش بـۆ کـردارە عەقڵییـەکان وشـەی (القلـب) بـەکارهاتووە. هـەروەك جـارێکیش وشـەی (الحجـر) بـۆ هـەمان بابـەت بەکارهاتووە.

ئاشکرایە بیرکردنـەوەش یەکێکـە لـە کـردارە عەقڵییـەکان، لـە عەرەبیـدا (التفکر)ی بـۆ بـەکاردێت. ئـەمیش لـە قورئـان بـە چـەند داڕشـتەی جیاجیـا بەکارهاتووە، بۆنموونـە: داڕشـتەی (فکّـر) یـەك جـار، (تتفکّـروا) یـەك جـار، (تتفکّـرون) سـێ جـار، (یتفکّـروا) دوو جـار، (یتفکّـرون) ١١ جـار هـاتوون. کەواتـە، ٤٩ جـار داڕشـتەی کـاری (العقـل)، ١٦ جـار (الألبـاب) و، ١٨ جـار گـەردانکراوی (التفکـر)، دوو جـار (النهـي)، جـارێکیش (الحجـر) هـاتوون،

لەهەمان کاتدا ١٤٤ جاریش وشەی (القلـب) بەگـشتی لـە قورئانـدا هـاتووە[1].
هەروەها چەمکی فـامکردن (الرشـد) لـە قورئانـدا بـەکارهاتووە، کـە ئـەویش کردارێکی عەقڵییە، بۆ ڕێنمـایی و گرتنەبـەری ڕێگـای راسـت بـەکاردێت، لـە زمـانی عـەرەبی لەبەرامبەریـدا وەك دژەوانـە، چـەمکی (الغـي) ڕێـونکردن و گومڕایی بەکاردێت. بە چەندین دارشتەی جۆراوجۆر لە قورئان بەکارهاتووە، وەك (الرشد، رشدًا، رشده، رشدا، رُشدًا، یرشدون، الراشدون، رشید)، هەموو ئەمانە گرنگی کاراکردنی عەقڵ و فـام نیـشان دەدەن. ئەمـەش سـەلمێنەری ئەو راستییەیە، مرۆڤ دوور لە فامکردن، جیا لەوەی ناگات بـە ئامانجـەکانی، ڕێگـەی راستیـشی لـێ ون دەبێـت، سـەرەنجام نازانێـت بـۆ کـوێ دەچـێت و بەدوای چی دەگەڕێت.

لە دیدی قورئـان گرنگیـدان بـە عـەقڵ، مەبەسـتی ئەنـدامێکی پێکهاتـەی جەستە نییە، بەڵکو کردارە عەقڵییەکان و بەکارهێنانی کاراکردنی عەقڵ وەك ئامرازێك بۆ تێگەیشتن و پێگەیشتن گرنگە و شایەنی گرنگیپێدانـە. هـەروەها کاتێك باس لە گرنگی عەقڵ دەکرێت، ئەو عەقڵە مەبەسـتە کـە بریتییـە لـەو ئامرازەی مرۆڤ لەڕێگەی کاراکردنیەوە دەگەیەنێتە بـەدیهێنانی خەونـەکانی، چەشنی سوراحی کە خەونی مرۆڤـی تینـو لەڕێگـەی هـەڵێنجانی ئـاو لـە بـیر بەدیـدێنێت. مرۆڤـی شـێت و کاڵفـام و ژیرشـێواو، خـاوەنی عەقڵـە، بـەواتای ئەندامێکی جەستە، واتە (مێشك)، بەڵام خاوەنی عەقڵێکی کـارا نییـە، بۆیـە

---

[1] فهمی قطب الدین النجار، العقل في القرآن الكريم، بابەتێکە لە سایتی تۆری ئالوکە بڵاوکراوەتەوە، بەرواری بڵاوکردنەوە: ٢٠١٤/١/١٥، بەرواری سەردانکردن لەلاین توێژەر: ٨/ ١١/ ٢٠١٦. بەستەری بابەتەکە: http://www.alukah.net/culture/٠/٦٥٢٣٥/.

ئەرکداری و تەکلیفی لەسەر هەڵگیراوە، چی بکات، یان نەیکات، لە هەردوو دنیا و دواڕۆژ لێپێچینەوەی لەگەڵ ناکرێت. بەپێچەوانەی مرۆڤی ژیرمەند، کە لەسەر هەموو کار و چالاکییەك تووشی بەرپرسیاریەتی و لێپێچینەوە دەبێت.

- **ئامرازی دووەم: هەست "الحس".**

هەست بریتییە لە کاراکردنی ئامرازەکانی هەستکردن، کە بە پێنج هەستەوەرەکە ناسراون، ئەمانیش: (بیستن، بینین، بۆنکردن، دەستلێدان و تامکردن)[1]. بەواتایەکی تر، ئامرازی هەست کە بەشی دووەمی ئامرازەکانی تەکامولی مەعریفی پێکدەهێنێت، بریتییە لە کاراکردنی هەستەوەرەکانی لاشە، بۆ دەستەبەرکردن و گەیشتن بە خواست و ئامانجەکان. ئاشکرایە هەستکردن بریتییە لە هەستکردنی کاریگەری فیزیکی لەکاتی ڕوودانی کرداری بەریەککەوتن لەنێوان هەستەوەر و ئەو تەنەی بەر هەستەوەرکە کەوتووە. ئاماژەی هەستکردنی ماددییانە ئەو کاتە بەرهەمدێت، کاتێك پەیبردنی عەقڵی (الادراك العقلي) بەرهەمدێت. هەر ئەو هەستکردنە عەقڵییەیە کە تایبەتمەندی بۆ بەرکەوتەی هەستەوەرەکان دیاریدەکات.

هەستی چاو، بریتییە لە ئەنجامدانی کرداری جیاکاری لەنێوان قەبارە و ڕەنگی تەنە ماددییەکان، هەستی گوێ بریتییە لە کرداری جیاکردنەوەی

---

[1] أحمد محمد الدغشي، الحس مصدر للمعرفة وطريقة لها رؤية قرآنية تربوية، بحث منشور في منتدى الكلمة للدراسات والأبحاث، العدد ٢٧، ٢٠٠٠م، الرابط المباشر:
**http://www.kalema.net/v1/?rpt=165&art**.

دەنگەکان لە یەکتر، بەرز یان نزم، خۆش یان ناخۆش، گەنج یا بەساڵاچوو، دەنگی باڵندە یان مرۆڤ یان ئامێرێکی تەکنەلۆژی...هتد. لەسەردەمی شۆڕشی تەکنەلۆژی و پێشکەوتنی پیشەسازی، هەستەوەرەکانی مرۆڤ لەڕێگەی ئەو ئامێرە تەکنەلۆژییانە، زۆر زیاتر لە جاران، کاراترن[1].

چاوی مرۆڤ توانایەکی سنوورداری هەیە بۆ بینین، بەڵام لەڕێگەی ئامێرە تەکنەلۆژییەکانی گەورەکردن و نزیککردنەوە، دەتوانێت تەنی گەورەی گەردوونی زۆر دوور ببینێت، هەروەها توانای بینینی میکرۆبی زۆر قەبارە بچووکی هەیە، کە لە هەردوو بارەکەدا چاوی ئاسایی مرۆڤ توانای بینینی ئەم جۆرە تەنانەی نییە. نەك تەنیا بینین، بەڵکو لەڕێگەی هەمان ئەم ئامێرانە، مرۆڤ دەتوانێت پەی بە وردەکاری تەنە گەردوونییەکانیش ببات، شێوەی بازنەیی، چوارگۆشە، لاکێشە، سێ گۆشە...هتد، پانی و بەرزی و بەرینی و قووڵی، رەنگی تۆخ و کراوە، رێکخراو و تەریب یان پەرشوبڵاو...هتد، لەڕێگەی چەندین شێوازی جۆراوجۆر نزیك دەکرێنەوە، یان گەورە دەکرێن، بۆئەوەی بە ئاسانی کرداری شیکردنەوە و پێکهاتەکانیان بخرێتە بەردەستی توێژەران بۆ ئەنجامدانی کاری پێویست.

گەشەسەندن و تواناداری ئامێرەکانی خاوەن چاوی جادوویی (العيون السحرية) سەرسوڕهێنەرە. بنوارە تواناداری وردی و لەیەکجیاکردنەوەی شت و تایبەتمەندییەکانیان، هەرچەندە زۆر و وردیش بن، توانای بەسەردا دەشکێت. سەرنج بدە بۆ بارکۆدی سەر بەرگی کاڵا بازرگانییەکان، تەنیا

---

[1] ملكاوي، منهجية التكامل المعرفي، ص٢٢١.

لەڕێگەی چەند هێڵێك، کە سیفەت و تایبەتمەندی کاڵاکەی تێدا تۆمارکراوە، لەڕێگەی (بارکۆرد ریدەر) بەئاسانی خاوەن فرۆشگە نرخی شتەکە دەزانێت، لەبری لەبەرکردن و دەرخکردنی نرخی شتومەکەکان.  ئەم پرۆسەیە کارێکی ئێجگار قورسی بۆ خاوەن فرۆشگەکان سانا کردووە. لەڕێگەی ئەم ئامێرە ئەلیکترۆنییە، بارکۆدی شتەکان دەخوێنێتەوە، لە کۆتاییدا لە لاپەڕەیەك، دەیخاتە بەردەستی بەکارهێنەر، لەهەمان کاتدا، کرداری کۆکردنەوەی نرخی سەرجەم کاڵاکانیش دیاری دەکات، هەرچەندە با ژمارەیان زۆر بێت، دوور لە هەڵە و کەموکورتی، زۆر بە ئاسانی کردارەکە جێبەجێ دەکات.

بەهەمان شێوە سەرنج بدە کامێرا، لاپتۆپ، پەنجەمۆری ئەلیکترۆنی، ئایپاد، ناسنامە و کارتە ئەلیکترۆنییەکان، مۆبایلە هۆشمەندەکان، دەیان و سەدان وردەکاری تێدا بەدەستهاتوون، چەند ساڵێك نەك هەر مایەی قبوڵ نەبوون، بگرە هەر کەس باسی شتێکی لەم جۆرەی کردبا، تۆمەتی شێتی دەدرایە پاڵ، تەنانەت ئێستا وای لێهاتووە بۆن و ماچ لەڕێگەی ئامێرە ئەلیکترۆنییەکان دەگوازرێنەوە، یان گۆشتی خواردن بە لێکدانی خانەکان و بەبێ کوشتنەوەی هیچ ئاژەڵێك بەرهەم دێت، یان لەڕووی پزیشکییەوە داهێنانی وا کراوە، ئەگەر کەسێك نەخۆش بکەوێت و ئەندامێکی لەشی ئازاری هەبێت، بەبێ خواردنی هیچ جۆرە دەرمانێك چاك دەبێت، تەنیا بە دانانی ئامێرێك لەسەر ئەو شوێنەی ئازاری هەیە. هەموو ئەم بابەتانە، بینینی ئاسایی چاویان تێپەڕکردووە، مەیدانی تێڕامان و لێکۆڵینەوەیان سەدان قات لە جاران فراوانتر کردووە، هەروەك لە بواری ژیان و گوزەران گۆڕانکاری گەورەیان بەرپاکردووە.

بەهەمان شێوە لە بوارەکانی تری هەستەوەرەکان بەشێوەیەکی ڕێـژەیی پێــشکەوتن و گەشـــەی بێوێنــە ئــەنجام دراوە. شـــیاوی بیرهێنانەوەیــە، هەستکردن سنووری مادییانەی هەسـتەوەرەکانی تێپـەڕکردووە، هەنـدێجار هەستکردن لەڕێگەی زانست و زانیـاری یـان هەسـتی دەروونـی و عەقڵییـەوە بەرهەمدێت، هەروەك پەروەرێن سەبارەت بە عیسای پـەیامهێن دەفـەرموێت ﴿فَلَمَّآ أَحَسَّ عِيسَىٰ مِنۡهُمُ ٱلۡكُفۡرَ قَالَ مَنۡ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾ آل عمــران: ٥٢، کاتێــك عیــسا هەستی بە هەڵگەڕانەوە و کوفری ئەوان کرد، گوتـی: کێ دەبێتە پشت و پەنا و هاوکارم بۆ لای پەروەرێن و گەیاندنی پەیامەکەی.

وەك لــە ســیاقی ئایەتەکــە دەردەکــەوێت، ئــەم هەســتپێکردنەی عیــسای پــەیامهێن (درووی خــوای لەســەر) لــەدەرەوەی پێــنج هەســتەوەرەکە بــووە. ئەمــەش ئاماژەیــەکی روونــە، کــە هەســتکردن هەنــدێکجار لــەدەرەوەی پێــنج هەستەوەرەکانیش بەرهەم دێت. بـەهۆی ئـەوەی سـەر و سیما و سـنوورێك بـۆ ناسـینی هەسـتێکی لـەم چەشـنە نییـە، بیرمەنـدانی پـەیمانگا نەیانخـستووەتە چوارچێوەی هەستەوەرەکان، ئەگەرچـی هەنـدێکجار بـاس لـە هەسـتی شەشـەم دەکرێت، هەندێکی تر بەتایبەت شوێنکەوتووانی پەیڕەوی سۆفیزم، ئیـشراق بـە یەکێك لە سەرچاوە و ئامرازەکانی زانست و مەعریفە دەناسێنن، بەڵام لـە دیـدی تەکاملیانــە، سەرچــاوەکان تــەنیا (وەحــی و جیهــان)ن، هــەروەها ئامرازەکـان تــەنیا (عــەقڵ و هەســت)ن، هەســتیش بریتییــە لــە پێــنج هەســتەوەرە سەرەکییەکان.

لە بەشـی داهـاتوودا باسـی چـۆنیەتی بەرهـەمهێنانی تـەکامول دەکـەین، لەڕێگـەی هاتنەکایـەی یـەکانگیری و ئاوێتـەبوونی سەرچـاوە و ئامرازەکـانی زانست و مەعریفە بەیەکتر.

# بەشی پانزە
# تەکامول لە نێوان سەرچاوە و ئامرازەکان

لەم بەشەدا باسی یـەکانگیری نێـوان سەرچـاوە و ئامرازەکـانی زانـست و مەعریفە دەکەین، ئەویش لەڕێگەی وەڵامدانەوەی چوار پرسـیاری گەوهـەری شیکارییەکەمان.

– چۆن یەکانگیری لەنێوان سەرچاوەی یەکەم و دووەم ئەنجام دەدرێت؟

– ئامرازەکان چۆن مامەڵە لەگەڵ سەرچاوەی یەکەم دەکەن؟

– ئامرازەکان چۆن مامەڵە لەگەڵ سەرچاوەی دووەم دەکەن؟

– تـەواوکاری و ئاوێتـەبوون چـۆن لـەنێوان سەرچـاوە و ئامرازەکـان بەرهـەم دێت؟.

وەڵامـی ئـەم چـوار پرسـیارە، بـەرەو نموونـەی تـەکامولی مـەعریفیمان دەبـات، سـەرەنجام ئـەم بەشـە لـە چـوار بڕگـە پێکـدێت، بەمـشێوەیەی خوارەوە:

تەکامول لەنێوان سەرچاوەکانی زانست و مەعریفە، کارلێکردنی عـەقڵ و هەسـت لـە سـرووش، کـارلێکردنی عـەقڵ و هەسـت لـە جیهـان و گـەردوون، نموونەی تەکامولی مەعریفی.

- **برگەی یەکەم: تەکامول لە نێوان سەرچاوەکان**

پێشتر باسمان لەوە کرد سەرچاوەکانی مەعریفە تەنیا دووانن، ئەمانیش سرووش و جیهان، ئامرازەکانیش تەنیا دووانن، ئەمانیش عەقڵ و هەست. لەم بڕگەیەدا کورتەیەك سەبارەت بە تەکامول لەنێوان ئەم دوو سەرچاوەیە دەخەینەڕوو. ئاسان نییە مرۆڤ بیر لە خاڵەکانی لەیەکترازانی نێوان هەر دوو سەرچاوەی مەعریفە، سرووش و جیهان بکاتەوە، قورئانی پیرۆز بۆ مرۆڤایەتی روون دەکاتەوە، کە فەرمایشتە قورئانییەکانی پەروەرێن (آيات الله المسطورة)، بریتین لە سەرچاوەی زانست و مەعریفە، هەروەك چۆن دروستکراوەکانی پەروەرێن لە گەردووندا (آيات الله المنظورة)، بریتین لە سەرچاوەی مەعریفە و زانست.

پەروەرێنی تاقانە، دابەزێنەری قورئانە بۆ پەیامهێن محەممەد (دروودی خوای لەسەر)، هاوکات بەدیهێنەری بوونەوەر و زیندەوەر و گەردوونە، چارەنووس و سەرەنجامی کۆی کاروبارەکانی جیهانیش تەنیا بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە، بەواتایەکی تر، پەروەرێن تاکە سەرچاوەی باڵایە، کە ماستەرپلان و نەخشەڕێگای مرۆڤایەتی و گەردوونی کێشاوە، هەر ئەویش هۆکارەکانی رێنموونی و رێگاکانی سەرفرازی دیاری کردوون.

مرۆڤ دەتوانێت ئایەتەکانی قورئان بخوێنێتەوە، هەروەها لەڕێگەی هەستەوەرەکانیەوە دەتوانێت هاوشێوەی خوێندنەوەی ئایەتەکانی قورئان، دروستکراوەکانی تر لە گەردوون و تەواوی دروستکراوەکانی جیهانی سروشت، هاوشان لەگەڵ تابلۆ کێشراوەکانی گەردوون، لەگەڵ تەنە بینراو و هەستپێکراوەکانی گەردوون و دیاردە کۆمەڵایەتی و کاروبارەکانی تایبەت بە دۆخی دەروونی، بخوێنێتەوە.

هـەموو ئەمانـە، جیـا لـەوەی مـرۆڤ دەتوانێـت پـەی بـە بوونیـان ببـات، لەڕێگەی هەستەوەرەکانیشەوە دەتوانێت کردارەکانی وردبوونەوە، تێڕامان، توێکـاری و تاقیکردنـەوە سـەبارەت بـە تاکـە تاکـەی بوارەکـان بەئـەنجام بگەیێنێت، لەم رێگەیشەوە دەتوانێت ئەم بابەتانە رام بکـات و بـۆ خزمـەتی مرۆڤایەتی و بەگەڕیان بخات[1].

لەم نێوەندەدا مرۆڤ تاکە دروستکراوی پەروەرێنە، کە بەجوانترین شـێوە و پەیکـەر و ئەنـدام، قۆنـاخ دوای قۆنـاخ دروسـت کـراوە. خـودی ئـەم قۆناخبەندییە، لەپاڵ جوانترین سـەر و سـیما و پەیکـەر و شـێوە، تـەنیا بـۆ تێڕامان و وردبوونەوەیە لە وردەکارییـەکانی بەدیهێنـەر، بۆئـەوەی مـرۆڤ لـە کۆتایی تێڕامان و وردبوونەوە، نەتوانێت شتێك بڵێت جگـە لـە خوێندنـەوەی ئـەم ئایەتـە پـیرۆزە: ﴿فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ﴾ المؤمنـون: ١٤، (پـاك و بـەرزی و پیرۆزی بۆ چاکترین بەدیهێنەر و چاکترین دروستکار).

کاتێك سەرنج لە یەکەم ئایەتی دابەزیوی قورئانی پیرۆز دەدەین، گرنگـی تێکهەڵکێـشکردن و ئاوێتـەکردنی سەرچـاوەکانی مەعریفـەمان بـۆ روون دەبێتەوە. پەروەرێن دەفەرموێت: ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ ۝ خَلَقَ الْإِنْسَانَ مِنْ عَلَقٍ﴾ العلق: ١ – ٢، ئـەی محەممـەد، بخوێنـە بـە نـاوی پـەروەردگارت کـە بەدیهێنـەر و دروستکاری هەموو شتێکە، ئادەمیزادی لە پارچە گۆشـتێکی هەڵواسـراو بـە دیواری رەحمەوە دروست کردووە.

---

[1] فتحي ملكاوي، منهجية التكامل المعرفي، ص ٢١٣.

ئەم فرمانکردنە بە خوێندنەوە، تەنیا بریتی نییە لە خوێندنەوەی پارچە کاخەزێك کە چەند ئایەتێکی پیرۆزی لێ نووسراون، بەڵکو بریتییە لە تێڕامان و خوێندنەوەی پێکهاتە و خانە و گەردیلەکانی گەردوون، تاوەکو دەگاتە کۆمەڵەی خۆر و کەلو و کەشکەشانەکانی فەلەك، لەڕێگەی خوێندنەوەی جیهانی بەدیهێندراو و دروستکراوەکانی نێو ئەو جیهانە، مرۆڤ بۆ دەرگای پەروەرێنی تاقانە رێنوێنی دەکرێت، ئەم خوێندنەوەیە بریتییە لە هەمان ئەو خوێندنەوەیەی کە پەروەرێن لە ئایەتێکی تردا، روونتر لەبارەیەوە دەفەرموێت: ﴿سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ﴾ فصلت: ٥٣، (لە ئایندەیەکی نزیکدا بەڵگە و نیشانە سەرسوڕهێنەرەکانمانیان نیشان دەدەین، لە ئاسۆکانی بوونەوەر و دەروونی خۆیاندا، بۆئەوەی بەجوانترین شێوە بۆیان روونبێتەوە، کە زاتی حەق راست و رەوایە)[١].

---

[1] ئەگەر بەوردی سەرنجی چەمك و ووشەکانی قورئان بدەین، سەبارەت بە خوێندنەوە، قورئان هەردوو چەمکی (القراءة والتلاوة) ی بەکارهێناون، زۆرینەی زانایانی تایبەت بە راڤە و زانستە قورئانیەکان، بەتایبەت هاوچەرخەکان، لەسەر ئەو بۆچوونەن کە هاوواتایی لە قورئان بوونی نیە، بەپێی ئەم بۆچوونەبێت وشەی قراءة و تلاوة لەیەك جیاوازن و خاوەنی دوو ناوەرۆکی جیاوازن. لە قورئانیشدا قراءة زۆرگشتگیرترە لە تلاوە، بۆیە توێژەر پشتگیری ئەو بۆچوونە دەکات کە قراءة بریتی نیە لە خوێندنەوەیەکی رووکەشیانە، بەڵکو بریتیە لە وردبوونەوە و تێڕامان. خوێنەر رێنمایی دەکەین سەرنجی ئەو ئایەتانە بدات کە هەردوو چەمکەکەی تێدا هاتوون، سەبارەت بە قراءة، وەك: (إقرأ باسم ربك الذي خلق.. اقرأ وربك الأكرم...)، (اقرأ كتابك كفى بنفسك اليوم عليك حسيبًا)، (وإذا قرئ القرآن فاستمعوا له وانصتوا...) لەپاڵ ئایەتەکانی تری تایبەت بە تلاوة، وەك: (وأنتم تتلون الكتاب..)، (واتبعوا ما تتلوا الشياطين على ملك سليمان..)، (ولو شاء الله ما تلوته عليكم..)، (وما كنت تتلوا من قبله من كتاب ولا تخطه بيمين...).

سەرنج بدە لە سوورەتی (العلق)، پەروەرێن باسی خوێندنەوەی گەردوون و قۆناخەکانی دروستبوونی مرۆڤ دەکات، لەم ئایەتـەی سـوورەتی (فـصلت) بەهەمانشێوە، وردەکاری ئاسۆکانی گەردوونی فراوان و دەروونی مرۆڤ، وەك دووانەی ئایەتەکانی پەروەرێن هەژمار دەکات، ئەم خوێندنەوەیە، سـەبارەت بـە ئاسـۆکانی گـەردوون و دەروون و بـاری کۆمەڵایـەتی، هاوشـان لەگـەڵ تێڕامان و تێگەیشتن لە ئایەتەکانی قورئان، دەکرێت لەڕێگـەی توێژینـەوە و خوێنـدن و زانـستی ئـەزموونی بێـت، یـان وردبوونـەوە و تێفکـرین لەڕێگـەی هەستەوەرەکانەوە. کاتێك لەم ئایەتە پیرۆزە ورد دەبینەوە، ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ وَٱلدَّوَآبِّ وَٱلۡأَنۡعَٰمِ مُخۡتَلِفٌ أَلۡوَٰنُهُۥ كَذَٰلِكَۗ إِنَّمَا يَخۡشَى ٱللَّهَ مِنۡ عِبَادِهِ ٱلۡعُلَمَٰٓؤُاْۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ﴾ فــاطر: ٢٨، بڕگــــەی (زانایــان لەخواترســترین بەنــدەکانمانن) دوای روونکردنــەوەی جیــاوازی و فرەڕەنگی نێوان خەڵك و گیانلەبەر و رەشەوڵاخ، هەروەها هەژمارکردنیان بە نیشانە و ئایەتەکانی پەروەرێن هاتووە.

کەواتە زانا لە دیدی قورئان، کەسێکە شارەزای وردەکارییەکانی جیهـانی مرۆیـی، جیهـانی سروشـتی و جیهـانی ئاژەڵانـە، نـەك بەتـەنیا لـە زانـستە شەرعییەکان شارەزا بێت، وەك هەندێ لە موسڵمانان وا لێی حاڵی بوون.

جارێکی تر، سوورەتی (العلق) دەخوێنینەوە، بەتایبەت ئایەتەکانی سـێ بۆ پێنج، لە ئایەتی یەکەم و دووەم، باسی خوێندنـەوەی گـەردوون دەکـەن، بەڵام ئەمجارە باسی ئامرازەکانی فێرکردن دەکـات، سـەرنج بـدە پـەروەرێن دەفـەمووێت: ﴿ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ ٣ ٱلَّذِي عَلَّمَ بِٱلۡقَلَمِ ٤ عَلَّمَ ٱلۡإِنسَٰنَ مَا لَمۡ يَعۡلَمۡ﴾ العلق: ٣ – ٥، (بخوێنــە، پــەروەرێنی تــۆ بەخــشندەترینە، ئــەو پەروەرێنــەی لەڕێگــەی پێنووسەوە زانست و مەعریفەی فێرکردووە، ئـادەمیزادی فێـری ئـەو شـتانە

کـردووه کـه نایانزانێـت و لێیـان بێئاگایـه). مـرۆڤ نووسـراوەکانی دووتـوێی تێنـووس دەخوێنێتـەوە کـە لەڕێگـەی پێنووسـەوە ڕێنـووس کـراون، خـوای پـەروەرێن ئـەم پرۆسـەیەی فێـری مـرۆڤ کـردووە، دوای ئـەوەی مـرۆڤ لێـی بێئاگـابووە و نـەیزانیوە، هـەر ئـەم ئایەتانـە بەڵگـەن لەسـەر ئـەوەی چـۆن پەروەرێن مرۆڤی فێری ناو و زمان کردووە، بەهەمانشێوە فێری خوێندنـەوە و نووسـینی کـردووە، دواتـر بـە تێپـەڕبوونی کـات و ئـەزموون پـەیاکردن، نووسینەوەی زانستەکان سەریهەڵداوە.

پرۆسەی خوێندنەوە و نووسین و نووسینەوەی زانستەکان پێش دروستبوونی مرۆڤ، پەروەرێن بەکردەیی لە تۆماری پارێزراوی گەردوون و بوونەوەر (الكتاب المكنون في اللوح المحفوظ) ئەنجامی داوە، لەڕێگەی سرووش و پەیامە ئاسمانیەکانیش، هەواڵی نووسینەوەی ماستەرپلان و کارنامەی گەردوونی بە مرۆڤ گەیاندووە، بۆئەوەی وانە و پەندی لێ وەربگرێت، دواتر پەیامی خودا لەڕێگەی فریشتەوە بۆ پەیامهێنان دابەزیوە، کە دواهەمیان قورئانە، پێکهاتەی پەیامی (قورئان) بریتییە لە ماددەکانی خوێندنەوە و پاڵفتەکردنی دەروون و پەروەردە و فێرکردن، وەك دەفەرموێت: ﴿ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَاتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَابَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ ﴾ البقرة: ١٢٩.

ئەم ئایەتە پـیرۆزە، باسـی ئـەرکی پـەیامهێنان دەکـات، کـە بریتییـە لـە خوێندنەوەی ئایەتەکانی خودا، فێرکردنی پەرتووکی خودا، لەگەڵ دانـایی و پاڵفتەکردنی دەروون، لەڕێگەی پەرتووك و پەیامەکانی پەروەرێن.

بەمـشێوەیە، خوێندنـەوە بریتییـە لـە هـەردوو پـەرتووکی خوێنـدراو و بیندراو، وەك لە بەشەکانی پێشوو بەدرێژی باسمان کرد.

پێویستە مرۆڤ هەردوو خوێندنەوەکە تێکهەڵکێش بکات، بۆئەوەی ڕێنمای خودایی وەربگرێت و بە دروستییەوە مامەڵەیان لەگەڵ بکات، ئەو کاتە تەکامول لەنێوان هەردوو خوێندنەوەکە بەرهەم دێت، کە خوێندنەوەی سرووش بۆ مامەڵەکردن و تێگەیشتن لە گەردوون و جیهان ئەنجام بدرێت، هەروەها ئەوکاتە خوێندنەوەی جیهان بە دروستی بەئەنجام دەگات، کە لەپێناو تێگەیشتن و جێبەجێکردن و مامەڵەکردنی دروست لەگەڵ سرووش بێت[1].

مرۆڤ کاتێك زیاتر هەست بە پێویستی تەکامول لەنێوان سرووش و گەردوون دەکات، کە خوانەناسی و سەرکێشییەکانی ڕۆژئاوا دەبینێت، کاتێك دوور لە بنەما ڕەوشتییەکان و بەها باڵاکان لەپێناو کۆکردنەوەی سەرمایە و پاراستنی بەرژەوەندیەکانیان، پەنا بۆ گشت ئامرازەکان دەبەن، بێ گوێدانە زیانی مرۆڤ و ژینگە و گەردوون، هاوکات زۆر هەست بە پێویستی تێزێکی لەم شێوەیە دەکرێت، کاتێك زانا ئایینییەکان دوور لە بنەما زانستی و تەکنەلۆژییە سەردەمییەکان، حوکم و بڕیار لەبارەی دیاردە گەردوونییەکان دەدەن، یان سەبارەت بە پرسەکانی تایبەت بە زانستە ئەزموونییەکان سەرنج دەردەبڕن. بۆردومانکردنی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوین لەلایەن زلهێزانی ڕۆژئاوا، وەك نموونەی یەکەم، کافرکردنی ئەو کەسانەی بڕوایان بە سووڕانەوەی زەوی بەدەوری خۆر هەیە، وەك نموونەی دووەم.

سەیرە لە جیهانی نوێ و جاڕنامەی گەردوونی مافەکانی مرۆڤ، خوێنی ڕژاوی سەدان هەزار موسڵمانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەهایەکی نییە، لەوە سەیرتر لیژنەی فەتوای باڵای وڵاتێکی وەك سعودیە، حوکمی کافرکردن

---

[1] ملكاوي، منهجية التكامل المعرفي، ٢١٤.

بەسەر کۆی ئەو کەسانە بدات، کە بڕوایان بە سووڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆردا هەیە، چونکە بەبۆچوونی ئەوان زەوی وەستاوە و خۆر بەدەوری زەوی دەسووڕێتەوە، یاخود ئینکاریکردن لەوەی زەوی خڕە، یان توانـاداری مرۆڤ لە بەزاندنی بەرگەهەوای زەوی ئەنجامدانی توێژینەوەی زانستی لەسەر مانگ و هەسارەکان.

ئەگەر خاوەن بڕیارەکان، بەکرداریی تۆزێك بەهای سرووش و پەیامەکانی پـەروەرێنیان بزانیبـا، ئـەم هـەموو خوێنـە بـەبێتاوانی نـەدەڕژێرا، ئـەویش لـەپێناو هـەژموون و بەرژەوەنـدی دونیـایی چـەند وڵات و پـارت و کەسـێك. لەبەرامبەردا ئەگەر زانا ئایینییەکانیش —ئەوانەی خـاوەنی قەناعـەتێکی لـەم چەشنەن— تۆزێك شارەزاییان لە زانستە ئەزموونییـەکان هەبووایـە، بڕیـاری کـافرکردنی ئـەو کەسـانەیان دەرنـەدەکرد، کـە لەسـەدەی ٢١ بڕوایـان بـەو بابەتانە هەیە کە لەبڕگەی رابردوو باسکران. ئیدی چارەسـەری ئـەم دەردە کوشندانە لە هەردوو بوارەکەدا، تـەنیا بریتییـە لـە تـەکامول و یـەکانگیری و ئاوێتـەکردنی هـەردوو جیهـانی سـرووش و گـەردوون بەیەکـەوە، هـەروەها کاراکردنیـان بەشـێوەیەکی تەندروسـت بـۆ خزمـەتی مرۆڤایـەتی و ئاوەدانکردنەوەی زەوی و ئەداکردنی ئەرکی جێنشینایەتی پەروەرێن.

- **بڕگەی دووەم: عەقڵ و هەست و سرووش**

لەم بڕگەیەدا هەوڵ دەدەین مامەڵە و پەیوەندی نێوان ئامرازەکان لەگەڵ سەرچاوەی یەکەمی زانست و مەعریفە روون بکەینەوە، لە بڕگەی داهاتووشدا پەیوەندی نێوان ئامرازەکان و سەرچاوەی دووەم دەخەینەڕوو.

خوێندنەوەی راستەقینەی قورئان، بریتییە لە تێڕامان و وردبوونەوە لە فەرمایشتەکانی پەروەرێن، هەوڵدان بۆ تێگەیشتن لە هەردوو مانای زمانەوانی و زاراوەی وشە و چەمکە قورئانییەکان، هەروەها تێگەیشتن لە واتای راستەقینەی وشەکان لەڕێگەی گەڕانەوە بۆ مامەڵەکردن و بەکارهێنانیان لەلایەن پەروەرێن لە قورئاندا، لە سوورەت و ئایەتە جیاجیاکان.

لەکاتی تێڕامان و دیراسەکردنی قورئان، پێویستە چەند بنەمایەکی میتۆدی رەچاو بکرێن، گرنگترینیان بریتییە لە بنەمای یەکەی دارِشتە لە قورئاندا "مبدأ الوحدة البَنَّائية في القرآن"[1]، کە وادەخوازێت راڤەی قورئان بە قورئان ئەنجام بدرێت، ئەمەش بە چوارچێوەیەکی دیاریکراوی سەرەکی مەنهەجی لە مامەڵەکردن لەگەڵ قورئاندا، وەك سەرچاوەی یەکەمی زانست و

---

[1] واتە: خوێندنەوەی سوورەت و حیزب و ئایەتەکان و تێکهەڵکێشکردنیان بەیەکتر، وەك یەك پاکێجی دانەبراون لە یەکتر، ناکرێت قورئان بەش بەش و پارچە پارچە سەیر بکرێت، ئەم بنەما مەنهەجیە، قورئان لە پەرتووك و پەراوەکانی تری ئاسمانی و مرۆیی جیا دەکاتەوە. بە واتایەکی تر کاتێك دەوترێت یەکێك لە تایبەتمەندیەکانی قورئان بریتیە لە "وحدته البنائية" مانای وایە هەموو سوورەت و ئایەت و جوزء و حیزب و وشەکان وەك یەك رستەی تەواوکاری یەکتر هەژمار دەکرێن. بۆ روونکردنەوەی زیاتر سەبارەت بەم پرسە، بروانە: طه جابر العلواني، الوحدة البنائية في القران، بابەتێکە لە پێگەی مرکز الدراسات القرانية بڵاوکراوەتەوە، بەرواری سەردانکردن لەلایەن توێژەر: ٩/ ١١/ ٢٠١٦، بەستەری راستەوخۆی بابەتەکە: **http://www.alquran.ma/Article.aspx?C=**٥٦٤٦.

مەعریفـە هـەژمار دەکرێـت. ئـەم بنـەما مەنهەجییـە، ئامـاژە بـۆ خـاڵێکی گەوهەری زۆر گرنگ دەکات، لە حاڵەتی پشتگوێخستنی، گەیشتن بـە راڤـە و واتای راستەقینەی چەمك و وشە قورئانییەکان ئەستەم دەبێت.

بۆیە وەك خاڵی دەستپێکی گەشتی خوێندنەوە و تێگەیشتن لـە قورئـان، پێویستە لەڕێگەی پشتبەستن بەو بنەما مەنهەجییە، هـەر لـەنێو قورئـان بـۆ واتا و راڤەی چەمك و وشەکانی قورئان بگەڕێین.

دوای راڤــەی قورئــان بــە قورئــان، پێویــستە رەچـاوی فــەرموودەکانی پــەیامهێن (دروودی خـوای لەسـەر) بکرێـت بـۆ تێگەیـشتن لـە قورئـان، ئـەم فەرموودانــەی بەشــێوەیەك لــە شــێوەکان بــریتین لــە راڤــە و تەفــسیری ئایەتەکانی قورئان، یـان یارمەتیـدەرن بـۆ دیـاریکردنی مانـای مەبەسـت بـۆ یەکێك لە چەمکەکان، لەکاتێکدا چەمکەکە لـەڕووی زمانەوەنییـەوە خـاوەنی چەند واتایەکی جۆراوجۆرن، بەواتایەکی تر، کاتێك وشەیەکی قورئـان چـەند مانایەکی جۆراوجۆر بەدەستەوە دەدات، تەنیا لەڕێگـەی راڤـەی قورئـان بـە قورئانیش ناتوانین بە مانای مەبەست بگەین، ئـەوە لـە فـەرموودەوە هـەوڵی دەستنیشانکردن و هەڵبژاردنی مانای راستەقینەی وشەکە دەدەین[1].

بەشێك لـە فەرمایشتەکانی قورئـان تایبـەتن بـە روونکردنـەوەی حوکمـە شەرعییەکان، لەنێویشیاندا ئەو حوکمانـەی ئەوەنـدە باسـکراون کـە هـەموو کەس لەبارەیانەوە شارەزایە، وەك خواپەرستییەکان و مامەڵە و پەیوەندییە

---

[1] لە کاتی راڤەکاردنی هەر ئایەتێك، یان گەران بە دوای واتای هەر ووشەیەکی قورئانی پێویستە لە سەر هەر سێ ئاستی "سباق، سیاق، لحاق" پێشوو، بابەتەکە، دوای ئایەتەکە، رەچاوبکرێت، بە پێچەوانەوە، بنەمای یەکەی دارشتەی قورئان پێشێل دەکرێت و مانای وشەکە، یان ئایەتەکە بەلارێدا دەبرێت.

کۆمەڵایەتییەکان، ئەم بەشەی قورئان زۆر نابێتە جێگەی سەرنج و لێکۆڵینەوەی توێژەران، مەگەر بۆ روونکردنەوە و تێگەیشتن لە نهێنییەکانی خواپەرستی و حیکمەتەکانی، یان چەند نهێنی و دۆزینەوەیەکی زانستی سەردەم کە بەشێوەیەك لە شێوەکان دەچنەوە سەر ئەم بابەتانە. زۆربەی ئەو بابەتانەی لەم سەردەمە لەژێر ناوی راستیی زانستی، یان پەرچووی زانستی لە قورئاندا (الحقائق العلمية أو الإعجاز العلمي في القرآن) باس دەکرێن، دەچنە ژێر چەتری ئەم بابەتە.

بەشێکی تری ئایەتەکانی قورئان تایبەتن بە دیاردە گەردوونییەکان، یان جیهانی پەنهان و چارەنووسی مرۆڤ، ئەم بابەتانەش زیاتر لەڕێگەی عەقڵ و هەستەوەرەکان جێگەی وردبوونەوە، تێڕامان، بیرکردنەوە، سەرنج و مەیدانی لێکۆڵینەوە و شیکارکردنن. رەنگە تێڕامان و وردبوونەوە و لێکۆڵینەوە لەم بابەتانە، ببێتە هۆی گەیشتن بە چەند نهێنی و ئەنجامێکی ئەوتۆ کە هیچ کەسێك لەمەوبەر پێی نەگەیشتبێت. چەندە زیاتر مرۆڤ بەجددی و دڵسۆزییەوە لەگەڵ گرتنەبەری هۆکار و رێگا پێویست و دروستەکانی توێکاری و تێگەیشتن، هەوڵی تێگەیشتن و ئاشنابوون بە نهێنییەکانی سروشتی پەروەرێن بدات، زیاتر پەروەرێن دەرگای میهری خودایی بەسەر دەکاتەوە و شارەزایی زیاتری پێ دەبەخشێت.

ئاشکرایە قورئان وەك زەریایەکی گەورە و قووڵە و ئاسۆکانی زۆر فراوانن، هەموو کەسێك بەشی خۆی دەتوانێت لە گەوهەرەکانی نێوی سوودمەند بێت. زەریا چەندە ئاوی لێ هەڵبنجێندرێت کەم ناکات، قورئانیش

چەندە لێکۆڵینەوەی زیاتر سەبارەت بە وردەکاری و نهێنییەکانی بکرێت، هێشتا مرۆڤ ناتوانێت پەی بە گشت نهێنییەکانی ببات.

بەشی دووەمی ئایەتەکان وا ناخوازن تەنیا بە راڤە و شیکاری راڤەکەران و شارەزایانی زانستە ئیسلامییەکان ئیکتیفا بکرێت، بەڵکو سروشتی ئەم ئایەتانە و پێکهاتە و دەلالەتەکانیان وادەخوازێت، مرۆڤ لەڕێگەی زانستە ئەزموونییە بەردەستەکان، کاراکردنی عەقڵ و هەست و هەستەوەرەکان و، لێکۆڵینەوە و توێکاری بەردەوام لەڕێگەی ئامێرە تەکنەلۆژییەکان، لە هەوڵی ئاشنابوون بە نهێنییەکانیان نەوەستێت، جیاوازی نییە ئەم هەوڵ و کۆششە تایبەت بێت بە سروشت و گەردوونی ماددی یان نهێنییە سەرسوڕهێنەرەکانی ناخی مرۆڤ و بابەتەکانی پەیوەندیدار بە کۆمەڵناسی و دەروونناسی.

کۆی ئایەتەکانی قورئان لەڕووی ناوەڕۆك و پێکهاتە یەك ئاست نین، بگرە لەڕووی تێگەیشتن و ئاڵۆزی و چەندایەتی و چۆنایەتی بەسەر چەند ئاستێکی جیاجیا دابەش کراون. ئەو زانست و زانیارییانەی مرۆڤ لەڕێگەی قورئانەوە هەوڵی دەستخستنیان دەدات، سەبارەت بە رووداو و دیاردە گەردوونییەکان، هەندێکیان سانا و ساکارن، هەندێکی تر ئاڵۆز و پڕ گرێ و گاڵ، هەندێکیان وابەستی کۆمەڵێك پەیڕەو و یاسا و رێسای سروشتیی و زانستین، لەڕێگەی کاراکردنی ئەو پەیڕەوو رێسا سروشتی و زانستییانەوە نەبێت ئەستەمە دەستی مرۆڤیان پێ بگات....هتد. بەشێکی تری ئایەتەکانی قورئان تایبەتن بە جیهانی نەبیندراو و دواڕۆژ، ئەگەرچی مرۆڤ هیچ ئەزموونێکی جەستەیی سەبارەت بە جیهانی ئەودیو نییە، بەڵام لەڕێگەی ئەزموونی هەستەوەرەکانەوە قورئان وێنای جیهانی ئەودیومان بۆ دەکات.

سـەرنج بـدە، لـە فەرموودەکانـدا هـاتووە: لـە بەهەشـتدا بـۆ بەنـدەکانی پـەروەرێن نـاز و نیعمـەتی وا ئامـادەکراوە، نـە چـاو بینیویـەتی، نـە گـوێ بیستوویەتی، نە بەسەر خەیاڵ و خاترەی دڵی هیچ کەسێك هـاتووە، کەچـی هەمان پرسی بابەتەکانی حەشر و حیساب و بەهەشـت و دۆزەخ لـە قورئـان، لەڕێگـەی ئــەزموونی هەســتەوەرەکانی مــرۆڤ خراونەتــەڕوو، ئــەمیش بــۆ ڕەچـاوکردنی کۆمـەڵێك خـاڵ، گرنگترینیـان ئاسـانکردن و نزیککردنەوەیـە، بۆئـەوەی مـرۆڤ بەئاسـانی لـە ڕێگـە زانراوەکـان هەسـت بـە خۆشـییەکانی بەهەشت و تاڵییەکانی دۆزەخ بکات. خـاڵێکی تـر بریتییـە لـە گرنگیـدان بـە هەست و هەستەوەرەکان سەبارەت بە تێگەیشتن لە پەیامی خودا.

لەلایەکی تر، سرووش پەیامێکە لە خوداوە بۆ بەنـدەکانی هـاتووە، بۆیـە پێویستە دواندن و شیکارییەکانیش لە ئاستێك بن مـرۆڤ بەئاسـانی لەڕێگـەی کاراکردنی عەقڵ و ئاوەز و هەستەوەرەکان بتوانێت تێیان بگات. ئەگەرچـی پەیامی پەروەرێن لە بنچینەدا لەسەرووی هەست و ئەزموونی مرۆییـە، بـەڵام لەسەر شێوازی هەست و ئەزموونی مرۆیی بـۆ مـرۆڤ خراوەتـەڕوو، بۆئـەوەی بەئاسـانی بتوانێـت تێیبگـات و مامەڵـەی لەگـەڵ بکـات. هـەر سـەبارەت بـە ئـەزموونی بەرجەسـتەی دنیـایی، قورئـان چـیرۆکی بێباوەڕانمـان بـۆ بـاس دەکات، کە چۆن داوایان لە پەیامهێن کردووە مـەرجی بڕواهێنانیـان بریتییـە لـە ئەنجامـدانی کۆمـەڵێك کـاری موعجیزەئاسـا، وەك: هـەڵقوڵانی کانیاوێـك بەبەرچاوی ئەوانەوە، یان باخی تـرێ و خورمـا کـە ئـاوی سـازگاری لـەنێودا هەڵبقوڵێت و ڕێ بکات، یان ئاسمانمان بەسەردا پارچە پارچە بکە، یان خودا و فریشتەکان بێنە و ڕووبەڕوومان بکە، یـان کۆشـك و تـەلار و ماڵێـك کـە بـە

گەوهەر و زێڕ و زیو رازێندرابێتەوە...هتد، یان بەبەرچـاومانەوە بـۆ ئاسمـان بەرزببێتەوە، دوای داواکردنی ئەم کارە قورسانە، ئینجا بەوەش نەوەستان و گوتیان: خۆ ئەگەر ئەوانەش بکەیت هەر باوەڕ ناهێنین، هەتا پـەرتووکێك بـە بەرچاوی ئێمە لە ئاسمانەوە بۆت دادەبەزێت، ئینجا ئێمەش بیخوێنینەوە[1].

قورئان هـەواڵی جیهـانی ئـەودیومان بـۆ دەگوازێتـەوە، کـە لەحەقیقەتـدا لەسەرووی عەقڵ و هەست و ئەزموونی مرۆڤەکانـە لـە دنیـادا، بـەڵام ئـەوەی جێگـەی سـەرەنجە، خـستنەڕووی ئـەم بابـەتو روونکردنەوەیانـە لەسـەر شـێوازی هەسـتکردن و ئـەزموونکردن. سـەرنج بـدە، سـەبارەت بـە روونکردنەوەی چێژ و خۆشـییەکانی بەهەشـت و تـاڵی و ئازارەکـانی دۆزەخ، چۆن قورئان بۆ مرۆڤ نمایـشیان دەکـات و دەفـەرموێت: ﴿مَّثَلُ ٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِي وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ فِيهَآ أَنْهَٰرٌ مِّن مَّآءٍ غَيْرِ ءَاسِنٍ وَأَنْهَٰرٌ مِّن لَّبَنٍ لَّمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُۥ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ خَمْرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّٰرِبِينَ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ عَسَلٍ مُّصَفًّى وَلَهُمْ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَمَغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ كَمَنْ هُوَ خَٰلِدٌ فِي ٱلنَّارِ وَسُقُوا۟ مَآءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَآءَهُمْ﴾ محمـد: ١٥، واتـه: (نموونەی ئەم بەهەشتەی بەڵێن دراوە وەك پاداشت بـە خۆپـارێزان بـدرێت، چەند رووبارە ئـاوێکی سـازگاری تێدایـە، هـەروەها چـەند رووبـاری شـیر کـە هـەرگیز تامەکـەی ناگۆڕێـت، لەگـەڵ چـەند رووبـارێکی شـەراب کـە چـێژ بـە نۆشکاران دەبەخشێت، هـەروەها چـەند رووبـارێکی هـەنگوینی هەڵبـژاردە و پاڵفتـە، هاوشـان لەگـەڵ گـشت جۆرەکـانی میوەجـات و لێخۆشـبوونی پـەروەرێن. ئایـا ئـەم پاداشـتە وەك سـزای دۆزەخییانـە کـە لـەنێو دۆزەخ بەنەمری دەمێننەوە؟ لە ئاوێکی کوڵاو ئاودەخۆنەوە کـە بەهۆیـەوە گـەدە و ریخۆڵەکانیان پارچە پارچە دەبێت).

---

[1] بڕوانە سورەتی الإسراء: ٨٩–٩٣.

ناوەڕۆك و پێكهاتەی ئەم ئایەتە پیرۆزە، وەك گرتەیەكی ڤیدیۆیی دێتەبەرچاو، باخ و باخات و مێرگ و كانی، شیر و شەراب و هەنگوینی چێژبەخش، كەچی لە بەری ئەوبەری دۆزەخ، ئاهو و ناڵە و ئاگر و بڵێسە، فڕكردن و خواردنەوەی ئاوی زڵق زڵق كوڵاو، لەئەنجامدا گەدە و ریخۆڵە وێران و پارچە پارچە دەبێت. سەرەڕای ئەم دیمەنانە، لە دنیادا ئەزموون نەكراون، بەڵام كاتێك لەڕێگەی خوێندنەوەی ئەم ئایەتە بیریان لێدەكەیەوە، بەتەواوەتی هەست بە خۆشییەكانی بەهەشت و ناخۆشییەكانی دۆزەخ دەكەیت، لەپاڵ ئەوەی بە هەستەوەرەكانەوە وێنە و تابلۆ و شێوازەكانیان لە خەیاڵدان ئامادە دەبن، تەنانەت هەمان وشەكانی تایبەت بە ئەزموون و هەستەوەرەكانیشی بەكارهێناون، (رووبار، ئاو، شیر، شەراب، هەنگوین، بەروبووم و میوەجات، تام، چێژ، گەدە، گەرمی و ئازار)، هەموو ئەمانە بە هەستەوەرەكانەوە هەستیان پێدەكرێت.

لە دەیان و سەدان دیمەنی تر، قورئان عەقڵ و هەست و هەستەوەرەكان و ئەزموونی مرۆیی، وەك دەروازە و شاشەی نمایشكردنی جیهانی پەنهان بۆ مرۆڤ بەكاردێنێت. دەرەنجام، جیاكردنەوەی كاری عەقڵ و هەست لەكاتی مامەڵەكردن لەگەڵ سرووشی خودایی كارێكی ئەستەمە، چونكە بەشێوەیەكی تۆكمە وابەستە و ئاوێتەی یەك كراون، ناكرێت لەیەك جیابكرێنەوە، هاوكات هەردوو ئامرازی عەقڵ و هەست بەشێوەیەكی سەرەكی لە دوو رەهەندەوە بۆ مامەڵەكردن لەگەڵ سرووش بەكارهاتوون.

رەهەندی یەكەم: بریتییە لە تێگەیشتن و وردبونەوە و لێكۆڵینەوە لە سروش لەڕێگەی عەقڵ و هەست.

رەهەنــدی دووەم: خــستنەڕوو و شــیکردنەوەی پێکهاتــەی ســوورەت و ئایەتەکانی قورئان لەڕێگەی وێناکردن و نمایشکردنیان لەسەر شێوەی عەقڵ و هەستەوەرەکان و ئەزموونی مرۆیی.

بەمــشێوەیە بۆمــان ڕووندەبێتــەوە، ناکرێــت لــە قورئــان بگــەین، چ وەك چەمك و تێگەیشتن و دەستەواژە و رســتەکان، چ وەك پــەیبردن بــە نهــێنی و گەوهەرەکانی، مەگەر لەڕێگەی کاراکردنی عەقڵ و هەست و کۆی بابەتەکانی پەیوەست بەم دوو ئامرازەوە نەبێت، بەمەش تەکامول لەنێوان ئامرازەکان و (عــەقڵ و هەســت)، سەرچــاوەی یەکــەمی مەعریفــە و زانــست (ســرووش) بەئەنجام دەگات.

- **برگەی سێیەم: عەقڵ و هەست و جیهان**

لەم برگەیەدا لەڕێگەی وەڵامی ئەم پرسیارەوە: پەیوەندی نێوان عــەقڵ و هەســت و جیهــان بــە چ شــێوەیەکە؟ بابــەتی پەیوەنــدی و چــۆنیەتی مامەڵــەکردنی عــەقڵ و هەســت لەگــەڵ جیهــان و گــەردوون و بوونــەوەر شیدەکەینەوە. فەرمایشتی پــەروەرێن لــە ســەرەتای سورەتی (العلـق)، کـە یەکـەم ئایـەتی دابـەزیوە بـۆ پـەیامهێن محەممـەد (دروودی خـوای لەسـەر)، دەروازەیەکی گشتییە بـۆ ڕوونکردنـەوەی ئـەم پرسـە، پـەروەرێن لەڕێگـەی فەرمانی (إقرأ) فەرمان بە خوێندنەوە دەکات، هاوکات ئاماژە بەو پەرتووکـە دەکات کە پێویستە بخوێندرێتەوە.

کاتێــــــك پــــــەروەرێنی بـــــاڵا و بــــــەتوانا دەفـــــــەرموێت: ﴿ ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ۝ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِنۡ عَلَقٍ ﴾ العلـق: ١ – ٢، فــەرمان بــە ئەنجامــدانی

خوێندنەوە، لەکاتێکدا فەرمانپێکراو هیچ زانیارییەکی لە خوێندنەوە نەبووە، بەو مانایەی مرۆڤەکانی ئێستا لە خوێندنەوە تێگەیشتوون، فەرمانکردنـە بـە شتێك کە بـەدەرە لـە تواناکـانی ئـەو، فـەرمانێکی لـەم چەشـنەش لـە زاتـی پەروەرێن ناوەشێتەوە، ئەگەر فەرمانەکە لە شوێنی خۆی بێت، داواکـاریش بــە شــتێك کــە لــەدەرەوەی توانــای مــرۆڤ بێــت لــە شــکۆی پــەروەرێن نەوەشێتەوە، کەواتە ئەم خوێندنەوەیە هەمان ئەو خوێندنەوەیە نییە، کە لە سەدەی بیست و یەکدا مرۆڤ پێی ئاشنا بووە.

تەنیا بە سەرنجدان لـە تـەواوی ئایەتەکـە و ئایەتـەکانی دواتـری، جـۆری خوێندنەوەکەوە روون دەبێتەوە.

باس باسـی گـەردوون و دروسـتکردن و بەدیهێنانـە، ئیـدی خوێندنـەوەی مەبەست لێرەدا بریتییە لە تێڕامان لە گەردوون لەڕێگەی هەستەوەرەکانەوە، نەك خوێندنـەوەی چـەند پـەڕاوێکی نووسـراو، ئـەم خوێندنەوەیـە لەڕێگـەی بەکارهێنانی هەستەوەرەکان بەئـەنجام دەگـات، لەڕێگـەی کـرداری بیـنین و وردبوونــەوە لــە ئەنــدازەگیریی گــەردوون و تەنــە ماددییــەکانی پێکهاتــەی گــەردوون، ئاشــنابوون و ناسـینی پەیوەنـدی نێـوان رێـسا و یاسـاکان، کـە شـــتەکانی بەیـــەك بەســـتووەتەوە و کاروبـــاری گـــەردوون و فەلـــەکیان رێکخستووە.

هەروەها تێبینیکردن لەڕێگـەی عـەقڵ و هەسـتەوەرەکانەوە، رێکـوپێکی ئاکــار و ئەنـــدازەگیریی کاروبـــاری جیهـــان و رووداوەکـــان، هەســـتکردن و پێـــشبینیکردنی رووداو و دیـــاردە گەردوونییـــەکان، ئامادەکـــاری بـــۆ بەدەستهێنانی شتە پێویستەکانی ژیان لە هەردوو باری ئاسایی و نائاسایی و

رووبەڕووبوونـــەوەی تەنگـــژەکان، بـــریتین لـــە خوێندنـــەوەی راســـتەقینەی پەرتووکی بیندراوی پەروەرێن[1].

ئەگەر سەرەنج لە واقیع و ژیانی سەردەمی دابەزینی قورئان بدەین، دواتر بــە بــارودۆخی کۆمەڵایــەتی و مرۆیــی ئێــستا بــەراوردی بکــەین، زۆر خــاڵی هاوبەشمان بۆ دەردەکەون، بەبارێکی تـردا، ئەگـەر سـەرەنج لـە کۆمەڵگـەی سـاتی دابــەزینی قورئــان و واقیعــی کۆمەڵایــەتی ئێــستا بــدەین، لــەڕووی دوورکەوتنـــەوە لـــە بـــەها باڵاکـــان و بنـــەما مرۆڤایەتییـــەکان و پەیامـــە ئاسمانییەکان، جیاوازییەکی ئەوتۆ بەدی ناکرێت. لەحاڵێکدا ئەوکات قورئان تازە پێنج ئایەتی لێ دابـەزیبوون، کەچـی ئێـستا هـەموویمان لەبەردەسـتە، ئەمە خاڵێکی ئێجگار گرنگە و پێویستە بەجددی خوێندنەوەی بۆ بکرێت.

گوتمـان قورئـان سەرچـاوەی یەکـەمی زانـست و مەعریفەیـە، جیهـان و گـەردوون سەرچـاوەی دووەم، کەچـی ئێـستا هـەردووکیان بـە هاوڕێیـەتی ئامرازەکـان لەبەردەسـتی مرۆڤایەتیـدان، لەکاتێکـدا مرۆڤـی ئێـستا هـەزاران هـەنگاو لـە چرکەسـاتی دابــەزینی وەحــی لــەڕووی تەکنــەلۆژی و زانــستە ئەزموونییەکان پێشکەوتووترە، بۆچی نەتوانراوە ئەو گۆڕانکـاری و شۆڕشـە مەعریفی و زانستییەی قورئان بەرپای کرد، بەردەوام بێت؟.

کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی هەرگیز بێ کێشە و قەیران و تەنگژە نابێت، بـەڵام چـۆن دەتـوانین تەندروسـتانە مامەڵـەیان لەگـەڵ بکـەین، ئەمـە جێگـەی هەڵوەستە لەسەرکردنە. لە ساتی دابەزینی قورئـان جیهـان پـڕ لـە قـەیران و

---

[1] الدغامين، التكامل المعرفي في القرآن الكريم، ص١٧٥–١٧٨.

کێشە و تەنگژەی مرۆیی و کۆمەڵایەتی و سیاسیی بوو، بەڵام لەماوەی ٢٣ساڵی پێغەمبەرایەتی پەیامهێن، زۆر لە کێشەکان چارەسەر کران، جیا لەوەی بۆ ماوەی شەش سەدەی یەك لەدوای یەك، جیهانی ئیسلامی لە پێشەنگایەتی ژیاری و زانستی و سەربازی و کۆمەڵایەتی...هتد، ئەسپی خۆی تاودا، دواتر وردەوردە بەرەو پووکانەوە و چەقبەستن رۆیشت، تاوەکو سەرەنجام بووە جیهانی نووستووی سێیەم.

گرنگترین و گەوهەریترین هۆکار، بریتییە لە بەردەوام نەبوون لەسەر کاراکردن بە وەحی و عەقڵ و هەستەوەرەکان و گەڕانی بەردەوام لەپێناو تێگەیشتن و داهێنان و بەردەوامیدان بە ژیارستانی و گەشانەوە و پێشەنگایەتی. خوێندنەوە و دەرخکردن و راڤە و شیکارەکانی قورئان رۆژێك نەوەستاون، دەیان و سەدان و هەزاران و ملیۆنان تەفسیر بۆ دەقەکانی قورئان ئەنجامدراون، پوختە و کورت، یان درێژ و پڕ شیکاری، بەڵام هەر نەتواندرا لە ئاست داخوازییەکانی سەردەم، لەڕێگەی قورئان و دەقە پیرۆزەکان ململانێی ژیارستانی لە بەرژەوەندی ئیسلام بشکێتەوە. تاکە خاڵی گەوهەری کە ئەم شکستە گەورەیەی لە جیهانی ئیسلامیدا بەدوادا هات، دوو خوێندنەوەی جیان بۆ قورئان، ئەوانیش:

خوێندنەوەی سەرەتایی ئیسلام، بریتیی بوو لە خوێندنەوەی گەردوون و دەقە پیرۆزەکان وەکو یەك، پڕجۆشکردنی توێژ و چینەکانی کۆمەڵگە بە رووحی ئیسلام و پەیامە ئاسمانییەکان و بەها باڵا مرۆییەکان، هاندان لەپێناو تێکۆشانی هەمیشەیی و داهێنان بۆ جێبەجێکردن و ئەداکردنی ئەرکی جێنشینایەتی و ئاوەدانی زەوی....هتد. لەبەرامبەردا خوێندنەوەی

مرۆڤی ئێستا بۆ قورئان، تەنیا بریتییە لە دەستکەوتنی پاداشتی قیامەتی، پرسە و ماتەمینی و خوێندنەوەیەکی رووکەشییانەی دوور لە تێڕامان و بیرکردنەوە، لە هەمووشی کارەساتبارتر، دابڕینی دەقە پیرۆزەکان لە ناوەندە زانستیی و ئەکادیمیی و سەنتەرەکانی توێژینەوە، هەروەها گۆشەگیرکردنی قورئان لە دووتوێی پەرتووکێك و دانانی لەسەر رەفە جوان و رازاوەکانی کتێبخانەی مزگەوتەکان.

تا ئەو ساتەی وەك چاخی هاتنەخوارەوەی وەحی، ئامانج لە خوێندنەوەی قورئان بریتی نەبێت لە وەرگرتنی رێنمایی بە ئامانجی چارەسەرکردنی گشت کێشە کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوری و مرۆیی و ئاکاری و کردارییەکان، هەرگیز پێشەنگایەتی و ژیارستانی بۆ جیهانی نووستووی سێیەم ناگەڕێتەوە. هەتا کۆمەڵگەکانی جیهانی ئیسلامی شانازی بە موسڵمانیەتی و پەیام و دەقەکانی قورئان نەکەن، وەك تاکە دەرچە و دەروازەی چارەسەری قەیرانەکان و رێنوێنیکاری جیهان، پەنای بۆ نەبەن، هەروەها لەڕێگەی کاراکردنی عەقڵ و هەست و زانستە ئەزموونییەکان لەژێر رۆشنایی رێنوێنی و دەقەکانی قورئان، لە مەیدانی هزر و زانست و مەعریفە ئەسپی خۆیان تاونەدەن، گوزەرانیان لەمە باشتر نابێت کە ئێستا هەیە.

کاراکردنی چارەسەرە قورئانییەکان بە رۆحێکی تەکامولیانە، بۆ کێشە کۆمەڵایەتی و سیاسی و دەروونی و ئابوورییەکان، لەسەر کۆی ئاست و چینەکانی کۆمەڵگە، دەستەبەری پێشەنگایەتی و ژیارستانی بۆ جیهانی ئیسلامی دەگێڕێتەوە. بەپێچەوانەوە خوێندنی قورئان لە نوێژ و مزگەوت و خواپەرستییەکان، کارکردن بەپێچەوانەی رێنماییە قورئانییەکان، یان

باوەڕنەبوون بە خوودی چارەسەرەکانی قورئان بۆ کێشە و قەیرانـەکان وەك ئەوەی لە ڕۆژهەڵاتی ناوین هەیە، هیچ بەرهەمێك بەرجەستە ناکات.

سەرنج بدە، لەم کۆمەڵگە ڕۆژهەڵاتییانە، ڕۆژانە ملیۆنـان مـرۆڤ سـەرقاڵی قورئانخوێنـدنن، لەکاتێکـدا سیـستەمی سیاسـی و کۆمەڵایـەتی و ئـابووری و پەروەردەیی، هەمان ئەم کۆمەڵگایانـە لـەڕووی کرداریـیـەوە، سـەدا یـەکیش گـوێ بـە ڕێنماییـە قورئانییـەکان نـادات، تەنانـەت زۆربـەی ئـەو کەسـانەی لەکاتی قورئان خوێندندا لە مزگەوت خەریکی فرمێسك هۆنینەوەن، لە ساتی داخستنی بەرگی قورئانەکە، گوێ بە هیچ ڕێنماییەکی قورئانی نادەن.

کــورت و پوخــت، جیهــانی ئیــسلامی لەســەر کــۆی ئاســتەکان لــە دووفاقییەیــەکی زۆر گــەورە و قــووڵ و مەترســیدار دەژی، لــە ڕووکەشــدا موســڵمان و شــوێنکەوتەی قورئــان و ڕێنمــایی و پەیامــە ئاسمــانی و زانستییەکانن، حەقیقەت و واقیعیش شتێکی تر دەڵێن.

سەبارەت بە ناوەندەکانی توێژینەوە و ئەکادیمی، ئامانجی ڕاستەقینە لە توێژینەوەی زانستی لە گشت بوارەکان، بریتییە لە دەستنیشانکردنی دەرد، دواتر پێشکەشکردنی چارەسەر و دەرمان، کەچی ئەگەر لە جیهانی ئیسلامی سـەیری توێژینـەوەکان بکـەیت، سـێ بـەش و سـێ چـارەکی توێژینـەوە بـۆ شیکردنەوەی ناونیشانی توێژینەوە و پێناسـە و ئامـانج و گرنگـی و چـەمکە پەیوەندیدارەکان بە مانا سەرەکییەکانی توێژینەوەن، بەشێکی بـچووکی لـە دەوری بابەتەکـە و دەردەکـە خـول دەخۆنـەوە، پێـشکەشکردنی بـەدیلیش لەئارادا نییە، لەکاتێکدا پێویستە توێژەر بەر لە دەستکردن بە توێژینـەوە و

خەرجکردنی تواناکان، شارەزایی تەواوی لە سروشتی ئەو دەردە هەبێت کە دەیەوێت لەڕێگەی توێژینەوەکەیەوە چارەسەری بکات، ئەمیش لەڕێگەی شارەزابوون لە تایبەتمەندییەکانی کێشەکە، پەیوەندی و ڕۆڵبینینی لە واقیعی کۆمەڵایەتی و دەروونی، ئینجا وەڵامدانەوەی چەند پرسیارێکی گەوهەری وەك: کەی ئەم کێشەیە سەریهەڵدا؟ هۆکارەکان چین؟ چۆن سەریهەڵدا؟ چۆن گەشەی کرد و گەشە دەکات؟ قەبارە و مەترسی چەندە و چۆنە؟ چۆن سنووردار دەکرێت؟ چۆن بتوانین بنبڕی بکەین؟ بە چ ڕێگەیەك و چۆناوچۆن بەرەو چارەسەرکردنی کاتی و هەمیشەیی هەنگاو بنێین؟.

وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە بۆ چارەسەرکردنی هەر کێشەیەك وەك کلیل هەژمار دەکرێن، وەڵامی تەکامولیانەش بۆ ئەم پرسیارانە تەنیا لەڕێگەی توێکاری دروست لەژێر ڕۆشنایی هەردوو سەرچاوەی زانست، قورئان و گەردوون، لەگەڵ هەردوو ئامرازەکە، عەقڵ و هەست نەبێت بە ئەنجام ناگات.

کەواتە خوێندنەوەی سرووش تەنیا لەڕێگەی کاراکردنی عەقڵ و هەست لەپێناو تێگەیشتن لە جیهان و مامەڵەکردن لەگەڵ ڕووداوەکانی بەئەنجام دەگات. هەروەها خوێندنەوەی جیهان تەنیا لەڕێگەی کاراکردنی عەقڵ و هەست لەپێناو تێگەیشتنی سرووش و مامەڵەکردن لەگەڵی بەرهەم دێت، بەمەش کۆتایی بە شیکارکردنی هەر چوار ژانەرەکەی تەکامول دێت، کە بریتیین لە قورئان، گەردوون، عەقڵ و هەست.

- **برگەی چوارەم: نمونەی تەکامول**

دوای ئەوەی شیکاری هەر چوار ژانەرەکەی پێکهاتەی تەکامولی مەعریفی بەکۆتا گەیشت، لەم بڕگەیەدا چۆنیەتی هاتنەکایەوەی تەکامول دەخەینەڕوو، ئەم بڕگەیە بۆ کورتکردنەوەی کۆی سەرچاوە و ئامرازەکانی مەعریفەیە بە تێڕوانینێکی ئیسلامییانە، هەروەها چۆنیەتی هەماهەنگی نێوانیان کە لەڕێگەیەوە مەنهەجێکی تۆکمە لە بیرکردنەوە و گوفتار و ئاکار و کردار بەرهەم دێت.

ئەم نموونە مەعریفی و مەنهەجییە، تەکامولی مەعریفی، لە دوو بەش پێکدێت: سەرچاوەکان و ئامرازەکان، لەسەر سێ ئاستیش بەئەنجام دەگات:

یەکەم: تەکامول لەنێوان سەرچاوەکان.

دووەم: تەکامول لەنێوان ئامرازەکان.

سێیەم: تەکامول لەنێوان سەرچاوە و ئامرازەکان.

سەرچاوەکانی مەنهەجیەت لە هزر و دیدی ئیسلامی تەنیا سرووش و جیهانن، لەم نێوەندەدا وەك سەرچاوەی سێیەم شتێکی تر نییە، لە کۆی لێکۆڵینەوە مەعریفی و مەنهەجییەکان، پێویستە تەکامول لەنێوان ئەم دوو سەرچاوەیە ئەنجام بدرێت و بەهیچ شێوەیەك ناکرێت یەکێك لەم دووانە فەرامۆش بکرێن. مرۆڤ بوونەوەرێکی دروستکراوە لەم گەردوونە، بۆیە ناکرێت مامەڵەی لەگەڵ بکرێت، مەگەر لەسەر هەرسێ ئاستی جیهانی سروشت، جیهانی کۆمەڵایەتی و جیهانی دەروونی نەبێت، زۆربەی کات مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم سێ ئاستە، دوور لە مەرجەعیەتی ئایینی و هزری

ئەنجام دەدرێت، بەڵام مرۆڤی موسڵمان کە باوەڕی بە سروشی پەروەرێن هەیە، هەروەها ئەرکدارە بە مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم جیهانە، لەڕێگەی ڕێنماییەکانی سرووش، ڕێنماییەکانی سروشیش لە بنەڕەتدا بریتین لە ڕێنوێنیکردنی هۆش و ئاوەزی مرۆڤ لەهەمبەر گەردوون و کارکردن تێیدا، دەبێت لە سایەی مەرجەعێکی هزری و مەعریفی و مەنهەجی لەمشێوەیەدا کار بکات، بەمشێوەیە حەقیقەتی تەکامول لەنێوان هەردوو سەرچاوەکەی مەعریفە و مەنهەج، سرووش و جیهان، لە هزری ئیسلامییدا بەرهەم دێت.

سەبارەت بە ئامرازەکانی مەعریفە لە هزر و دیدی ئیسلامیدا، تەنیا دووانن، ئەوانیش عەقڵ و هەست، هیچ ڕێگەیەکی کارکردن لەبەردەم هەست بەبێ کاراکردنی عەقڵ نییە، هەروەك هیچ ئامرازێکی عەقڵی بۆ ئەنجامدانی کار و چالاکی لە مەیدانی بینراو و بەرجەستە دوور لە هەست و هەستەوەرەکان لەدایك نابێت، تەنانەت کردارە هزرییە رووتەکان، کە تەنیا لە خەیاڵدان و هزر ئەنجام دەدرێن، عەقڵ ناتوانێت بەئەنجامیان بگەیەنێت، مەگەر لەڕێگەی ئەزموونی هەست و هەستەوەرەکانەوە نەبێت. بەمشێوەیە پێویستی هاریکاری و هەماهەنگی لەنێوان هەردوو ئامرازی مەنهەجیەت و مەعریفە کارێکی حەتمییە، بەهیچ شێوەیەك ناکرێت ئەم دوو ژانەرە لە مەیدانی کارکردن لەیەك جیابکرێنەوە، بەمەش تەکامول لەنێوان ئامرازەکان بەرهەم دێت[1].

دەستخستنی مەعریفە لە سرووش، وەك سەرچاوەی یەکەمی مەعریفە لەڕێگەی کاراکردنی عەقڵ و هەست نەبێت ناکرێت، هەروەك دەستخستنی مەعریفە لە جیهان، وەك سەرچاوەی دووەم، دیسان لەڕێگەی کاراکردنی

---

[1] ملکاوی، منهجیة التكامل المعرفي، ص٢٣٥-٢٣٧.

عەقڵ و هەست نەبێت ئەنجام نادرێت، ئیدی بەمشێوەیە پەیوەستبوونی هەر چوار ژانەرەکە بەیەکتر کارێکی حەتمییە و ناکرێت بـەهیچ شـێوەیەك لەیـەك جیابکرێنەوە، بەمەش هەماهـەنگی و ئاوێتـەبوونی سەرچـاوە و ئامرازەکـانی مەعریفە بە یەکتر، پێویستییەکی مەعریفی و هـزری و مەنهەجییـە لـە دیـدی بیرمەنـدانی هـزری ئیـسلامی و رابـەرانی هـزری ئیـسلامیەتی مەعریفـە و پەیمانگای جیهانی هزری ئیسلامی.




**نمونەی تەکامولی مەعریفی**

**نموذج التكامل المعرفي**

# پاشکۆ

## خوێندنەوەیەك بۆ پەروەردە و فێرکردنی کوردستان

لــەم بەشـــەدا لـــەژێر رۆشـــنایی بابەتـــەکانی تـــەکامولی مـــەعریفی هەڵسەنگاندنێك بۆ بارودۆخی پەروەردە لە کوردستان دەکەین.

پێــشتر باسمــان لــەوەکرد گــرنگترین ئامــانجی ســەرەکی پــڕۆژەی ئیسلامیەتی مەعریفە و تەکامولی مەعریفی بریتییـە لـە تێپەڕانـدنی قـەیرانی هزری و پێشکەشکردنی بەدیلی مەعریفی و مەنهەجی نوێ.

پێکهاتەی قەیرانی هزریی بریتییە لە سێکوچکەی دووفـاقیی پـەروەردە، رێگریکـردن لـە شـەپۆلی بـەخۆرئاوایکردنی موسـڵمانان و شـاڵاوی هـزری، چارەسەرکردنی کێشە مەنهەجی و مەعریفییەکانی مەنهەجیەتی تەقلیدی لـە جیهانی ئیسلامی، تاکە بەدیلی ئەم کێشانەش بریتییـە لـە بەرجەسـتەکردنی تەکامولی مەعریفی بەم پێکهاتە و ناوەڕۆکەی پێشتر راڤەمانکرد.

لە هەرێمی کوردستاندا وەك بەشێك لە جیهانی سێیەم، کۆمەڵێك قەیرانی کەمەرشکێن دەستیان خستووەتە بینەقاقای، لە دووفاقیی پەروەردەرییەوە بگرە تاوەکو دەگاتە هاوردەکردنی سیستەمی پەروەردەیی.

ناوەند و پێگە پەروەردەیی و زانستییەکان لە دووفاقییەکی قووڵ گـوزەر دەکـەن، دووفـاقیی لـە بنـەمای فەلـسەفییەوە تـاوەکو دەگاتـە دووفـاقیی کارگێڕی. بەشـی زانـستە ئیـسلامییەکان، حـوجرە ئەهلییـەکان، ناوەنـدی و دواناوەندییـە ئیـسلامییەکان، کۆلێـژەکانی زانـستە ئیـسلامییەکان لەلایـەك،

خوێنـدنی گـشتی کـە خـۆی لـە بنـەڕەتی و دواناوەنـدی و بەشـە زانـستە ئەزموونییـەکانی زانکۆکـان دەبینێتـەوە، لەلایـەکی تـر، پەیکـەری پرۆسـەی خوێندن لە کوردستان پێکدێنن.

لەڕووی کارگێڕییەوە، هەر لە باخچەی ساوایانەوە تا دەگاتـە خوێنـدنی زانکۆ و خوێندنی باڵا، بەسەر کەرتی گشتی و کەرتی تایبـەت دابـەش بـووە، ئیدی بەم دوو دووفاقییە قەیرانی پەروەردە لە کوردستان کامڵ دەبێت.

سەبارەت بە پرسی لەیەکجیاکردنەوەی زانـستە ئیـسلامییەکان و زانـستە ئەزموونییەکان، هەمان ئەو دەرەنجامە بەدەستهاتووە کـە لـە وڵاتـانی تـری جیهانی سێیەم بەردەستە، بگرە خراپتریش.

لەبارەی کـەرتی گـشتی و کـەرتی تایبـەت، هەمیـشە زۆرینـەی رۆڵـەکانی کۆمەڵگەی کوردی روو لە کەرتی گـشتی دەکـەن، هاوکـات کـوڕە بـەرپرس و سـەرمایەدارەکانیش بـەرەو کـەرتی تایبـەت و خوێندنگـە بـەناو ئەهلییـەکان هەنگاو دەنـێن، کـەرتی گـشتیش لـە کـۆی ئاسـتەکان تووشـی دەردەداری و کەمی پێداویستی و فەرامۆشکردن بووەتەوە، کـەرتی تایبـەتییش سـەرەڕای گرنگیپێـدانێکی زۆر، کەچـی زۆربـەی کـات تـەنیا بـەڕێکردن و پێـدانی بڕوانامەیە، وەك بازاڕی ساخکردنەوەی کـاڵای بەسەرچـووی بازرگـانی دێتـە بەرچاو، زۆربەی دەرچووەکانی زۆربەی زانکۆ ئەهلییەکان خاوەنی بڕوانامەی قەبە و زانستێکی کەم، ئەمەش جگە لە بەهەدەردانی توانای مـاددی و وزەی مرۆیی بەرهـەمێکی تـری نـەبووە، بەشـێکی کـەمیش لـە قوتابخانـە و زانکـۆ ئەهلییەکان، کە خوێندکارەکانیان رۆڵەی بەرپرسـە باڵاکـانن، تـا دوا ئاسـتی

پەرەپێدان گرنگییان پێدەدرێت، لەسەر پشتی خەرجی و قووتی نەوە بێنازەکانی کۆمەڵگە.

پاش داڕووخانی کەرتی گشتیی پەروەردە لە سەرەتای دەیەی دووەمی هەزارەی نوێی زایینییەوە، بەرپرسانی حکومەت و وەزارەتی پەروەردە بڕیاریان دا سیستەمی سویدی بۆ چارەسەرکردن و پەرەپێدانی پەروەردە و فێرکردن هاوردە بکەن و، هەمان سیناریۆی تورکیا و میسر و یەمەنیان دووبارەکردووە، ئەمیش بەهۆی کۆمەڵێك جیاوازی ریشەیی نێوان واقیع و زەمینەی کرداری و بنچینەی فەلسەفی پرۆگرام و پاشخانی کۆمەڵایەتی و هزری قوتابییان، هیچ دەرەنجامێکی دڵخۆشکەری نەبوو.

سەبارەت بە ئاوێتەکردنی زانستە ئیسلامییەکان و زانستە ئەزموونییەکان، پرۆژەی پاکتاوکردنی زانستە ئیسلامییەکان دەستی پێکرد، ئەویش لەژێر پەردەی ریفۆرم و بەرەنگاربوونەوەی هزری توندڕەوی. لە رابردوودا قوتابخانە و پەیمانگا ئیسلامییەکان سەر بە وەزارەتی ئەوقاف بوون، کۆلێژەکانی زانستە ئیسلامییەکانیش سەر بە وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی، وەزیری پەروەردە و وەزیری ئەوقاف و وەزیری خوێندنی باڵای حکومەتی هەرێمی کوردستان لە مانگی نیسانی ساڵی ٢٠١٥دا بە هەماهەنگی بڕیاریان دا، کۆی قوتابخانە ئایینییەکان و پەیمانگاکانی زانستە ئیسلامییەکان، بە دار و دیوار و مامۆستا و فەرمانبەر و خوێندکار بۆ سەر هەردوو وەزارەتی پەروەردە و خوێندنی باڵا رابگوێزن، قوتابخانەکان پشکی وەزارەتی پەروەردە و پەیمانگاکانیش بوون بە پشکی وەزارەتی خوێندنی باڵا.

لە ناوەڕاستی مانگی ئابی ساڵی ٢٠١٦ دا بە بڕیارێکی وەزیری خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی، کۆی پەیمانگاکانی زانستە ئیسلامییەکان، کە لەسەر ئاستی هەرێم لە ١٠ پەیمانگا زیاتر بوون، هەڵوەشێندرانەوە، لەبری ئەم پەیمانگایانە تەنیا سێ بەشی پێگەیاندنی پێشنوێژ و گوتارخوێنان لە هەرسێ زانکۆکانی (سەلاحەددین، سلێمانی و دهۆك) کرانەوە، کە بڕیار بوو لەڕێگەی پێشکەشکردنی راستەوخۆ قوتابی وەربگرن، سەرەنجام ژمارەیەکی زۆر کەمی قوتابیان داواکارییان پێشکەش کردبوو، کە مایەی دڵخۆشی و ئومێد نییە ئەم بەشانە بکرێنەوە، بەهۆی کەمی رێژەی ئارەزوومەندان.

سەرەڕای ئەوەی وەزارەتی پەروەردەش پشکەکەی خۆی، واتە قوتابخانە ئیسلامییەکان، تووشی ریشەکێشکردن کرد و تەنیا چەند دانەیەکی کەم نەبێت، زۆربەی هەرە زۆری داخستن، ئیدی بەمشێوەیە بۆمان روونده‌بێتەوە کە دووفاقییەکان دەستیان خستووەتە بینەقاقای خوێندنگە و پەیمانگە و کۆلێژەکانی زانستە ئەزموونییەکان، خوێندنی ئایینیش تووشی ریشەکێشکردن و تەنگپێهەڵچنین هاتووە، کار وابڕوات چەند ساڵێکی تر شتێك بەناوی زانستە ئیسلامییەکان لە کوردستان نامێنێت.

بەمەش نەك قەیرانەکان چارەسەر ناکرێن، بەڵکو ئەگەر لە جیهانی ئیسلامی تەنیا دووان و سیان بن، لە هەرێمی کوردستان دەیان و سەدانن. پێشهاتەکان وامان پێدەڵێن، سێکوچکەی قەیرانی هزری لە کوردستان لەبری چارەسەر، کار بۆ گەشەکردن و قووڵکردنەوەی دەکرێت. رۆژ دوایی رۆژ، کەرتی تایبەت قوتابخانە و پەیمانگا و زانکۆیی تازە دەکاتەوە و کەرتی گشتیش زیاتر فەرامۆش و بێناز دەکرێت، هەڵمەتی بەرۆژئاواییکردن و

مۆدێرنە هەواداری لەهەڵکشاندایە و شەیدایانی تا ئاستی پیرۆزکردن بە باڵای هەڵدەڵێن، مەنهەجیەتی تەقلیدی ئیسلامییش بە پیلانێکی تۆکمە ریشەکێش دەکرێت.

سەبارەت بە هەژمارکردنی سرووش و وەحی بە سەرچاوەی زانست و مەعریفە، بە بەرچاوی بەرپرسان لە کۆنفراس و پلاتفۆرمەکان شانازی بە ریشەکێشکردنی زانستە ئیسلامییەکان دەکرێت و سرووش نەک بە سەرچاوەی زانست و مەعریفە ناناسێندرێت، بەڵکو بە سەرچاوەی خورافیات و دواکەوتن و قەیرانەکان هەژمار دەکرێت[1].

[1] لە پلاتفۆرمی دابران، یەکێك لەبەشداربووان، بە ئاشکرا وەحی بەسەرچاوەی خورافیات ناساند و لە بەرنامەیەکی رادیۆی "لە گەڵ ئادەمدا" لە رادیۆی رووداو دوبارەی کردەوە.

# سەرچاوەکان


1. ابن تيمية، **درء تعارض العقل والنقل**، تحقيق: محمد رشاد سالم، الرياض: جامعة الملك محمد بن سعود، ١٩٧٩م.
2. ابن عاشور، **التحرير والتنوير**، تونس: دار التونسية للنشر، ١٩٨٤م.
3. ابن هشام الأنصاري، **أوضح المسالك إلى ألفية ابن مالك**، بيروت: المكتبة العصرية، طبعة جديدة، ١٩٩٦م.
4. أبو الوليد، ابن رشد، **فصل المقال في تقرير ما بين الحكمة والشريعة من الاتصال**، تحقيق: محمد عابد الجابري، بيروت، مركز دراسات الوحدة العربية، ١٩٩٧م.
5. أبو حامد الغزالي، **جواهر القرآن ودرره**، بيروت: دار الجيل، ١٩٨٨م.
6. أبو يعرب المرزوقي، **إسلامية المعرفة رؤية مغايرة**، مجلة إسلامية المعرفة، العدد ١٤.
7. أبوبكر محمد أحمد إبراهيم، **التكامل المعرفي وتطبيقاته في المناهج الجامعية**، المعهد العالمي للفكر الإسلامي–هرندن–فيرجينيا، ط١، ٢٠٠٧م.
8. أبوبكر محمد أحمد محمد إبراهيم، **مفهوم التكامل المعرفي وعلاقته بإسلامية المعرفة**، مجلة إسلامية المعرفة، العدد٤٣.
9. اسماعيل راجي الفاروقي، **جوهر الحضارة الإسلامية**، مجلة المسلم المعاصر، ١٩٨١/٩/٢١م، العدد ٢٧.
10. اسماعيل راجي الفاروقي، **التوحيد: مضامينه على الفكر والحياة**، ترجمة: السيد عمر، ٢٠١٠م.
11. اسماعيل راجي الفاروقي، **إسلامية المعرفة، المبادئ العامة–خطة العمل–الإنجازات**، دار الهادي، ط١، ٢٠٠١م.

١٢. التجاني عبدالقادر، **المفهوم القرآني والمتغير السياسي**، مجلة إسلامية المعرفة، العدد ١٠.

١٣. الجرجاني، **التعريفات**، تحقيق: إبراهيم الأبياري، بيروت: دار الكتاب العربي.

١٤. حامد العطية، **نظام المعرفة ومنهج البحث في القرآن الكريم**، بيروت: دار الأنوار، ٢٠٠٦م.

١٥. رائد جميل عكاشة، **التكامل المعرفي**، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، فرجينيا– الولايات المتحدة الأمريكية، ط١، ٢٠١٢م.

١٦. زكريا الأنصاري، **الحدود الأنيقة والتعريفات الدقيقة**، تحقيق: د.مازن المبارك، بيروت: دار الفكر المعاصر، ط١، ١٤١١ه.

١٧. زياد الدغامين، **التكامل المعرفي في القرآن الكريم**، المجلة الأردنية في الدراسات الإسلامية، المجلد التاسع، العدد (١/أ)، ٢٠١٣م.

١٨. سعدى أبو حبيب، **القاموس الفقهي**، دمشق: دار الفكر، ط٢، ١٩٨٨م.

١٩. سيد محمد نقيب العطاس، **مداخلات فلسفية في الإسلام والعلمانية**، ترجمة: محمد الطاهر الميساوي، كوالالمبور: المعهد العالمي للفكر والحضارة الإسلامية، ٢٠٠٠م.

٢٠. سيد محمد نقيب العطاس، **مفهوم التعليم في الإسلام: إطار تصوري لفلسفة إسلامية للتعليم**، ترجمة: حسن عبدالرزاق النقر، كوالالمبور: المعهد العالمي للفكر والحضارة الإسلامية، ١٩٨٩م.

٢١. سيف الدين عبدالفتاح، **المنهجية وأدواتها من منظور إسلامي**، القاهرة، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، ٢٠١٠م.

٢٢. طه جابر العلواني، **إصلاح الفكر الإسلامي بين القدرات والعقبات**، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، الدار العالمية، ط٢، ١٩٩٤م.

٢٣. طه جابر العلواني، **الجمع بين القرائتين قراءة الوحي وقراءة الكون**، القاهرة: مكتبة الشروق الدولية، ط١، ٢٠٠٦م.

٢٤. طه جابر العلواني، **العقل وموقعه في المنهجية الإسلامية**، مجلة إسلامية المعرفة، ع٦.

٢٥. طه عبدالرحمان، **النقاشات الراهنة حول العلم والدين: كيف نفكر في الصلة بين العلم والدين**؟، مجلة كلية الآداب، جامعة محمد الخامس–مغرب، العدد ٨، أيلول ٢٠٠٧.

٢٦. عبدالحميد أبو سليمان، **أزمة العقل المسلم**، الرياض: دار العالمية للكتاب الإسلامية، ط١، ١٩٩٤.

٢٧. عبدالحميد أبو سليمان، **إسلامية الجامعة وتفعيل التعليم العالي بين النظرية والتطبيق**، مجلة إسلامية المعرفة، العدد٢٧، ٢٠٠١م.

٢٨. عبدالحميد أبو سليمان، **الرؤية الكونية الحضارية القرآنية**، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، ط١، ٢٠٠٩م.

٢٩. عبدالحميد أبوسليمان، **النظرية الإسلامية للعلاقات الدولية: اتجاهات جديدة للفكر والمنهجية الإسلامية**، ترجمه وراجعه وعلق عليه: د. ناصر البريك، الرياض، الناشر: المعهد العالمي للفكر الإسلامي: هرندون، فيرجينيا، الولايات المتحدة الأمريكية، ١٩٩٣.

٣٠. عبدالحميد أحمد أبو سليمان، **قضية المنهجية في الفكر الإسلامي**، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، الدار العالمية، ط١، ١٩٩٥م.

٣١. عبدالرحمن حبنكة الميداني، **غزو في الصميم**، بيروت: دار القلم، ط١، ١٩٨٢م.

٣٢. عبدالنبي بن عبدالرسول الأحمد نكري، **دستور العلماء**، بيروت: دار الكتب العلمية، ط١، ٢٠٠٠م.

٣٣. فتحي ملكاوى، **منهجيه التكامل المعرفي مقدمات في المنهجية الإسلامية**، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، فرجينيا–الولايات المتحدة الأمريكية، ط٢، ٢٠١٦م.

٣٤. فتحي ملكاوي، كلمة التحرير في مجلة إسلامية المعرفة، العدد ٦٤.

٣٥. كۆسرەت سالح ئەحمەد، **قوتابخانەی إسلامية المعرفة لەدیدی رابەرەکانیەوە**، سەنتەری زەهاوی، ٢٠١٥ز.

٣٦. لؤي صافي، **الوحي والعقل: بحث في إشكالية تعارض الوحي والنقل**، مجلة إسلامية المعرفة، العدد ١١.

٣٧. مالك بن نبي، **مشكلة الأفكار في العالم الإسلامي**، دمشق: دار الفكر، ط١، ٢٠٠٢م.

٣٨. محمد أمزيان، **منهج البحث الإجتماعي بين الوضعية والمعيارية**، فيرجينيا: المعهد العالمي للفكر الإسلامي، ط١، ١٠٠١م.

٣٩. محمد رواس قلعجي وحامد صادق قنيبي، **معجم لغة الفقهاء**، ، دار النفائس، ط٢، ١٩٨٨م.

٤٠. محمود عايد الرشدان، **حول النظام المعرفي في القرآن الكريم**، مجلة إسلامية المعرفة، ع١٠.

٤١. مصطفى إبراهيم الزلمي، **أصول الفقه في نسيجه الجديد**، نشر إحسان، ط٢٣، ٢٠١٤.

42. Seyyed Hossein Nasr. An Introduction to Islamic Cosmological Doctrines. Thames And Hudson. 1978.

## المواقع الإلكترونية:

1. Osman bakar,**Tawhid and Science**. 1993. See full essay: http://onlinelibrary.wiley.com/doi/10.1111/j.1478-1913.1993.tb03584.x/epdf?r3_referer=wol&tracking_action=preview_click&show_checkout=1&purchase_referrer=www.search.ask.com&purchase_site_license=LICENSE_DENIED.

**2. Seyyed Hossein Nasr.** Science and Civilization in Islam. **http://sourcebooks.fordham.edu/med/nasr.asp**.

٣. أحمد محمد الدغشي، **الحس مصدر للمعرفة وطريقة لها رؤية قرآنية تربوية**، بحث منشور في منتدى الكلمة للدراسات والأبحاث، العدد ٢٧، ٢٠٠٠م، الرابط المباشر: **http://www.kalema.net/v1/?rpt=165&art**.

٤. خالد الصمدي، **الحكمة وفصل الخطاب في منهج التربية عند النورسي**، مقال منشور في موقع "النور للدراسات الحضارية والفكرية"، تاريخ التصفح: ٢٠١٦/١٠/٢٤، الرابط المباشر:

5. http://www.iikv.org/ar/nurmajalla/article.php?c=4&cid=2&id=280.

٦. طه جابر العلواني، **الوحدة البنائية في القرآن**، مقال منشور في موقع مركز الدراسات القرانية: http://www.alquran.ma/Article.aspx?C=5646.

٧. فهمى قطب الدين النجار، **العقل في القرآن الكريم، بحث منشور في موقع الآلوكة: http://www.alukah.net/culture/0/65235**/.

[8].ماجـد محمـد أبـو شـرحة، **المعرفـة، مفهومهـا –خصائـصها– أنواعهـا**، **http://www.slideshare.net/mjdabusharha/ss-53424265**.

[9].المعهد العالمي للفكر الإسلامي–مكتب الأردن، **التكامل المعرفي إطار مرجعي للمنهجية الإسلامية**، تاريخ النشر: ١٠–١٠–٢٠١٣، تاريخ التصفح: ٢١–١٠–٢٠١٦، الرابط المباشر:

10. http://iiitjordan.org/index.php/2013-10–.

[11]. موقع**DW** ، **/العلم–والدين–تصادم–أم–تكامل ://www.dw.com/ar**.